جوهر نامق سالم

# ئایا فیدراڵیەت وەك (خیار)ێكی سیاسی لە عێراق پیادە دەكرێت..؟

چاپی یەكەم

هەولێر 2005

# ناوەڕۆک

**بەشی شەشەم: پاشکۆکان**

**ئەم چەند سەرە قەڵەمانە پێشکەشە:**

بە رۆحی بێ گەردی خوالێخۆشبووی باوکم، کە داهێنەرو رێپیشاندەرو هێمای پیاوەتی و مەردایەتی و راستگۆیی و یەکسانیم بوو!

بە دایکی ئازیزم، کە وەکو ملیۆنەها دایکی خەڵکی ئەم کوردستانە ئێمەیان بە خۆشەویستی گەل و نیشتمان گۆش کرد.

## پێشەکی

ئەم بابەتانەی کە لە دووتوێی ئەم کتێبەدا کۆکراونەتەوە لە بنەڕەتدا، زنجیرە وتارێک بوون، وەکو سەرە قەڵەم و تێبینی و سەرنج و، بگرە (هەڵوێستیش)، لە کاتی خۆیدا، زۆربەی زۆری لە رۆژنامەی «خەبات) لە سالانی (۲۰۰۳-۲۰۰۵) و، لە چەند سایتێکی ئەنتەرنێت بلاوکراوەتەوە..

لەسەر داخوازی دۆستان و ژمارەیەک لە خوێنەرانی ئازیزی ئەم بابەتانە، ئامادە کرا (وەکو خۆی)و، وا وەکو کتێبێک دەخرێتە بەر دەستی هاوولاتیانی کوردستانی شیرینم.

دیدو بیروبۆچوون، لەسەر هەر دیاردەیەک؛ خولقاو و هەڵقولاوی بارودۆخی رۆژو دەرفەتی خۆیەتی، بە گرێدان لەگەڵ هەل و مەرج و قۆرت و هەورازەکانی قۆناغی پێشووی و، هەر لەسەر ئەو بنەمایانە مرۆڤ ماف بە خۆی ئەدات ئەو دیاردەیە شی کاتەوە ئەگەر پێویستیش بوو پێشبینی بکات...

بابەتەکان خوێندەوەیەکی ئەو رووداو و دیاردانەیە، کە لە ماوەی دیاریکراوی رابردوودا و، لە دەرفەتێکی خێرای مێژووی گەلەکەماندا رووی دا و، هەموومانی راچەڵەکاندو، کێشەی کوردو کوردستانی بە تایبەتی و، عێراق و ناوچەکە بە گشتی، خستە نێو دوو رێیانێکی چارەنووسسازەوە، وەکو وەرچەرخانێکی مێژوویی لە کۆتایی سەدەی رابردوو و سەرەتای ئەم سەدەیە...!

خوێندنەوەی ئەو دیاردانەو، دەرئەنجامەکانیشی، بەندە بە تێڕوانین و ئاگاداری و هەڵسەنگاندنی خۆمانەوە، وەکو دەمان دی و دەمانبیست و، تەنها خۆمان لەو دیدو بۆچوون و هەڵسەنگاندنە بەرپرسیارین.

ئامانجیش زیاتر بۆ ئەوەیە کە کەموکوڕییەکان وەکو هاتووە و هەیەو دەیبینین، روون بکرێنەوەو (تشخیص) بکرێن، بە ئومێدی چاککردنەوەو قوڵ کردنەوەی لایەنە پۆزەتیڤەکانی ئەو دیاردانە.

لە هەندێ رووەوە، کۆمەڵێک لە دۆستانمان، زۆر لە پێش رووداوەکانی سەرەتای سالی ۲۰۰۳، ئاشنان لە راوبۆچوونمان سەبارەت بە لایەنێکی گرنگ و بەرینی ئەمانەی کە بوونەتە ناوەندی هەندێ لەو بابەتانەی نێو ئەم کتێبە، شەن و کەو

کـــردنیـــان و دووپات بوونەودیان بەم شـێـــودیە کـــە وا لەبەر دەســـتـدایە، ڕەوتی ڕووداوەکان خۆی فەرزی کردووە.
لەگەڵ ئەوەش دوور نییـە کەسانێک هەبن کە لەسەر ئەو ڕایە بن کە ئەم بابەتانە هەندێ پەلەو پەلەکاری پێوە دیارە.. یان مەبەستەکەی بە تەواوی نەپێکابێت و بە تەواوی نەچوبێتە نێو وردەکارییەکان!.
دەکرێت مرۆڤ بڵێت ڕاوبۆچوون گرێدراوە بە کۆمەڵێک هۆ و هۆکار. زۆر جار هۆ و هۆکارەکانیش وەکو پێویست یان وەکو خۆی بە دی ناکرێن، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە دەبێت مـرۆڤ دەسـتـەوئەژنۆ ڕاوەسـتێت، بە تایبەتی ئەگەر هاتوو ئەو دیاردانە چارەنووســـاز بن، سـەرەڕای ئەوەش ناوەڕۆکی بابەتەکـانمان زۆری بڕیارو یاســاو دیکۆمێنتی نووسراو و بیستراون و بڵاوکرانەتەوە...
لەگەڵ ئەمـانە هەر هەمـووی، داوا لە خوێنەری ئازیز دەکەم لە کوێ هەست بە (حوکم دان) و پێشـبینی کرد، بیـخاتە چوارچێوەی ئەو مافەوە کە بە خـۆمانمان داوە، ئەو (حوکم) و (پێشبینی)یانە : ئەگەر دروست بوو ئەوە دەستخـۆشیمـان لێ بکات، ئەگـەر واش نەبوو ئەوە هاوکـارمـان بێت بۆ ڕاسـتکردنەوەیان و، (سـبـحـان من لا یخطئ).!

ناکرێت لێرەدا ئەوەش لەبیر کەین کە بەگەرمی :
سوپاس وپێزانینی خۆمان ئاراستەی گشت ئەو بەڕێزانە دەکەین کە هەر یەک بە پێی کات و توانای خۆی هاوکار بوون لە دەرچوواندنی ئەم کتێبەو، داوای سەرکەوتنیان بۆ دەکەین.

**جوهر نامق سالم**
**سەرەتای شوباتی/ ٢٠٠٥**

**هەولێر- هاوینە هەواری سەلاحەدین**

له پەراوێزی شەڕی کوێت، ساڵی ١٩٩١، خەڵکی عێراق له خواروو و له کوردستان ڕاپەڕین. ڕاپەڕینەکە بەچراخی سەوزی هاوپەیمانان بەرپابوو. به ماوەیەکی کەم کوردستان ئازاد کرا له گشت هێزەکانی دوژمن. زۆری پێ نەچوو، هەر به چراخی سەوزی هاوپەیمانان، هێزەکانی سەدامی خوێنڕێژ هێرشیان کرده سەر شارو شارۆچکەکانی کوردستان. کورد توشی کۆڕەوێکی ملیۆنی بوو. ئەنجامی:

* سەپاندنی ئابڵووقەی ئابووری لەسەر عێراق لەلایەن ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی به کوردستانی ئازادیشەوە .
* بڕیاری ٦٨٨* ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی له نیسانی هەمان ساڵ (١٩٩١).
* دیاری کردنی ناوچەی " ئارام " له ژووری هێڵی ٣٦. بۆ پاراستنی خەڵکی کوردستان له دەست درێژی دەسەڵاتی ناوەند.
* جێگیربوونی هێزەکانی هاوپەیمانان له چەند ناوچەیەکی ئازاد له کوردستان و، پاشتر هاتنی هێزی پۆلیسی نێودەوڵەتی، سەر به نەتەوە یەکگرتووەکان.
* دەست پێ کردنی گفتوگۆ له نێوان بەرەی کوردستانی و حکومەتی ناوەندی له نیسانی ١٩٩١ تاکو پاییزی هەمان ساڵ.
* هاتنی به دەیەها ڕێکخراوی مرۆیی جیهانی بۆ هاوکاری و یارمەتی میللەتەکەمان.

له گەرمەی ڕووداوەکان و سەختی ژیانی میللەتەکەمان بەهۆی:
دارماویی ژێرخانی ئابووری و، لایەنە سلبیەکانی ڕاپەڕین وکۆڕەوە ملیۆنیەکەی کوردستان و تالان و دەست بەسەراگرتنی سەروەت و سامانی هاوولاتیان و، ئابلووقەی ئابووری نێودەوڵەتی لەسەر عێراق به کوردستانی ئازادیشەوە، هەروەها سیاسەتی ڕەگەزپەرستی ڕژێمی بەغدا له بەربەرەکانێ و ئابڵووقە و ڕێگرتن له کۆمەکی نێودەوڵەتی بۆ کوردستان، له پاییزی ساڵی ١٩٩١ یەک تەرەفە و به ئارەزووی خۆی، ڕژێم، ئیداراتی خۆی له ناوچەکانی کوردستانی نێو هێلی ٣٦ کشانەوە، لەگەڵ ئەو کشانەوەدا هەموو جۆرە یارمەتی و پێویستییەکانی بڕی، بەمەیش بۆشایەتیەکی (ئیداری) و (یاسایی) له کوردستانی ئازاددا دروست کرد،

* بڕوانه دەقی بڕیارەکه له پاشکۆی ژمارە «١» – ل٢١٥

به ئومیدی ئاڵۆز کردنی باری ژیان و تێکدانی ریزەکانی میللەت و دروست بوونی ململانێ لەنێو هێزە سیاسیەکان.
بەهۆی بۆشایەتی دەسەلات و تێکچوونی شیرازەی ئیدارە و خزمەتگوزاری، ناچار بەرەی کوردستانی دەسەڵاتی ئیدارەی کوردستانی خستە ئەستۆی خۆی و، بڕیاری هەڵبژاردنی گشتی دا.
له۱۹۹۲/٥/۱۹ و بە پێی یاسای ژمارە (۱) و یاسای ژمارە (۲) هەڵبژاردن ئەنجام درا. بە گەواهی زۆر لایەن و رێکخراوی بیانی و نێودەوڵەتی کە ئامادە بوون، هەڵبژاردنەکە نموونەیەکی دیموکراسی چاوەڕوان نەکراو بوو لەو باردوخەی کوردستان و عێراق، بە تایبەتی:
* ئامادەبوونی خەڵکی کوردستان بۆ دەنگ دان بە رادەیەک بوو، هەڵبژاردنەکە شێوەی کەرنەڤاڵێکی نیشتمانی و نەتەوایەتی بە خۆیەوە گرت.
* لە هێمنی و ئارامی و خۆشی و تەبایی.
* لە پاراستنی بنەماکانی دیموکراسی، لە رووی یاسایی و شەرعیەت و، مافی دەنگدان و پالاوتن و بەشداری گشت لایەنە سیاسییەکانی کوردستان، لە راستەوە بۆ چەپ، و لە مارکسییەوە بۆ ئیسلامی.
* لە ناوچەیەکدا ئەنجام درا، لەلایەن هێزی هاوپەیمانانەوە پارێزراوبوو، هەروەها هێزی پۆلیسی نەتەوە یەککگرتووەکان چاودێری ئارامی ناوخۆی ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستانی دەکرد.

ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانی عێراق (پەرلەمان) هەڵبژێردرا و، لە ۱۹۹۲/٦/٤ دەست بەکاربوون. بۆ پڕکردنەوی بۆشایی ئیداری، (پەرلەمان)، بڕیاری دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستانی داو، لە ۱۹۹۲/۷/٤ باوەڕی بە یەکەم کابینەی ئەو حکومەتە داو، لەمەڕ پەیوەندی نێوان هەرێمی کوردستان و دەسەلاتی ناوەند بۆ ئەو قۆناغە، (پەرلەمان) لە ۱۹۹۲/۱۰/٤و بە تێکڕای دەنگ، وەکو نوێنەری هەڵبژێردراوی خەڵکی کوردستان جاڕی فیدراڵیەتی دا.
شایەنی باسە، پەرلەمانی کوردستان هەردەم ئامادە بوو لەسەر بنەمای جاڕدانی فیدراڵیەت، لەگەڵ حکومەتی ناوەندی پێشوو گفتوگۆ بکات، کەچی ئەوان ئامادە نەبوون و، بە پێچەوانەوە رژێمی سەدامی لە ناوچوو، ناوچە ئازاد کراوەکانیان بە

مولّگای سیخوڕی و پێگەی بێگانە و ناحەزانی خۆی و، میللەتەکەمان و هێزەکانی بە چەتە و یاخی و سیخوڕی دوژمنانی (عێراق) دانابوو.
هیچ کات رژێمی سەدام، لە هەموو سەراو دراوی هەورازو نشێوی قۆناغی (١٩٩١-٢٠٠٣)، بۆ یەک چرکە ئامادە نەبوو بە دەر لە قەوارەی (حوکمە زاتیە کارتۆنیەکەی ساڵی ١٩٧٤)، بە سنوور و بە دەسەڵات، یەک هەنگاو بێتە پێشەوە، نەک هەر ئەوە، بەڵکو ئەو رژێمە کە لە واقعدا هەڵقوڵاوی بیرو بۆچوونی توێژێکی نەژاد پەرستی عەربی عێراقە، لە هیچ شتێک سڵی نەدەکرد بۆ قوول کردنی باری ئاژاوە و بێ ئارامی وتۆقاندن لە کوردستانی ئازادداو، سیاسەتی (پەرت کە و زاڵبە)ی پیادە دەکردو، لە رێگای دەزگا بەدناوەکانی، خۆفرۆش و سیخوڕ و ئەندامانی پارتە فاشیەکەی، بە تایبەتی ئەوانەی کە خۆیان خزاندبووە نێو لایەن و گروپە کوردستانییەکان، کە بۆ ناکۆکی و چاندنی تۆی دوو بەرەکی، هەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆ و لاواز کردنی ئەم ئەزموونە بەکاری دەهێنان، بەو خەیاڵ و خەونە کە کوردستانی ئازاد بگەڕێنێتەوە ژێر رکێفی خۆی...
قۆناغی دوای راپەڕین و کۆڕەوە میلۆنیەکەی بەهاری ١٩٩١، هێڵی ئارام و کشانەوەی ئیداراتی رژێمی بەغدا لە کوردستانی ئازادو دامەزراندنی پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان و جاڕدانی فیدراڵیەت، وەرچەرخانێکی (نەوعی) بوو لە کۆتایی سەدەی پێشوو، لە رووی واقع و ئامانج. بەمەیش (لامەرکەزی) و (ئۆتۆنۆمی) بە (کارتوونی)و (راستەقینەکە)یەوە وەلاوە نرا (فیدراڵیەت) بوو بە درووشم و ئامانجی ئەو قۆناغە.
لەگەڵ ئەوەش هەرچەندە (پەرلەمان)و گشت هێزە سیاسییەکانی کوردستان کۆکن لەسەر (فیدرالیەت) بۆ ئەم قۆناغە، بەڵام ئەوسا و ئێستایش توێژەیەکی زۆر لەو باوەڕەدایە، بڕیارەکە قابیلی جێبەجێ کردن نییە و یەک تەرەفەیە. یان کێ دەڵێ کورد قایلە بە فیدراڵیەت و پێکەوە ژیان لە قەوارەی یەک دەوڵەتی عێراقی.
هەڵبەتە ئەم دید و بۆچوونانە بێ هۆ نین، بەڵگەیش:
* لە پاش شەڕی جیهانی یەکەم و بەپێی بڕگە (٦٢و٦٣ و٦٤)ی رێککەوتننامەی (سیڤەر-١٩٢٠) دەبوایە کوردیش وەکو میللەتانی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی هەبێت. هاوپەیمانانی ئەو سەردەمە بە سەرۆکایەتی بەریتانیای عووزما، خولقێنەرو پیادەو زامن کاری ئەو

بەڵگەنامەیە بوو، زۆری پێ نەچوو پاشگەزبوونەوەو، (سیڤەر-١٩٢٠) بە (لۆزان-١٩٢٣) گۆڕایەوە. کوردستان بۆ جاری دووهەم دابەش کرا، بە بڕیار و لە ژێر دەسەڵات و سێبەری گەورەترین زلهێزەکانی ئەو سەردەمە، ئەو کاتیش هەر وەکو ئێستا، ئەو زلهێزانە بە ناوی ئازادی و مافی چارەنووسی گەلان و، شارستانیەت و یەکسانی ...هتد وڵاتەکەمانیان داگیر و پارچە پارچە کرد و مافەکانمانیان پێشێل کرد و بە زۆری زۆرداری لکێندراینەوە بە تورکیا و سوریا و عێراق و ئێران و، لە دووبەشەوە کراین بە چوار.

* کە تورکیاو هاوپەیمانان (بە سەرۆکایەتی بەریتانیای عوزما) پێک نەهاتن لەسەر (ولایەتی مووسڵ) واتە (کوردستانی عێراق) کێشەکە درا بە (عصبە الامم). لیژنەیەک پێک هات. بڕیارو ڕاسپاردەکانی لیژنەکە بریتی بوون لە چەند خاڵێک گرنگترینیان: دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لەسەر ئەو ئەساسە کە:
   ١- هیچ کات (ولایەتی مووسڵ) پارچەیەک نەبووە لە عێراق.
   ٢- زۆرینەی (ولایەتەکە)، نە تورک و نە عەرەبن، بە زبان و بەرەگەز نەتەوەیەکی جیان لەوان، ڕێژەی کورد لە سنوور ( ٨٨٪ )ی دانیشتوانیەتی. بۆ ئەمەیش پێشنیاریان کرد وەکو هەنگاوی یەکەم ولایەتەکە واتە(کوردستانی عێراق) بخرێتە ژێر مەنداتی (وصایە)ی (عصبە الامم) پاشان ریفراندۆمێک بکرێت ئایا کوردەکان کوردستانێکی سەربەخۆیان دەوێت، یان پێکەوە ژیان لەگەڵ دەوڵەتی دەستکردی تازەی بە ناو (عێراق). هاوپەیمانان (بە سەرۆکایەتی بەریتانیای عووزما)و دەوڵەتی عێراقی تازە داتاشراو، لەوەی لیژنەکەیش پاشگەز بوونەوە.

* قەبوڵ کردنی عێراق بە ئەندام لە (عصبە الامم) لە ١٩٣٢/١٠/٣ بە مەرج بوو، ئەویش دابین کردنی مافی کوردان بە مرۆڤایەتی و کلتووری و کارگێڕیەوەو، زامن کردنی لە دەزگاکانی پەیوەندار. ئەو مەرجانە لە رووی یاسایەوە هێشتا موولزەمە بۆ عێراق، چونکە ئەو مەرجانە وەکو ئیلتیزامێکی یاساییە و لە (عصبە)وە گوێزرایەوە بۆ (نەتەوە یەککگرتووەکان) بە پێی بڕیاری خوودی (عصبە) لە ساڵی ١٩٤٦ کە دەبێت یاساکانی عێراق تەبا و گونجاو بێت لەگەڵ یاسا نێودەوڵەتیەکان و، هەر جیاوازی و ناکۆکیەک ڕوویدا و چارەسەر نەکرێت سەبارەت بەو مەرجانە، ئەوە خیلافەکە هەواڵەی (دادگای

هەمیشەیی نێودەوڵەتی) دەکرێت و بڕیاری دادگایش قاتیعانە دەبێ. کەچی نە دەوڵەتی عێراق و نە بەریتانیای عوزما ئەنجامیان داو، نە نەتەوە یەکگرتووەکانیش بە دواداچوون و پرسینەوەیەکی هەبوو لەو بارەیەوەو، نە ئێمەی کوردیش ئەو هێزو تواناو پاڵپشتییەمان هەبوو، بۆ ئەوەی ناکۆکیەکە بخەینە بەردەم ئەو دادگایە.

* جگە لەو راستیانەو، پاشتر: خۆ لە رووی دەستووری و یاسایەوە، کورد و عەرب، وەکو دوو گەلی سەرەکی شەریکن لە عێراق. ئەم شەراکەتە لە بڕگە (٣)ی دەستووری عێراقی ساڵی ١٩٥٨ تەسبیت کرا. هەمان پرنسیپ دووپات بووەوە لە دەستووری ساڵی ١٩٧٠. کەچی دەسەڵاتی ناوەند لە عێراق ئەو دەقە دەستووریەی وەکو مەرەکەب لە سەر کاغەز هێشتەوە و هیچ کات پابەندی نەبووەو هەموو هەڵسوکەوت و مامەڵەی بۆ چارەسەر کردنی کێشەی کورد دژ بەو پرنسیبە بووە.

* ئێمەی کوردیش بە تەنهاو لە هەموو هەل و باردۆخەکاندا پێمان نەکراوە بڕیاری مافی چارەنووسی خۆمان پیادە بکەین و لایەنی دیکەی عێراقی دەسەڵاتدار دگانی پێدا نانێت، هەر لە (مافی مرۆیی و کلتووری و کارگێڕی)و (لامەرکەزی) (بەزاز)ی ساڵی ١٩٦٦ و ڕێککەوتننامەکەی ١١/ئاداری/١٩٧٠ و بەیانی (ئۆتۆنۆمیە کارتۆنیەکەی ١٩٧٤ی یەک لایەنەی حکومەتی بەغدا)و، جاڕدانی (فیدرالیەت) لەلایەن پەرلەمانی کوردستان ساڵی ١٩٩٢ و پاشتر ساڵی ئەمساڵ، وەکو هاوکار و (شەریک)، لەگەڵ هێزەکانی هاوپەیمانان بە سەرۆکایەتی ئەمریکا لە رزگاری و پاشان لە داگیر کردنی عێراق بە کوردستانی ئازادیشەوە.

**ئەمڕۆیش:**

* هێزەکانی هاوپەیمان بە(سەرۆکایەتی ئەمریکا) بە ناوی بنبڕ کردنی تیرۆر و لەناوبردنی چەکی کۆکوژ و دیموکراتیەت و ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و رزگاری گەلانی عێراق شەڕیان دژی سەدام بەرپا کرد و رژێمە فاشیەکەی رما و خۆیشی هەڵهات* و، ئەو هێزانە لە هێزێکی رزگاری گۆڕا بۆ دەسەڵاتێکی داگیرکەر بە

* دواتر لە ١٣/١٢/٢٠٠٣ دەسگیرکرا.

پێی بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی ژمارە(١٥١١) لە ١٦ی/تشرینی دووهەمی/ ٢٠٠٣*.

**ئیستا:**

١- کوشتن و تەقینەوە بەرامبەر بە هێزەکانی هاوپەیمانان بە تایبەتی و، ئەوانەی هاوکاری داگیرکەر دەکەن، ڕۆژانە لە بەغداو لە شارەکانی ناوەڕاست و خوارووی عێراق بە ناوی (بەرهەڵستکاری داگیرکەر)لە زیاد بووندایە، بە ژمارەو بە نەوعیەت. پرشێکیشی گەیشتووەتە ناوچەکانی کوردستان.

٢- تاکو ئێستا کێشەی چەکی کۆکوژی قەدەغەکراو گرفتێکە بۆ هاوپەیمانان بە تایبەتی. ئەگەر چی بۆ ئێمەی کورد بەڵگە نەویستە.

٣- دیموکراتیەت و مافەکانی مرۆڤ پرۆسەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و کلتوورییە. بە دەر لە کوردستانی هەردوو ئیدارەی کوردی، ئەوەی هەیە دیاردەیەکی بێ سەروبەرە و هەڵچوون و داچوونێکی سەرەتای نەمانی نزیکەی یەک سەدە لە حوکمی تاکڕەوی و یەک لایەنەی ڕژێمێکی دکتاتۆری و فاشیە. دیموکراتیەت هاوڕەدیفی ئەمن و ئاسایش و ئارامی و باری ئابوورییە، هەر هەموو لە واقعی ئەمڕۆی عێراق بە تایبەتی خواروو و ناوەڕاستی هێشتا دوورن. کە دیموکراتیەتیش جێگیر نەبێت، باسکردنی مافەکانی مرۆڤیش، گەشبینیەکی هەندێ دوورە لە واقع.

٤- ڕزگاری گەلانی عێراق گۆڕا بە داگیرکردنی گەلانی عێراق.

٥- کوردستانی عێراق بە حوکمی واقع، ئێستا (٣) پارچەیە. یەک لە ژێر کۆنترۆڵی پارتی دیموکراتی کوردستانە، ئەوی تر لە ژێر کۆنترۆڵی یەکێتی نیشتمانی کوردستانە، سێهەمیان ئەو ناوچانەیە کە پێشان لە ژێر کۆنترۆڵی حکومەتی ناوەندی بەغدا بوون و ئێستا حکومەتی ئینتقالی و لە پراکتیکدا ئەمریکییەکانە.

ئەوەی ڕەچاو دەکرێت:

* ئەو کەسایەتی و لایەنانەی کە کاروباری ئەم (٣) پارچەیە بەڕێوە دەبەن دۆست و شەریکی هێزەکانی هاوپەیمانن (بە سەرۆکایەتی ئەمریکا و بەریتانیا) هەم لە

---

* بڕوانە دەقی بڕیارەکە لە پاشکۆی ژمارە «٢» - ل٢١٧

رزگـاری عـێـراق و هەم لە ئیـداره کـردنی بە هەر سێ بەشی لەت لەت کـراوی کوردستانی باشورمان. هەردوو ئیدارەی (هەولێر و سلێمانی)، لە نێوان خۆیاندا راکێش و داکێشیانەو، کات دەبەنە سەرو، داگیرکەریش یاری (بە قوربانی سێو لە باخەڵی)یان لە گەڵدا دەکات.

* عێراق وەکو رژێم رووخا، دەستوری نەما، (سەروەربی= سیادە)ی پێشێل کرا، وڵاتێکی داگیرکراوەو، کۆمەڵگای نێودوڵەتی بە بڕیاری (ئەنجومەنی ئاسایشی نێـــودوڵەتی) ژمـــاره ١٤٨٣* لە ٢٢/ ئایار /٢٠٠٣ ) ســـەلماندوویەتی. داگیرکەری ئەمریکی، ئیدارەیەکی مەدەنی خاوەن دەسەڵات و بڕیاری سەپاندووە بە سەر گەلانی عێراقداو. بڕیارەکانی مـوولزەمـە. ئەم ئیدارەیە: بە بڕیارێک حکومەتی پێشـوو و سوپا و هەموو دەزگـا سیخوڕییەکان و پۆلیسی عـێـراقی هەڵوەشاندەوە. هەر بەبڕیاری ئەم ئیدارەیە حیزبی بەعسی عەربی سوشیالیستی فەرمانڕەوای عێراق بۆ زیاتر لە ٤٠ ساڵ، قەدەغە کرد لە هەموو جۆرە چالاکیەک. سەرانی ئەو حکومـەتەو ئەو حزبەی گرت ( ئەوەی تاکو ئێستـا بەر دەستـە)و، بڕیاری داوە بدرێن بە دادگـا. ئابووری عـێـراقی ئازاد کـردووە بەرامبـەر هەمـوو کۆمـپـانیـە بیـانییەکان. ئەنجـومـەنێکی دەسەڵاتی کـاتیی (٢٥) کـەسی تەعین کردو، وەزارەتێکی کاتی دامەزراندن.. کەچی:

١- تاکـو ئێستـا ناوچە دابڕاوەکـان لە کـوردستـان، کە بە بڕیاری رژێمی سـەدامی (مـونحـەل) خـرابوونە سـەر پارێزگـا عـەرەبیـەکـانی ناوەڕاست، وەکـو خـۆی مـاوەنەتەوە، هەتاکـو ئەو قـەزاو ناحـیـیـانەش کـە زۆریان بۆ ١٢ ساڵە ئازاد کراوەو، حکومەتی هەرێمی کوردستان ئیدارەی دەکرد و باری ژیانی خەڵکەکەی بە ئەستـۆوە بـوو و دەسـتی ئاوەدانی پێ گـەیاندبوو، داگـیـرکـەری ئەمـریـکی جـارێکی تر گـرێی دانەوە بە پارێزگـا عـەربیـەکـان وەکـو کـفـری و خـانەقین بە دیالەو، مخموور بە مووسڵ..!

٢- ئەو عـەرەبانەی کە بەزۆر و بە بڕیاری رژێمی سەدامی (مونحەل) نیشتەجێ کـراون لە شـارو شـارۆچکەو گوندەکـانی کـوردستـان. واتە بەرنامەی بەعەرەب کردنی خاکی کـوردستـان کە بە بڕیاری خودی سەدام پیادە کراوە، دەکـرا هەر بە یەک بڕیاری (پۆل بریمەر)ی حاکمی مەدەنی عێراق هەڵبوەشێتەوە. کە چی نەک

* بڕوانە دەقی بڕیاردکە لە پاشکۆی ژمارە «١٤» - ل٣٣١

تەنها نەیکرد، بەڵکو وا خەریکن کەرکوک و ناوچەکانی تریشمان لێ دادەبڕن و، دوور نییە ئەویش بکرێت بە پارچەیەک، یان چەند پارچەیەکی دیکە. سەیر لەوەدایە: ئەوەی بتوانێت وڵاتێک داگیرکات و حکومەتەکەی و حزبە فەرمانڕەواکەی و دەستوورەکەی هەڵوشێنێتەوە، تۆ بڵێیت نەتوانێت بڕیارەکانی تەعریب هەڵوەشێنێتەوە..؟! خۆ بە هەڵوەشانەوەی حکومەت و دەستوورەکەی پێشوو، بڕیار و یاساکانی ئەو رژێمە بە تەبیعەتی خۆی هەڵدەوەشانەوە. کەچی کاربەدەستانی ئەمریکای داگیرکەر، نەک ئەمەش ناکەن، بەڵکو هەتاکو ئەو عەرەبانە: چی بە هەلیان زانی بگەڕێنەوە بۆ جێگای باب و باپیری خۆیان، یان بە هۆی جوڵانەوەی ویژدان، یان لە ترس، لە سەرەتای هێرشی ئەمریکا بۆ سەر عێراق لە بەهاری ٢٠٠٣دا کوردستانیان جێهێلا، زۆر خەڵکی بنەجێیی ئەو ناوچانە چی کورد و چی تورکمان وکلدۆ ئاشووری گەڕانەوە بۆ سەر جێگای خۆیان، کەچی پاش گۆڕینی هەڵوێست و بەرنامەی ئەمریکا لە (رزگاری) بە (داگیر) کردنی عێراق، ئەوانەی کە ئەو شوێنانەیان چۆڵ کردبوو، زۆریان گەڕانەوەو بە هەموو ئیمتیازاتی جارانیانیشەوە. کەرکوکیش کە کاتی خۆی بە ئیدارەی هاوبەشیش رازی نەبووین، ئەمڕۆ بە سایەی سەری هاوپەیمانی (شەریکی سەربازی) رزگاری عێراقمان، کورد یەک لە چوارەو، خۆمان هەڵخەڵەتاندووە: (موحافیز= پارێزگار) کوردە..! وەکو بڵێیت هەموو بڕیارەکان و چارەنووسی شارەکە بەدەستی (پارێزگار) و (ئەنجومەنی شار بێت)، یان راستتر (حکومەتی کەرکوک)....!

٣- رەفتاری (بریمەر) لەگەڵ هەردوو ئیدارەی کوردستان لەسەر ئەساسی (پارێزگایە) نەک وەک هەرێمێک و، بڕیارەکانی کە یاسایە، راستەوخۆ دەینێرێت بۆ پارێزگارەکان، واتە تەهمیشی پەرلەمان و هەردوو حکومەت دەکا...

٤- لەوەیش زیاتر ئەفسەری ئەمریکی بێ رێز گرتن لە یاساو هەیبەتی پەرلەمانی کوردستان بە خۆی و چەکدارەکانیەوە دێنە باڵەخانەی پەرلەمان و راستەوخۆ پەیوەندی بە لیژنەکانی پەرلەمانەوە دەکەن سەبارەت بە دانانی یاسایەک یان هەموار کردنی یاسایەک. بێ گەڕانەوە بۆ کەناڵە رەسمییەکانی پێشنیار کردنی ئەم جۆرە پرۆژانە.

٥- بە رواڵەت(٥) کورد لە ئەنجومەنی کاتی دەسەڵات دامەزراوە (کەمتر لە بەشی کورد). کاتی خۆیشی ( هاوپەیمانان بە سەرۆکایەتی بەریتانیای عووزما ) شێخ مەحموودی نەمری ناوزەد کرد بە حکومداری کوردستان ( مەلیکی کوردستان)، راوێژکارێکی سیاسی (ئینگلیزی)شی بۆ دانا، زۆری پێ نەچوو دەستیان لێ هەڵگرت و گیراو نەفی کرا بۆ هندستان و، حکومەتی کوردستان تیا چوو..!

ئەنجومەنی حوکم دەسەلاتی وەهای نییە. (بریمەر) حاکمی فیعلی عێراقە بە کوردستانی ئازادیشەوە. مافی ڤیتۆی هەیە لەسەر بڕیارەکانی ئەنجومەن. بە پێی سەرچاوەیەکی باوەڕ پێ کراو و نزیک لە هەردوو دەسەڵات (ئەنجومەن و بریمەر) تاکو ناوەڕاستی مانگی ١١/ی ئەم ساڵ، ئەنجومەن ٩١ بڕیاری وەرگرتووە، بریمەر تەنها (٢) دووانیانی پەسەند کردووە...!

(بریمەر) وەکو حاکمی فیعلی عێراق بڕیارو مامەڵەی لەگەڵ هەردوو (حکومەتەکەی کوردستان) لە چوارچێوەی پارێزگاکانی (شیمالی عێراق )بوو...؟ کەچی رژێمی خوێنڕێژی (سەدام) بە هەموو قین و فاشیەت و شۆڤینیەتی خۆیەوە زاراوەی (کوردستان) و ( ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستانی) بە کار دەهێنا... کەچی کاکە بریمەر ئەویشی بە زاردا نایەت.

رێککەوتننامەی نێوان ئەنجومەنی دەسەلاتی کاتی عێراقی و ئیدارەی داگیرکەر لە بەغدا، کە لەپێش ناوەڕاستی مانگی ١١ی/٢٠٠٣ لەلایەن بەڕێزان جەلال تاڵەبانی - وەکو سەرۆکی ئەنجومەن- کاتی- و پۆل بریمەر لێپرسراوی ئیدارەی دەسەلاتی داگیرکەر، ئیمزا کرا، سەبارەت بە گواستنەوەی دەسەڵات لە مانگی ئایاری ساڵی و٢٠٠٤، چۆنیەتی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتیمانی کاتی ئاینده، باسی کورد و کوردستان و کێشەکەی نەهاتووە. هەڵبژاردنەکەش لەسەر ئەساسی پارێزگاکان دەبێت و، فیدراڵیەتیش وەکو دروشمێکی بێ ناوەڕۆک لەچوارچێوەی (لامەرکەزیە)تی ئیداریە.

بە کورتی رووداوەکان و کارەساتەکانی دەسەلاتدارانی پێشووی عێراق و، بیرو بۆچوونی توێژێکی عەرەب لە عێراقی ئەمڕۆ و ولاتانی تری عەرەبی و ئیقلیمی و، گۆڕین لە هەڵوێست و بڕیاری ئەمریکاو هاوپەیمانانی لە هێزێکی رزگارکەر بۆ هێزێکی داگیرکەر بێ هیچ جۆرە هەڵوێست یان دۆکۆمێنتێکی رەسمی وەها کە

خەڵکی کوردستان ئارام کات لەمەڕ دوارۆژی، جگە لە دووپات کردنەوەی هەندێ قسەی سەرزارەکی و عاتیفی، کە هەر هەمووی بۆ ئیستهلاکی رۆژانەیەو لە چوارچێوەی مافی سادەی (هاولاتیەتی) تێناپەڕیت، توێژێکی زۆری خەڵکی کوردستانی وروژاند...
ئەمانە هەر هەمووی زۆر شتمان وەبیر دەخاتەوەو وامان لێ دەکات هەڵوێستەیەک بکەین لەمەڕ ئەو بیرو بۆچوون و هەڵوێستانە.
مامەڵەو رووداوەکانی شەش مانگی رابردوو، بە هۆی داگیرکردنی عێراق، ئەوەمان بۆ دەردەخات، کەوا داگیرکەر خەریکە نیوچە سەربەخۆییەکەمان و ئەزموونی ئەم (١٢) ساڵەی کوردستانی ئازاد کە بە فرمێسک و خوێن دەستەبەر کرا هێدی هێدی لە دەستمان دەردەکات و، مەترسی ئەوەیش دەکرێت، کارەساتی پاش شەڕی جیهانی دووهەم دووپات بێتەوە، ئەم جارەیان بە پارچە پارچە کردنی باشووری کوردستان..!
ئەم قۆناغە، بە بۆچوونی هەموو لایەک، قۆناغێکی چارەنووسسازە، سەرکرادیەتی کورد لە دووڕیانێکی ناسکدایە. ناکرێت گەمە بە کات و بە هەل بکرێت.

چونکە:
هەر لە ماوەی ئەم (١٢) دوازدە ساڵە هەلی باشمان لە دەست دا. چ خۆخافلاندن بە گفتوگۆی نێوان بەرەی کوردستانی و سەدامی خوێنرێژ (بەهار- پایزی ساڵی ١٩٩١)، یان سەراو دەراوی هاتوچۆ و پەیوەندی ئەم لایەن یان ئەوی تر لەگەڵ هەمان رژێم لە قۆناغە جیا جیاکانی ئەو ماوەیە بگرە تاکو دوا ساتی رمانی و، لە ژێر هەر جۆرە پاساوێکدا بێت و، شەڕی شوومی ناوخۆ (١٩٩٤-١٩٩٨)و قۆناغی نەشەڕ و نە ئاشتی (١٩٩٨-٢٠٠٢)و، لە دەست دانی فرسەتی هەڵبژاردنەوەی (پەرلەمان) بۆ جاری دووهەم و سێهەم ١٩٩٤-٢٠٠٣و، چەسپاندنی ناسنامەی ئەزموون و کیانەکەمان بە هۆی مەترسییەکانی رژێمی دارماوی پێشوو و دوو ئابلۆوقەی ئابووری و...هتد.
زیاتر لە شەش مانگ تێپەڕی بە سەر قۆناغی رزگاری و داگیرکردنی عێراق. بە پێی زاراوەی (مافی هاوولاتی) کورد بەشدارە لە رزگارکردن و داگیرکردنی عێراق، بە پارچە ئازاد کراوەکەشیەوەو، هاوپەیمانی هێزی داگیرکەرین لە بەڕێوەبردنی عێراق. پۆستی وەزارەتە (سیادیە)کانیشمان بەر کەوتووە لەحکومەتە کاتیەکەی عێراق،

ئەگەر چی کوردەکان دوو جار بێ دەسەلاتن: جاری یەکەم چونکە خوودی مەجلیس و حکومەتەکەی بێ دەسەلاتە، دووهەمیان کورد بەرامبەر زۆرینەی رەگەزی هەردوو دەزگا کەمینەیە.

لە مەیانی ئەم قۆناغە و ئەو هەموو خزمەت و کارهاسانی و تەنازولات وگولّ باران و لە ئامێزگرتن و...هتد، هێزی داگیرکەر و برایانی زۆرینەی عەرەبی هاوخەبات لە جیاتی سوور بوون و پێ داگرتن لەسەر بەڵێنەکانیان، سەبارەت بە ماف و خواستی خەڵکی کوردستان و، لە قۆناغی (دروشمی بێ ناوەڕۆک)، بۆ بڕیاری تۆکمە و روون و موحەدەد لەمەڕ فیدرالّیەت و خواست و داکۆکی گەلی کوردستان و هێزەکانی، وا هەر یەک بە شێوە و شێوازێک پاشگەز دەبنەوە.

کە ئەنجومەنی کاتی دەسەلات لە سەرەتای دامەزراندنی پێش چەند مانگێک، بڕیاری دا کە عێراقی ئایندە عێراقێکی دیموکراتی فیدرالّی دەبێت (بێ دیاری کردنی شێوە و جۆری ئەو فیدرالّیەتە) واتە (درووشمێکی بێ ناوەڕۆک)، هەم لای دەسەلاتی داگیرکەر و هەم لە نێوان خودی ئەندامانی ئەنجومەن غەیرە کورد، مشتومڕێکی زۆری لە سەر بوو و بە هاسانی دەرباز نەبوو. تا ئەو کاتە تەنها بڕیار بوو بە تەوافق نەبوو، بەڵکو بە دەنگ دان بوو و، ئەو بڕیارەش بە ئەکسەریەتێکی کەم سەرکەوت.

ئەم پاشگەز بوونەوەیە واتە لە (تەوافق) بۆ (دەنگ دان)، بە تایبەتی بۆ ئێمەی کورد بۆ (فیدرالّیەت) مانای خۆی هەیە:

١- تەجاوز بوو لەسەر پرنسیپی( التوافق) بۆ بڕیاردانی ئەنجومەن، وەکو زەمانەتێک بۆ پاراستنی تەبایی و یەکسانی.

٢- زەمینە خۆش کردنە بۆ پاشگەز بوونەوە لە پرنسیپی (فیدرالیەت) کە زۆر لە لایەنەکانی ئەنجومەن هەر لە سالّی ١٩٩٢ تاکو کۆنگرەی لەندەن ٢٠٠٢ و کۆبوونەوەی صلاح الدین ٢٠٠٣ و کۆبوونەوەی ناسریە ٢٠٠٣ کۆک بوون لەسەری. ئەم پاشگەزبوونەوەیە بەهانە بوو بۆ ئەوەی لایەنەکانی غەیرە کوردی،

به تایبه‌تی زۆرینه‌ی عه‌ره‌بی بالا ده‌ست له ئاینده بیکه‌نه به‌ڵگه بۆ پاشه‌کشه‌و نکۆڵی له خودی بڕیاره‌کانی پێشووی ئه‌و لایه‌نانه له‌مه‌ڕ فیدراڵیه‌ت وه‌کو دروشم و ناوه‌ڕۆک، نه‌ده‌بوو لایه‌نی کوردی ئه‌م بادانه‌وه‌یه قه‌بووڵ بکردایه.

٣- له هه‌مووی گرنگتر ڕێگا دان بوو به‌وه‌ی فیدراڵیه‌ت بخرێته ده‌نگدانه‌وه‌و چه‌سپاندنی له‌سه‌ر ئه‌ساسی زۆرینه‌و که‌مینه. ئه‌مه‌یش سابیقه‌یه‌کی باش نییه‌و، نه‌ده‌بوو وا به ساده‌یی تێپه‌ڕێت به سه‌ر نوێنه‌رانی کورد له ئه‌نجومه‌ن.

لایه‌نی عه‌ره‌بی به تایبه‌تی ئه‌وانه‌ی که دژ بوون خه‌ت ره‌جعه‌یان بۆ خۆیان و هێزی تریش هێلاوه‌ته‌وه بۆ به‌ربه‌ره‌کانێ کردنی ئه‌و جۆره (دروو‌شمه).

مشتومڕه‌که هه‌ر به‌رده‌وام بوو، به‌ڵام له ١٥/١١/٢٠٠٣، ده‌سه‌ڵاتی داگیرکه‌ری ئه‌مریکا و هاوپه‌یمانانی، کێشه‌ی خواست و بڕیاری خه‌ڵکی کوردستان و دوارۆژی دۆزه‌که‌ی له‌مه‌ڕ (فیدراڵیه‌ت) حه‌سم کرد. واته خاڵیان نایه سه‌ر پیته‌کان ...!

ئه‌و ڕێککه‌وتننامه‌یه‌ی که ناونرا به ( ڕێککه‌وتننامه‌ی نێوان ئه‌نجومه‌نی حوکمڕانی و هاوپه‌یمانان بۆ گواستنه‌وه‌ی ده‌سه‌ڵات بۆ عێراقییه‌کان)، که له سه‌ره‌وه ئاماژه‌مان بۆ کرد، به ده‌ر له‌وه‌ی که ڕێککه‌وتننامه‌که له‌لایه‌ن عێراقییه‌کانه‌وه به کوردیان ئیمزا کرد. ئه‌وه‌ی ره‌چاو ده‌کرێت له‌و ڕێککه‌وتننامه‌یه، سه‌باره‌ت به ئێمه‌ی کورد:

* به دی نه‌کردنی وشه‌ی کورد یان کوردستان.

* خۆ دزینه‌وه له ئاماژه کردن به مافی کورد و چاره‌نووس و ئاینده‌ی، واته خۆلادان له واقع و دوا رۆژی ئه‌زموونی ١٢ ساڵه‌ی کوردستان به تایبه‌تی فیدراڵیه‌ت، بگره:

* حه‌سم کردنی ئه‌م کێشه‌یه به‌م ده‌قه لاوازه که له ڕێککه‌وتننامه‌که‌دا هاتووه: (تدابير فدرالية للعراق تتضمن المحافظات)، یان (وبيانا بالحقوق المتساوية لجميع العراقيين بغض النظر عن النوع ( الجنس) او المذهب او العرق ). یان ( يتم اختيار المجلس الأنتقالي من خلال اجراءات ديمقراطية تتسم بالشفافية والمشاركة في كل من محافظات العراق الثماني عشرة)... هتد

* بەم ڕێککەوتننامەیە، لایەنی کوردی لە ئەنجوومەن ئەوەیان پەسەند کردووە کە:
١- هەڵبژاردن لە سەر ئەساسی (پارێزگا) بێت.

٢- فیدراڵیەت لە سەر بنەمای (پارێزگا = لامەرکەزی ئیداری) دەبێت (تدابیر فدرالیة تتضمن المحافظات). (تاکو ئێستا لایەنە کوردیەکانی نێو ئەنجومەن بە(ڕەسمی) لارییان نییە لە ناوەڕۆکی ئەم ڕێککەوتننامەیە).

٣- دابەش کردنی کوردستانی عێراق بۆ چوار پارچە.. **یەکەم**: پارچەی حکومەتی (سلێمانی و هەندێ لە ناوچەکانی گەرمیان و هەولێر)ی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، **دووەم**: پارچەی حکومەتی هەولێر (هەندێ لە ناوچەکانی هەولێرو دهۆک)ی ژێر دەسەڵاتی پارتی دیموکراتی کوردستان، **سێیەم**: پارچەی (کەرکوک) کە بە شێوەی ئێستای: ناوچەی کوردنیشینی دووزخورماتوو هەر ماوەتەوە لەسەر پارێزگای تکریتی فرە عەرەبی و، کفری لەسەر پارێزگای دیالەی فرەعەرەبی و چەمچەماڵ و کەلار کە دوو ناوچەی هەرە گەورەی کوردنیشینی کەرکوکن لەسەر سلێمانی و، **پارچەی چوارەم**: پارچەی ناوچەکانی پارێزگای (مووسڵە)، کە بە دامەزراندنی پارێزگای دهۆک و سیاسەتی بە عەرەب کردنی زۆر لە ناوچەکانی، زۆرینەی کورد لەم پارێزگایە (پارێزگای مووسڵ) لە سنووری موحاڵە. هەروەها جێگای گومانە مانەوەی مەخموور لەسەر ئەم پارێزگایە گۆڕینێکی ئەوتۆی لەسەر ڕێژەی کوردی مووسڵ. خانەقین و مەندەلیش بەهەمان شێوە هەر لەسەر دیالەیە.

٤- ئیمزاکردنی ئەو ڕێککەوتننامەیە لەلایەن (پۆل بریمەر)ی ئەمریکیەوە وەکو حاکمی فیعلی عێراق و بەڕێز (جەلال تاڵەبانی) وەکو سەرۆکی کاتی ئەنجومەنی دەسەڵات لە عێراق : **ئیقرار کردنی ئەمریکایە وەکو هێز ودەسەڵاتی داگیرکەرو، دەسەڵاتی عێراقی و، خوودی کوردیش، بە وەلاوەنانی فیدراڵیەت لە سەر ئەساسی نەتەوایەتی و جوگرافی و بڕیاری پەرلەمان و هێزە سیاسیەکانی کوردستان**. واتە وەلاوەنانی بڕیار و هەست و خواستی خەڵکی کوردستان.

ئیقرارکردنی نوێنەرانی کورد لە ئەنجومەنی دەسەلاتی کاتی عێراق لەسەر ئەو ڕێککەوتننامەیە، پاشگەزبوونێکی خەتەرناکە و لە بڕیاری پەرلەمانی کوردستان بەدەرە، کە مافی ئەویشیان نییە.

بەهەر حاڵ، هەموو ئەوانە لە زەرەرو زیان و لە دەستدانی فرسەتی لە بار زیاتر، چی ترمانی بۆ وەدەست نەهێناو بۆ وەدەست ناهێنێ. لەگەڵ ئەوەش :

هێشتا فرسەت ماوە و لە سەرەتای قۆناغی داڕشتنی دامەزراندەوەی عێراقین و، بە پێی کارەسات و ئەزموونەکانی خەڵکی کوردستان و هەڵوێست و بڕیارەکانی داگیرکەری ئەمریکی و هاوپەیمانان و ئەنجومەنی کاتی دەسەلاتی عێراق، کێشەی چارەنووسی میللەتەکەمان لەدووریانێکی خەتەرناکەو، **ناکرێت چاویان لێ بپۆشرێت و سستی بنوێنین، تەنها سەراحەت و خستنە رووی کێشەکان بە زەقی و روون و ئاشکرا و عەلەنیەت و گەڕانەوە بۆ حوکمی میللەت ڕێگای دروست و حاسیمە.**

هێشتا ئەم عێراقە داگیرکراوەو، داگیرکەر دەبێت بە پێی یاسای نێودەوڵەتی رەفتار لەگەڵ گەلانی عێراق بکات. هەموو یاسا و پەیمانەکانی نێودەوڵەتی کە پەیوەندییان بەمافی گەلان و دیموکراسیەوە هەیە، دەسەلاتی داگیرکەر ئیلزام دەکات کە ڕێز لە هەست و خواستی میللەتی کورد بگرێت. کاربەدەستانی ئەمریکا بە خودی سەرۆک (بۆش)یانەوە هەمیشە جەخت لە سەر ئەوە دەکەن کە میللەتی عێراق بە هەموو نەتەوەکانیانەوە بڕیاری سیستەمی سیاسی و چارەنووسی خۆیان دەدەن و ئەوان، واتە ئەمریکا، ڕێز لە ئیرادەیان دەگرن.

**باشە: کورد یەک لە دوو نەتەوە سەرەکیەکەی عێراقە. بڕیاری خۆیشی داوە. ئەو بڕیارە بە تێکڕای دەنگی پەرلەمانێکی هەڵبژێردراوی کوردستان وەرگیراوە. هەموو هێزە کوردستانیەکانیش لەسەر ئەو داوایە یەک دەنگن و پشتیوانی لێ دەکەن. ئەو بڕیارەیش خراوەتە بەردەمی هێزکانی عێراق لە توێی دوو دۆکۆمێنت (هەردوو پرۆژەی دەستووری عێراقی فیدراڵ و هەرێمی کوردستان). ئەمریکاو هاوپەیمانانی ئاگادارن. کەچی نە داگیرکەر و نە هێزە عەرەبیەکانی عێراق تاکو ئێستا ئاوڕی لێ نادەنەوە، بگرە تاکو حەدێک پاشگەزیش بوونەتەوە لە وەعدو پەیمانی پێشوویان ..!**

هەڵوێستی داگیرکەری ئەمریکی و هاوپەیمانی و لایەنە غەیرە کوردیەکانی نێو ئەنجومەنی کاتی دەسەڵات و بڕیاری دوایی سەرەوەی ئاماژە پێ کراو، جارێکی تر مافی چارەنوسی کوردی وروژاندەوەو، لە نێو کۆڕو کۆبوونەوەی توێژە جیاجیاکانی کوردستان، لە ناوەودو لە دەرەوە، دوو پرسی گەورەی خستوەتە روو :

**یەکەم: تۆ بڵێیت کورد بتوانێت لەسەر (فیدرالیەت)، لەگەڵ لایەنەکانی سیاسی غەیرە کورد لە عێراق پێک بێت...؟.**

**دووەم: ئایا فیدرالیەت وەک (خیار)یکی سیاسی لە عێراق پیادە دەکرێت؟**

**پێش ئەوەی وەڵامی ئەم دوو پرسیارە بدەینەوە، بە باشی ئەزانم ئاماژە بە ئەوە بکەم کە:**

١- ئەوەی لێرەدا هاتووەو دێت سەبارەت بەم بابەتە، راو بۆچوونی شەخسی خۆمانە، بەو ئومێدەی ئەوەی لەگەڵیدا نەبێت، بە رایەکی رەق و توند و دوور لە واقع و ناگەشبین لە قەڵەمی نەداو، هەڵوێست و بۆچوونێکەو زیاتر لەوەیش تەحمیل نەکرێت و، هەر لەم بارەوە زۆر لەوانەی نزیکی ئێمەن لە هەڤالان و برادەران، لە مێژەوە ئاگاداری راو بۆچوونمانن، چ لەمەڕ قۆناغی بەسەرچوو، یان ئەوەی ئێستاو، چ لەمەڕ خودی فیدرالیەت و جاڕدانی (پەرلەمان)ی ساڵی ١٩٩٢، یان پرۆسەی رزگاری عێراق وگۆڕینی بە داگیرکردنی، جگە لە کێشەو پرسی تر. خوازیارین هەر هەمووی لە چوارچێوەی ئازادی بیرو بۆچوون وراو راگۆڕینەوە وەربگیردرێت.

٢- بەندە هەر لە پێش رمانی رژێمی گۆڕبەگۆڕی سەدام لای وابوو حیوار و دانوساندمان لەگەڵ لایەنە پەیوەندیدارەکان لەمەڕ پرسی کورد و کوردستان دەبێت لە قەوارە کلاسیکیەکەی دەرچێت، **واتە (حصر) کردنی کێشەکەمان لە نێوان کورد و تاکی دیکتاتۆریەکی حوکمڕانی عێراق هیچی لە هەڵوێستی نوێنەرانی گەلی عەرەبی باڵا دەست نەگۆڕیوەو** ناگۆڕێت. بەڵکو ئەو جۆرە بۆچوون و مامەڵە کردنە لەگەڵ کێشەکە تەزکیە کردنی ئەو هێزانەیە و پاڵپشتیەکیشە بۆ گوێنەدان و لاساری و، لەکاتی پێویستیش پشتگیری لە بیرو بۆچوون و رەفتاری تاکی دیکتاتۆرو هەروەها کارهاسانیە بۆ ئەوانە بۆ

ئەوەی بە ئەرکی مرۆڤایەتی و نیشتمانی خۆیان وەکو پێویست هەڵنەستن.
**چەند بڕیاری چارەنووسی کورد لە کوردستانی عێراق لە چوارچێوەی عێراق ئەرکی کوردە، ئەرکی عەربی عێراقی باڵا دەستیش وەکو زۆرینە کەمتر نییە، لە پرۆسەیەکی دیموکراسی.**

٣- پێش رمان و نەمانی رژێمی سەدام، رامان وابوو **کە سیاسەتی ئەمری واقعی بەعەرەب کردنی ناوچەکانی کوردستان بە هەڵمەتێکی کوردانەو فەرزکردنی ئەمری واقع دەسڕدرێتەوە.** بە تایبەتی لە هەلە مێژووییەکاندا. پێش ٢٠٠٣/٤/٩، لە کۆبوونەوە جیاجیاکاندا جەختمان لە دوو پرنسیپ دەکرد: **یەکەمیان: نابێت (سیفەر) بە (لۆزان) بگۆڕینەوە. دووهەمیان : لە کاتی دارمانی رژێمی خوێنڕێژی سەدام تەنها چەند سەعاتێکمان پێویستە وەکو کورد واقعی بەعەرەب کردنی کوردستان نەهێڵین ...! تەعریب لە هەلێکی ئیستسنائی و بە زۆر فەرز کراوە، هەر لە هەلێکی ئیستسنائی و هەڵمەتێکی کوردانەشدا چارەسەر دەکرێت و، تەدویل کردنی کێشەی بە عەرەب کردنی کوردستان (موغامەرە)یەکی بێ (حیسابە)..!**

## یەکەم:

## تۆ بلێیت کورد بتوانێت لە سەر (فیدراڵیەت) لەگەڵ لایەنە سیاسیەکانی غەیرە کورد لە عێراق پێک بێت....؟

لەکاتێکدا هێشتا لە فەلسەفەی دەسەلات و شێوەکانی دەوڵەت لە عیلمی رامیاریدا (بە شێوەیەکی تیووری)، دەوڵەتی ناوەندیی یەک نەتەوەیی بالادەست بەهێز و خۆڕاگرە، کەچی لە پراکتیکدا دەوڵەتێکی یەک رەگەزو یەک نەتەوە بە دەگمەن نموونەی ماوە لە جیهانی ئەمڕۆدا. بەرامبەر ئەمە سیستەمی فیدراڵیەت بە هەموو جۆرەکانیەوە رۆژ بە رۆژ لە پەرەسەندندایە، ئەو دەوڵەتانەیش کە بەرسمی سیستەمەکەی یەک لە شێوەکانی (فیدراڵیەت)ی بە خۆیەوە نەگرتووە، کەم، یان زۆر سوودیان لە بنەماکانی فیدراڵیەت وەرگرتووە.

**ئەمڕۆ :**

* زیاتر لە (٨) هەزار کۆمەڵگاو گرووپی رەگەزی جیاجیا لەجیهاندا بلاو بوونەتەوەو، هەست بە بوون و شناسنامەی نەتەوایەتی ورەگەزی خۆیان دەکەن.
* لە کۆی گشتی زیاتر لە (٢٠٠) ولاتی سەربەخۆ کە ئەندامی نەتەوە یەگکرتووەکانن، زیاتر لە (١٧٠)ی فرە رەگەزن، واتە لە سنووری ٩٠٪ ولاتانی سەربەخۆی جیهان ولاتانێکی فرە رەگەزن.
* لە سنووری (٣٠٠) نیزامی سیاسی جیا جیای وەکو دەوڵەت، یان بە شێوەو شیوازەی دەوڵەت لە دونیای ئەمڕۆدا دەسەلاتیان هەیە.
* زیاتر لە(نیوەی) ولاتانی دونیا بە رەسمی سیستەمەکانیان (یەکێتی کۆنفیدراڵ، یان فیدراڵ)ـە.
* سەرەڕای ئەمانە دەیەها حکوماتی خۆجێی (خاوەن دەسەلات و پێکهاتەی دەستووری) لەجیهاندا، سیستەمی حوکمڕانییان لە نێوان (لامەرکەزی) و (ئۆتۆنۆمی) بە هەموو جۆرەکانی، بەڕێوەدەچێت.
* ولاتانی هەرە پێشکەوتوو و بەهێز و ئارم و دیموکرات و ئازاد، ئەو ولاتانەن کە فیدراڵن وەکو: ئەمریکا، بەریتانیا، ئەلمانیا، ئیسپانیا، پورتگال، سویسرا،

بەلجیکا، کەندا، ئیتالیا. جگە لە دەها ولاتانی تری وەکو هند، پاکستان، ئیماراتی عەرەبی، مالیزیا، ئەفریقیای باشوور، بەرازیل...هتد

**دەکریت بلێین (فیدرالیەت) سیستەمی نوێی ئایندەی جیهانە و بەرە بەرە تەنگ هەلئەچنێت بە شێوەکانی تری پێکهاتەی دەولەت، ئەمەیش سیمایەکی گرنگ و تایبەتی دیاردەکانی سەدەی(٢١)ە کە یەک لە هۆکارەکانی ئەم پەرسەندنە دەگەرێتەوە بۆ گەش و نەما کردنی هەستی بوون و شناسنامەی نەتەوایەتی و رەگەزی و هەرێمایەتی و ئایینی و مەزهەبی** و، پێشبینیش دەکرێت کە ئەم کێشەیە ببێتە خالێکی گەرمی ململانێی ئایندە و لەسەرووی خالەکانی ئەجندەی کۆمەلگای نێودەولەتی جێگیر بێت وەکو کێشەیەکی سەرەکی سەدەی بیست و یەکمان چونکە:

* **(فیدرالیەت) بە سادەیی:** ئەو دیاردەیەیە کە ژماریەک لە (خیارات) دەخاتە روو بۆ رێکخستنی دەسەلاتی سیاسی و لە چوارچێوەی پرنسیپەکانی و، **کاکلەکەی بریتییە لەشەراکەت کردن لە حکومەتێکی خاوەن دەسەلاتێکی ناوەندی کە کاروبارە نیشتمانی و نێو نەتەوەییەکان بەرێوەدەبات و، زیاتر لە یەک حکومەتی خۆجێیەتی (محلی) بۆ هەلسوکەوت بە گوێرەی باری جیاوازی کۆمەلگە جۆر بەجۆرە خۆجێیەکانەوە**، بە واتەیەکی تر:
* **فیدرالیەت شەراکەت کردنی** چەند هەرێمێکی جیاواز لە یەکتر بەهۆی (رەگەز یان زبان یان ئایین یان مەزهەب یان باری ئابووری...هتد) لە دامەزراندنی دەسەلاتێکی هاوبەشی لەسەر بنەمای ئارەزوومەندانەیان...یان:
* **دەولەتێکی ناوەندی فرە لایەنە** (رەگەز، زبان، ئایین، مەزهەب، ئابووری)، هەلدەوەشێتەوە و سەر لەنوێ بە هۆی زیاتر لە یەک لەو هۆیانەی سەرەوە، یەکێتییەکی ئارەزوومەندانە لە نێوان خۆیاندا دروست دەکەن لەسەر بناغەی هاوبەشی دەسەلات...

واتە فیدرالیەت ئەو کاتە دادەمەزرێت کە چەند کۆمەلگایەکی سیاسی و(سەربەخۆ) و چون یەک، بیانەوێ حکومەتێکی هاوبەش پێک بێنن، وە بۆ ئەم مەبەستە یەک دەگرن. فیدرالیەت جۆری زۆرە. هەتاکو لە یەک دەولەتی ناوەندی فیدرال، لەپراکتیکدا دەرکەوتووە چەندەها (خیار)ی بۆ رێکخستنی بەرێوەبردنی سیاسی و

دەسەڵات دەستەبەر دەکات. بۆ نموونە لە ئەمریکاو بەریتانیا ئێستا (٦) نیزامی جیا جیای حوکمڕانیان هەیە.

دەوڵەتی فیدراڵ لە خۆیەوە دانامەزرێت، بەڵکو چەند هۆکارێکی ناوەکی و دەرەکی هەنە کە دەبنە هاندەر بۆ پێک هاتن، یان دامەزراندنی، لێرەدا ئاماژە **بەم دوو خاڵەی خوارەوە دەکەین کە بە دیدی ئێمە بۆ قۆناغ و بارودۆخی ئەمڕۆی کوردستان و عێراق گرنگن**، هەردووکیان بنەڕەتی ئارەزووی رازی بوون بە (فیدراڵیەت) دروست و بە هێز دەکەن:

١- **خواستی سەرکردە سیاسییەکان**، ئەوانەی فیدراڵیەت دەخەنە روو بۆ چارەسەر کردنی کێشەیەکی نەتەوایەتی، یان هەرێمایەتی، یان ئاینی، یان مەزهەبی، یان بۆ فراوان کردنی دەسەلاتی هەرێمایەتی. ئامانجیش بەرەنگاری لە هەر جۆرە مەترسیەک کە دەبێتە مایەی پێشێل کردنی مافی کۆمەڵگاکانیان، یان دەست درێژی کردنێکی دەرەکی سەربازی، یان دیپلۆماسی. وەلێ لەگەڵ خواستنی ئەو (چەسپاندن)، یان (فراوان کردنە)شدا، ناتوانن لە رێگای سەرکوت کردن و داگیرکردنەوە، ئەو ئارەزووە جێبەجێ بکەن، هۆیەکانیش زۆر و جیاوازن وەکو: باری نێودەوڵەتی، ئیقلیمی، نیشتمانی، سەربازی، ئایدەلۆجی، ئابووری و کۆمەلایەتی...هتد. بۆیە ئەگەر بیانەوێ یەک لە مەرجەکانی (هەردوو) خواستەکە ئەنجام بدەن، یان هەردووکی، پێویستە هەندێ کارهاسانی و مرونەت و (تنازل) بۆ سەرکردەی یەکەکانی تری بەرامبەر بکەن.

٢- **ئەو سیاسەتمدارانەی کە بەو ئاڵوگۆڕییە قایل دەبن** و لە پێناو یەکگرتندا واز لە هەندێ سەربەخۆیی خۆیان دێنن، بۆ ئەوەی رزگار بن لە (**ژیانێکی سەربەخۆی لاواز**)، **یان پێکەوە ژیانێکی لکێندراوی بێ ئارەزوومەندانەو بە زۆر سەپێندراو، یان هەڕەشەیەکی دەرەکی سەربازی، یان باری ئابووری**..هتد.

واتە فیدراڵیەت چ بە مەبەستی (**چەسپاندن**) یان (**فراوان کردنی**) دەسەلات و چ بۆ (**پاراستن**)، دەبێت بە پێی بارودۆخ و، پێویستی ئەو کیانانەو قۆناغەکەو **لە سەر ئەساسی یەکێتیەکی ئارەزوومەندانە** بێت، ئەگینا فیدراڵیەت:

* تەنها بۆ فیدرالیەت بێت، واتە بێ ناوەرۆکێکی پاساونەدراو، ئۆتۆنۆمیە کارتۆنیەکەی سەدامی گۆڕ بە گۆڕە.
* تەنها بۆ دابەش کردنی هەندێ لە دەسەڵاتی ناوەند بە سەر ئەترافەکاندا، واتە لامەرکەزییەتی ئیداری لەسەر ئەساسی پارێزگاکان، ئەمەیشیان کێشەی نەتەوایەتی و ئایینی، یان مەزهەبی چارەسەر ناکات.

هۆو هۆکاری پێکهاتەی زۆربەی زۆری ولاتە (فیدرالەکان) جیاوازە. هەر لە سوونگەی جیاوازییەکانەوە راڤە کردنی هۆ و هۆکارەکانی بە(فیدراڵ) کردنی عێراق لێرەدا ئەهمیەتی خۆی هەیە. ئەگەر چ ئەو (فەدرەلە)کردنە زیاتر لایەنی کوردی خستویەتە روو و جەختی لەسەر دەکات و مەبەستیەتی، بەڵام جێبەجێ کردنی تەنها ویست و بڕیاری کورد نییە. ویست و هۆکارو ئامانجەکانی بەرامبەریش گرنگی و تایبەتمەندی خۆی هەیە، هەروەها جۆری فیدرالیەتەکەش، مەبەستمان لێرە عەرەبی باڵا دەستی عێراقە بە تەحدید، **چونکە کێشەی ئێمەی کورد لەگەڵ دسەلاتی ناوەند وەکو نوێنەری عەرەبی باڵادەستی عێراق:**
* **لەسەر شناسنامەی ( هاوولاتی) عێراقی نەبووە.** کورد بە گشتی لە عێراق (عێراقی)یە، مافی هاوولاتی هەبووە، بە پێی هەلومەرجی سیاسی و هەلوێستی تاکی کوردی هاوولاتی عێراقی، ماف و پلە و پایەی وەکو **عێراقییەکی (ڕەسەن)** پارێزراو بوو. بۆیە ناکرێت لە سونگەی مافی **(المواطنة)** رێچکەی راو بۆچوونەکان بڕوات بۆ فیدرالیەت لە عێراق، کە ماوەیەکە رۆشنبیران و سیاسەتمەدارانی عەرەبی عێراقی جەختی لەسەر دەکەن. **کێشەکەمان بۆ ئەوە نەبووە کە کورد هەیە یان نە**، یان یەک دوو وەزیرمان هەبێت لەم کابینە یان ئەوی تر، یان کورد پۆستی وەزارەتی (سیاد)ی بەر کەوتووە یان نە. لە ماوەی زیاتر لە ٨٠ ساڵی کیانی عێراقی تازە لە حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی ئەو عێراقە کوردێکی زۆر پلەو پایەی بەرزی هەبووە...!
* **لەسەر ئەساسی ئایینی، یان مەزهەبیش نەبووە، چونکە زۆربەی زۆری خەڵکی کوردستان بە ئایین ئیسلامن و بە مەزهەب سوننەن و، هەمیشە دەسەلاتی ناوەندی عێراقیش لە رووی ئایینی و مەزهەبی بەو شێوەیە بووە. کەچی نەک هەر مافەکانمانیان پێشێل کردووە بەڵکو قڕیشیان کردووین..**

* کێشەی ئێمە کێشەی نەتەوەیەکە **پێی ئەڵێن کورد**، خاکەکەی (**وڵاتێکە**) کە پێی **ئەڵێن کوردستان**، ئەم نەتەوەو خاکە بە تایبەتی دوای شەڕی جیهانی یەکەم و بەپێی ڕێککەوتننامەی (**سایکس -پیکۆ**) دابەش کراو، بە پێی چەند بەڵگەنامەیەکی نێودەوڵەتی دەبوایە کوردیش وەکو گەلانی تری دراوسێی کیان و دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی هەبایە، بەڵام لەبەر بەرژەوەندی زلهێزان و باری سیاسی و کۆمەڵایەتی بزاڤی کوردان، نەک هەر پاشگەز بوونەوە، بەڵکو دیسان دابەش کراو پارچەی باشووری، بە گەل و خاکەوە، لکێندرا بە (عێراق)ێکی داتاشراوی نوێ، بێ ڕەچاو کردنی ئارەزوو و هەڵوێستی خەڵکی کوردستان و زامن کردنی مافەکانی و، ئەو بەڵێنەش کە درابوو پشت گوێ خرا. لەو ساتەوە تاکو ئەم سەردەمە:
* نە کوردستانی عێراق ئارامەو نە عێراقیش سەقامگیرە.
* نە خەڵکی بەشەرفی کوردستان دەستیان لە شناسنامەی نەتەوایەتی و خاکی خۆیان هەڵگرتووەو نە بزاڤەکەی بە گشتی دریغی کردووە لە داکۆکی کردنی لە خاک و مافی کوردان.
* لەهەر گەمەیەکی سیاسی نێودەوڵەتی و ئیقلیمی لە ناوچەکە کێشەی کورد میحوەرێکی سەرەکی بووەو، **هەمیشە وەکو کورد لەو گەمانە زەرەرمەند بووینە، لە هەر سەنگەر و لایەک بووبین. هۆکاریش زۆرە.**
* لە هەر ئاوڕدانەوەیەکی ناوەند بۆ چارەسەر کردنێکی سیاسی و ئاشتیانەی کێشەی کورد، بۆ گفتوگۆ و مروونەت و شەفافیەت، **هەمیشە کورد دەستپێشخەربووە. بەڵام بە داخەوە هەموو جار بە زەرەرمان شکاوەتەوە.**

* دەکرێت بڵێین هەمیشە کورد خوازیاری چارەسەرێکی بنەڕەتی و پەیوەندییەکی ستراتیجی و ئارەزوومەندانە بووە، سەبارەت بە کێشەی نەتەوایەتی و دەسەڵات لە عێراق لەگەڵ ناوەند. کەچی هەمیشە:
* دەسەڵاتی ناوەند بەرنامە و پرۆگرام و پەیوەندی و هەڵسوکەوتی تاکتیکی بووە و ئامانجیش لاوازکردن و نەهێشتنی بزاڤی کوردایەتی و سەپاندنی دەسەڵاتی تاکڕەوی خۆی بووە بە سەر کوردستاندا. واتە ئەوەی پێی نەکرابێت بە زەبری ئاگر و ئاسن و پیلانی ئیقلیمی و نێودەوڵەتی جێبەجێی بکات، هەوڵی داوە لە

ڕێگای گفتوگۆ و ڕێککەوتن و نەخشە سەری بخات. ئەگەر هەندێ بنەمای سەلماندبێت، لە قۆناغێکی تایبەتی، لە یەکەمین هەل لێی هەڵگەڕاوەتەوە.

* **زۆر لەتوانای دەسەڵاتی ناوەند (سەربازی و سیاسی) بە هۆی سەروەت و سامانی کوردستانەوە گەشەنمای کردووە.** تاکو ئەم قۆناغەش سامانی نەوتی کەرکوک شادەماری ئابووری عێراق پێک دێنێت، لەو سەروەت و سامانە نەک هەر کورد بێ بەش کراوە لێی، **بەڵکو هەر بەو سەروەت و سامانە دەسەڵاتی ناوەند شەڕی قەڵاچۆ کردنی کورد و خاپوور کردنی کوردستانی کردووە ....**
* ڕاستە توێژێکی بەرچاو لە عەرەبی عێراق چەند ماف و تا ڕادەیەک بوون و قەوارەیەکی نەتەوایەتیمان لێ قەبووڵ دەکەن، وەلێ تاکو ئێستا زۆربەیان:
* کوردستانی عێراق وەکو پارچەیەک لە کوردستانی گەورەو، میللەتی کورد لە کوردستانی عێراق وەکو بەشێک لە نەتەوەی کورد، **هەزم ناکەن.**
* ئەمەی کە پێی ئەڵێن دەوڵەتی عێراق تەمەنی لە سەدەیەک کەمترەو بە زۆری زۆرداران کوردستانی باشووریان پێوە لکاندووەو ئەوەی هەڵساوە بەم گوناهە داگیرکەری ڕۆژئاوا بوو و، دژی خواست و بەرژەوەندی میللەتانی عێراق و ناوچەکە بوو، ئەنجامیش دوو بەرەکێ و کوشتن و بڕین شەڕو کارەسات و دیکتاتۆریەت و فاشیەت و کاول کردنی وڵاتەکەمان بوو. **چەند سەروەت و سامانی خەڵکی عێراقیان بە تاڵان برد، ئەوەندەیشی بە کار هێنرا بۆ کاول کردنی.**
* **پرنسیپی شەراکەت و یەکسانی و غەدری مێژوو و جوگرافیا نابینن** و، هێشتا ئەوەی وەدەستمان هێناوە و داوای دەکەین بە نەخشە و بەهان و پاڵپشتی نەیارانی (عەرەب و عێراق)ی لە قەڵەم ئەدەن. **سەربەخۆیی کوردستان لای ئەوان تاوانە و فیدراڵیەت جیابوونەوەیە، یان هەنگاوێکە بۆ تاوانەکە..**

وەکو هێزو لایەنی عەرەبی عێراق، بە دەر لە ڕاو بۆچوونی تاک، **تێروانینیان بۆ دۆزی کورد لە چوارچێوەی ئەو خاڵانەی سەرەوە تێ ناپەڕێت. بۆیە قەناعەتێک و ڕازیبوونێکی ئارەزوومەندانەی ڕوون و زوڵاڵ ڕەچاو ناکرێت لە نێوان زۆربەی هەرە زۆریان و بە گشت باڵەکانیانەوە، ئەوەیش هەیە مژوو تەماوییە.**

**تاکو لایەنی بەرامبەر نەگەنە ئەو ڕاستیانەی کە باسمان کرد، دارشتنەوی عێراقێکی فیدراڵی بە کێش و پێوانەی لایەنی کوردی خواستێکە لە حوکمی موحاڵە.**

تاکو ئێستا ئێمەی کورد زیاتر کێشەی فیدرالّیەت بۆ خۆمان باش روون دەکەینەوە. گەمەکە هێشتا لە گۆڕەپانی خۆماندایە. **پێویستە بیگوێزینەوە بۆ ناو مالّی بەرامبەرمان. بەرامبەرمانیش ئەمڕۆ ئەمریکاو هاوپەیمانەکانیەتی، بە دەسەلاّتی داگیرکەر لە بەغداو مەلّبەندەکانی بڕیارو رای گشتی ئەمریکاو ئەوروپا بە تایبەتی، وەکو بالّی یەکەم، بالّی دووهەمیان، برای عەرەبی زۆرینەی بالاّدەستی عێراقە، بە هێزو رای گشتییان.**

پێویستە سەرکردایەتی کورد سوور بێت لەسەر بڕیاری خەلّکی کوردستان لەمەڕ فیدرالّیەت و، لە پالّ مرونەت و شەفافیەت و ئاشکرا گوێیی و باس کردنی کێشەکان وەکو هەیە بە گیانێکی بوێرانە و مبدەئی، گەڕانەوە بۆ خەلّکی کوردستان و ئاگادار و ئامادە و تەحشید کردنی لە دژی هەلّوێستی بەرامبەرەکانمان و، ئەو لەمپەر و کێشانەی کە هەنە، یان دێنە پێش.

**واتە لایەنە بەرامبەراکانمان، بە تایبەتی دەسەلاّتی داگیرکەری ئەمریکی، رووبەرووی جەماوەری کوردستان بکرێتەوە، بە شێوەو شێوازێکی شارستانیەت و مەدەنی، تێدا گشت کەنالەکانی راگەیاندن و دام ودەزگا مەدەنی و جەماوەریەکان شان بە شانی سیاسەتمەدارانی کوردستان ئەرکی رووبەروو بوونەوەکە بخەنە ئەستۆی کورد. (حصر) کردنی ئەم پرسە لەنێوان سەرکردایەتی لایەنەکانی کوردی عێراقی و، یان لە نێوان ئەوان و دەسەلاّتی داگیرکەرو لە چوارچێوەیەکی داخراوو نهێنی بۆ کێشەیەکی وەها چارەنووسسازو، لە کۆمەلّگایەکی کراوەو دیموکرات، بایەخ نەدانە بە کێش و سەنگی جەماوەر لەم ململانێیەو لەم کات و ساتە کە هەرچی میدیا لە جیهان هەیە روو لە عێراق و ناوچەکەمانە.**

## دووهەم:

## ئایا فیدرالیەت وەک (خیار)ێکی سیاسی لە عێراق پیادە دەکرێت...؟

لە باری (تیوریەوە) ئەتوانین بڵێین (**بەڵێ**). چونکە:

* هەر وەکو لە سەرەوە باسمان کرد کۆمەڵێک بەڵگەنامەو پەیمانی نێودەوڵەتی و میساقی نەتەوە یەکگرتووەکان و، بنەماکانی مافی مرۆڤ و رێککەوتننامەکانی پاش شەڕی جیهانی یەکەم (پەیمانی سیڤەر ١٠/٨/١٩٢٠)و، (مادده ١٦ی لائیحەی ئینتدابی بەریتانیا لەسەر عێراق ساڵی ١٩٢٠) (بەیانی مەندووبی سامی بەریتانی پاش دامەزراندنی حکومەتی کاتی عێراق لە ٢٥/١٠/ ١٩٢٠ -لە پێش ریفراندۆمەکەی هەردوولا سەبارەت بە فیصل-)، بەیانی هاوبەشی (حکومەتی بەریتانیاو عێراق لە ٢٤/١٢/ ١٩٢٢)و، قەبووڵ کردنی عێراق بە ئەندامەتی (عصبه الامم ساڵی ١٩٣٢)و، دەستووری عێراقی ساڵی١٩٥٨ و ساڵی ١٩٧٠و رێککەوتنەکانی ساڵانی شۆڕشی ئەیلولی مەزن بە تایبەتی رێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠و، بگرە یاسای ئۆتۆنۆمیە کارتۆنیەکەی سەدامیش.
* بڕیاری (٦٨٨ لە ٤/ نیسان/ ١٩٩١)ی* ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی و، کۆبوونەوەی یەکێتی ئەوروپا لە (لۆکسمبۆرگ)و، بڕیاری نەخشەی ناوچەی ئارام لە ژووری هێڵی ٣٦ لە کوردستانی عێراق و، تەواجدی هێزی هاوپەیمانان لە ٨نیسانی/ ساڵی ١٩٩١ بە سەرپەرشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، کشانەوی ئیداراتی حکومەتی ناوەندی بەغدا لە کوردستانی ئازاد و ئابڵووقەی ئابووری لە پاییزی ساڵی ١٩٩١.
* هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٢و دامەزراندنی پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان و یاسا و بڕیارەکانی ئەم دوو دەزگایەو ئیدارەی ناوچەی ئازاد لە ساڵی ١٩٩١، تاکو ئێستا.
* بڕیاری ٩٨٦ (نەوت بەرامبەر بە خۆراک و دەرمان)**و، جێبەجێ کردنی ئەو بڕیارە لە ناوچە ئازاد کراوەکانی کوردستان بە تنسیق و هاوکاری لە نێوان

---

* بروانە دەقی بڕیارەکە لە پاشکۆی ژمارە «١» - ل٢١٥

** بروانە دەقی بڕیارەکە لە پاشکۆی ژمارە «٣» - ل٢٢٣

(رێکخراوەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان) و حکومەتی هەرێمی کوردستان تاکو نەمانی رژێمی سەدام و ئێستایش راستەوخۆ هەردوو ئیدارەی کوردستان پێی هەڵدەستێت.

* هاوکاری و مامەڵە کردنی ئەمریکاو هاوپەیمانان راستەوخۆ لە پرۆسەی ئازاد کردنی عێراق لەگەڵ حکومەتی هەرێمی کوردستان بە هاوکاری و بە هێزی پێشمەرگەو، بەشداربوون لە بەڕێوەبردنی عێراق لەگەڵ دەسەلاتی داگیرکەر تاکو ئێستا.

* سەلماندنی (فیدراڵیەت) لەلایەن زۆربەی هەرە زۆری لایەنە سیاسیە رەسەنەکانی عێراق بە عیلمانی و ئیسلامییەوە، بە مارکسی و لیبراڵ و نەتەوایەتی و دیموکراتییەوەو، لە کۆنگرەی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی لە نەمسا ساڵی ١٩٩١، لە سەلاح الدین و شەقلاوە ساڵی ١٩٩٢و، کۆنگرەی لەندەن لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٢و، لە کۆبوونەوەی لیژنەی (تەنسیق و موتابعە) زستانی ساڵی ٢٠٠٣ لە (سەلاحەدین) و کۆبوونەوەی (الناصریە) لە کاتی رمانی رژێمی سەدام لە بەهاری ٢٠٠٣و، بڕیاری ئەنجومەنی دەسەلاتی کاتی عێراق لە هاوینی هەمان ساڵ.
* رێککەوتننامەی (١٥/١١/٢٠٠٣)*ی نێوان ئەنجومەنی دەسەلاتی کاتی عێراق و ئیدارەی مەدەنی هاوپەیمانان لە بەغدا، کە بەڕێزان (جەلال تاڵەبانی) وەکو سەرۆکی ئەنجومەنی دەسەلاتی کاتی و (پۆل بریمەر) وەکو لێپرسراوی ئیدارەی مەدەنی هاوپەیمانان لە عێراق مۆریان کردبوو.
* لە هەمووی گرنگتر نەمانی رژێمی دیکتاتوری سەدام و قەدغە کردنی هەموو جۆرە چالاکیەکی حیزبی بەعسی سۆشیالیستی عەربی عێراق و هەروەها داڕووخانی هەموو بیرو بیرکردنەوەیەکی فاشیانە و رەگەزپەرستی ئەم حیزبە.
* داگیرکردنی عێراق و دارشتنەوەی بە بنەماو شێوەو شێوازێکی نوێ و گونجاو لەگەڵ پەیمان و رێککەوتنەکانی نێودەوڵەتی بە تایبەتی مافی مرۆڤ و گەلان و، داکۆکی کردنی دەسەلاتی داگیرکەری ئەمریکا بە سەرۆک (بۆش)ەوە، کە جگە لە ئەرکەکانی تری هێزی داگیرکەر لە عێراق، دامەزراندنەوەی عێراقە لەسەر

* بڕوانە دەقی رێککەوتننامەکە لە پاشکۆی ژمارە «٤» - ل.٢٣٠

ئەساسێکی دیموکراسی. هەڵبەتە یەک لە بنەماکانی دیموکراتیەت، ڕێزگرتنە لە خواست و ویستی گەلان.

* هەڵوەشانەوەی دەستووری کاتی ڕژێمی دارماوی بەغداو هەندێ یاساو بڕیارە فاشییەکانی، چ لەلایەن (پۆل بریمەر) سەرۆکی دەسەڵاتی هێزی داگیرکەر لە عێراق و چ لەلایەن دام و دەزگا کاتییەکانی عێراقەوە.
* ئەگەر چی ناکۆکی و ململانێی سیاسی لە نێوان هەردوو لایەنی سەرەکی کوردستانی عێراق، (پارتی و یەکێتی) کەم یان زۆر هێشتا ماوەو، **یەک پەرلەمان و دوو حکومەت دیاردەیەکی نەشازو ناسروشتیەو، خاڵێکی لاوازی کوردە**، بەڵام تاکو ئێستا هەردوولاو گشت لایەنە سیاسییەکانی کوردستانی عێراق ڕێکن لەسەر فیدراڵیەت وەکو ئامانجی ئەم قۆناغە، وەکو ناوەڕۆکیش و، ئەمە خاڵێکی گرنگە. جا ئەگەر لەمپەرە دەرەکییەکان وەلاوەنەین، ئامادەباشی و قەناعەتی ئارەزوومەندانەو ڕاوبۆچوون و هەڵوێست و نیازەکانی لایەنە پەیوەندارەکانی عەرەبی باڵادەستی عێراق و، ڕۆڵی دەسەڵاتی داگیرکەری ئەمریکا دێتە گۆڕێ. ئەمەیش لایەنە عەمەلیەکەی ئەم پرۆسەیەیە واتە (بە فیدراڵ کردنی عێراق) کە بە داخەوە:
* پێشەکی و بە پێی ڕەوتی ڕووداوەکانی پێشووی ئەزموونی تاڵی سەرکردایەتی کورد لەگەڵ حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق (کە هەمیشە نوێنەری لایەنی عەرەبی عێراقی باڵا دەست بووە) وای کردووە: **هیچ کات بڕواو متمانە نەبووە بە بەڵێنەکانی ئەو حکومەتانەو، هەڵسوکەوت و هەڵوێستی هێزەکانی سیاسی عەرەبی باڵادەستی عێراقی ئەم و مژاویەو تاکو ئێستا کارێکی وەهایان نەکردووە، کە تاک و هێزی سیاسی کورد دڵنیا بکات لەمەڕ بڕیار و داخوازی ڕەوای خەڵکی کوردستان.**

یادگاری لەسنووری نیوسەدە لەشەڕ وپێکدادان و پاشگەزبوونی دەسەڵاتدارانی ناوەند، کە هەمیشە بە نوێنەرایەتی نەتەوەی باڵادەستی عەرەبی عێراق حوکمڕانیان کردووە، لە غەیری ڕاگوێزان و بەعەرەب کردن و خاپوور کردنی ژێرخانی ئابووری و شێواندنی قەوارەی نەتەوایەتی و کوشتنی بە کۆمەڵ و بەکار هێنانی چەکی کیمیاوی و بایەلۆجی قەدەغەکراو، بە تایبەتی لەم ٣٠ ساڵەی ڕابردوودا و،

کارەساتی هەڵەبجەو ئەنفال و ئەزموونی ئەم شەش مانگەی رابردوو، وە ئەو مشتومڕەی کە دەستی پێ کرد لەمەڕ فیدراڵیەت و تەعریب و گەڕانەوەی ناوچە کوردنیشینە لەت لەت و دابەش کراوەکانمان بە سەر پارێزگا عەرەبیەکانی ناوەڕاستی عێراق و، ئیدارەکردنی دەسەڵاتی داگیرکەرو هەڵوێستی بە تایبەتی بۆ ئەو ناوچانە (کەرکوک و مووسڵ و خانەقین و مەندلی..هتد)، هەر هەموو ئەوانە وای کردووە:

**کورد هەزار جار بیر بکاتەوە لە بیرۆکەی پێکەوە ژیان لەقەوارەی یەک دەوڵەتی عێراق.**

زۆر لە گەلانی دونیا کە لە چوارچێوەی یەک دەسەڵاتی ناوەند، یان یەک قەوارە دەژیان بێ هیچ زەرەرو زیانێک، بە گفتوگۆیەک، خۆپیشاندانێک، جیا بۆنەتەوەو هەر یەک لەوانە دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی جاڕ داوە، یان کۆنفدراڵێک، یان یەکێتییەکی فیدراڵیان لە نێو خۆیاندا پێک هێناوە.

بەش بە حاڵی خۆمان نابینم کوردو هێزە سیاسییەکانی درێغیان کردبێت لە باس کردن و هەوڵدان بۆ روونکردنەوەی رازو نیازی کورد، چی نەبێت لە نێو خۆماندا، سەبارەت بە عێراقێکی دیموکرات و ئازادو سەربەخۆو فرەحیزبی و پەرلەمانی و فیدراڵی یەکگرتوو، تاکو ئەو رادەیەی وەکو بڵێیت مرۆڤی کورد گومان لە خۆی بکات.

**بە پێچەوانەی ئەو جۆرە هەڵوێستە، دەبوایە لایەنی سیاسی عەرەبی عێراق بە تایبەتی هەوڵی دڵدانەوەو رازی کردنی کوردو داوای لێبوردن و تەمەنای پێکەوە ژیانی لێ بکردایە.**

راستە ئێمە کێشەمان لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەند بووە، بەڵام دەسەڵاتی ناوەند لە ئاسمانەوە نەهاتوەتە خوارەوەو بێ بنج و بنەوانەی نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی و ئایدۆلۆجیەت نەبووە. دەسەڵاتی ناوەند هەڵقوڵاوی کۆمەڵگای عەرەبی عێراقە، ئەگەر چی وەکو دەسەڵاتی دیکتاتۆریش ئەزێتی نەتەوەی خۆشی داوە. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کورد چاو لە هێزەکانی عەرەبی باڵا دەستی عێراق بپۆشێت و، دوای ئەم هەموو زەرەرو زیانانەو، لە واقعی ئەمڕۆی عێراق و هاوسەنگی هێزەکان و، پاش ئەو هەموو تەقەللاو پاڕانەوەیەی، هێشتا ئەوان قایل نین و، هەڵوێستی زۆریان هێشتا لە چوارچێوەی دروشم زیاتر نییە...!

**کاتی ئەوە هاتووە، ئەگەر درەنگیش نەبێت، هێزە سیاسییەکانی کوردستان و ڕۆشنبیرانی کورد، چی تر بە (ڕۆمانسیەتی) سەدەی ڕابردوو تەماشای ڕووداوەکان نەکەن، بەڵکو بە لۆجیکی جیهانی پاش شەڕی سارد و دروست بوونی دونیای یەک جەمسەری، زبانی عەولەمەو و گفتوگۆ و ڕێزگرتن لە بنەماکانی مافی مرۆڤ و مافی گەلان و دیموکراتیەت و بەگژداچوونەوەو بنبڕکردنی تیرهابی (دەوڵەت)و (گروپ)و (تاک) لە هەر کوێیەک بێت، زبانی ئاشتی و تەبایی و شارستانیەت و ئاسایی. باس لە کێشەی خۆمان بکەین.**

ئێمەی کوردی خاوەن هەڵەبجەو ئەنفال و هێماو نەموزەجی کێڵگەی تاقیکردنەوەی سیاسەت و چەکی جینۆسایدی کۆتایی سەدەی بیستین، خاوەن سەدەها هەزار شەهیدو بێ سەروشوێن و ئەنفال کراو و سەقت و پەککەوتوو و سەرگەردان و ئاوارەو کۆچکەرو وڵات وێرانین، **بۆ دەبێت فیدراڵیەت وەکو خۆمان بڕیارمان لە سەر داوە، لای براکانی عەرەبی باڵادەستی عێراق و دەسەڵاتی داگیرکەر، گونجاو نەبێت، یان هەنگاوێک بێت بۆ جیابوونەوە، وەکو بڵێیت جیابوونەوەی میللەتێک لە چوارچێوەی قەوارەیەکی بە زۆر لکێندراو تاوانێک بێت...!؟ بۆ دەبێت سڵ بکەین لە جیابوونەوەو سەربەخۆیی کوردستان...!؟**

نزیکەی یەک سەدەیە کێشەکەمان بەو شێوەیە گۆشەگیر کردووە، واتە پاشاکانی عێراق (١٩٢١-١٩٥٨) یان عبد الکریم قاسم (١٩٥٨-١٩٦٣) یان هەردوو عارفی برا (١٩٦٣-١٩٦٨)، یان بەکر و سەدام و حیزبی بەعسی بەدناو (١٩٦٨-٢٠٠٣)، تەنها بەرپرسیارن لەم غەدرە مێژوویەی کە بە سەرمان هاتووە، چەند ئەم لایەنانە تاوانبار بن و، چەند هەر ئەمانە ئەزێتی خەڵکی عێراقی غەیرە کوردیان دابێت بە تاک و بە کۆمەڵ، ئەوندەیش هێزە سیاسییەکانی عێراقی غەیرە کوردی و ناوەندەکانی دروست کردنی ڕای گشتی عەرەبی عێراقی باڵادەست و زۆرینە لەم ڕووەوە کەمتر نییە، لە نەگەیشتنی کورد بە مافی ڕەوای خۆی لە عێراق، **ناکرێت هەڵوێست و ڕۆڵی ئەم هێزانە لە پێگەیاندن و هاوکاری ئەو ڕژێمانە بۆ سەر حوکم، یان ڕۆڵیان لە پەروەردە کردن و گۆش کردنی زیاتر لە (٨٣) (موالید)ی خەڵکی عێراق وەلاوە بنێین.**

خۆ ئەمرۆ پاشاکان کە حاکمی عێراق بوون نزیکەی چل ساڵی سەدەی رابردوو، یان عبدالکریم قاسم و هەردوو عارفی برا، یان بەکر و سەدام و بەعسی خوێنرێژ، زیندوو نەبوونەتەوە سنگی کوردیان گرتووبێ و خاوەن دەسەڵات بن، ئەوانەی بەرامبەرمانن و کێشەی فیدراڵیەتمان لەگەڵدا باس دەکەن و مشتومڕمان لەگەڵ دەکەن و دواتر بڕیاری لەسەر ئەدەن ئەم بەڕێزانەن:

* د. احمد چەلەبی و رێکخراوەکەی (کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی) کە زۆر لە کادیرانی کوردن و بگرە لە سەرەتای دامەزراندنی ئەم رێکخراوەوە بە پشتیوانی لایەنە کوردییەکان بوو، ناوەندی چالاکیشی کوردستانی ئازاد بوو.
* سید عبد العزیز الحکیم و رێکخراوەکەی (المجلس الاعلی للثورة الاسلامیة في العراق).
* د. ایاد العلاوی و رێکخراوەکەی (الوفاق الوطني).
* حمید مجید موسی و حزبەکەی (الحزب الشیوعي العراقي).
* د. محسن عبدالحمید و حزبەکەی (الحزب الاسلامي العراقي).
* د. ابراهیم الجعفری و رێکخراوەکەی (حزب الدعوة الاسلامي).
* د. عدنان الپاچەچی و رێکخراوەکەی (تجمع الدیمقراطیین العراقیین).
* د. نصیر الچادرچي و رێکخراوەکەی (الحزب الوطني الدیمقراطي).
* چەند لایەن و کەسایەتیەکی تری عەرەبی عێراقی.

واتە هێزەکانی زۆرینەی عەرەبی باڵادەستی عێراق بە: **ئیسلامی و علمانی، بە شیعەو بە سوننەیشەوە. تاکو ئەمڕۆ ئامادە نین بڕیاری پەرلەمانی کوردستان لەمەڕ فیدراڵیەت و فیدراڵی کردنی عێراق بەو پێیە قەبوڵ بکەن.** تاکو ئێستا زۆرینەی ئەوانە، جگە لە فیدراڵیەتێکی ئیداری واتە (لامەرکەزی) چی تر قایل نابین بۆ کوردستان. سبەیش هەر زۆرینەی ئەم زۆرینەیەیە دەبێتە حاکمی فیعلی عێراق. جا ئەگەر ئەمانە ئەمڕۆ دان بە خواستی ئێمە نەنێن و رێز لە بڕیاری خەڵکی کوردستان نەگرن، ئەگەر سبەی ببنە خاوەن دەسەڵات دەبێت چۆن مامەڵەمان لەگەڵدا بکەن..!.

واتە رووبەروو کردنەوەو تەحمیل کردنی پرسی کورد لە کوردستانی عێراق و گرێدانی تەنها بە تاکی حاکم لە عێراق دوورە لە واقیعەوە.

لە میانەی سەدەی رابردوو نەمان دی عەرەبی باڵا دەست و زۆرینەی عێراق خۆپیشاندانێک، کۆڕو کۆبوونەوەیەک، ساز بکات بۆ پشتگیری لە داخوازییەکانی

خەڵکی کوردستان (جگە لە حیزبی شیوعی عێراقی) ئەویش لە هەل و قۆناغێکی تایبەتی.

ئەوە شەش مانگیشە پرسی فیدراڵیەت و خواستی کورد لە مەیدانە، نەمانبیست و نەمان بینی لایەنێکی عەرەبی عێراق چالاکییەکی جەماوەری یان رۆشنبیری وەها ساز بکەن، سەبارەت بە مافی کورد و پشتگیری لە بڕیارەکەی پەرلەمانی کوردستان بکەن لەمەڕ فیدراڵیەت.

بە کورتی زۆرینەی لایەنی عەرەبی عێراق فیدراڵیەت بە جیا بوونەوە (انفصال) لە وڵات لە قەڵەم ئەدەن، نەک دابەش کردنی دەسەڵات لە عێراقدا، بۆیە ئامادەبوونیان تێدا رەچاو ناکرێت سەبارەت بە عێراقێکی فیدراڵی. ئەوەیشی ئامادەیە تاکو ئێستا، لە چوارچێوەی دروشم یان (لامەرکەزیەکی ئیداری) روون تر لەسەر ئەساسی (پارێزگا) تێ ناپەڕێت بۆ ئەمڕۆ، دوارۆژیش مسۆگەر نییە.

موسیبەتی ئێمەی کورد تەنها ئەوە نییە کە لەسەرەوە باسمان کرد، بەڵکو هەر شان بەشانی ئەوە هەڵوێست و رۆڵی وڵاتانی ئیقلیمی دێتە گۆڕێ:

* دابەش کردنی نەتەوەی کورد لانی کەم بۆ چوار پارچەو لکاندنیان بە(تورکیاو ئێران و عێراق و سوریا)وە، وا دەکات دەستە وەستانی ئەو دەوڵەتە دراوسێیانە بەرامبەر هەر هەنگاوێک بۆ زامن کردنی مافی کورد لە کوردستانی عێراق، بە تایبەتی ئەگەر (فیدراڵیەت) بێت، نەک هەر زۆر ئەستەمە، بگرە کارێکی (مستحیل)ە. ئەگەر چی هەر چواریان هەمیشە لەمەڕ ماف و چارەسەر کردنی بنەڕەتی کێشەی کورد یەک هەڵوێستن، بەڵام لە هەموویان روون و(دۆغری)تر رژێمی تورکیایە، **تورکەکان هەمیشە دووپاتی ئەوەیان کردۆتەوە کە لە بنەڕەتدا (دۆزی) کورد لە هەر پارچەیەکی کوردستان دژی بەرژەوەندی نیشتمانییانەو، هەرگیز لە بەرامبەریدا دەستەپاچە ناوەستن. ئەم هەڵوێستە کەم یان زۆر تەعبیر لە بیرو بۆچوونی دەسەڵاتدارانی ئەو چوار وڵاتە دەکات.**
* فاکتەری جوگرافیای کوردستانی عێراق وای کردووە، ئەم هەرێمە بە وشکانی دەورە دراوەو، ناتوانێت پشت بە یارمەتی و پشتگیری هیچ لە دەوڵەتە هاوسێکانی ببەستێت، **بە دیدی ئێمە ئەم فاکتەرە وای کردووە، کە چارەسەر کردنی کێشەی کورد لە کوردستانی عێراق هەتاکو بەشێوەی یەکێتیەکی**

**نارەزوومەندانەو، لە چوارچێوەی عێراقێکی دیموکرات و فیدرالی زۆر ئەستەم بێت.** ئەوەی چاوەڕوان دەکرێت ئەوەیە کە ئەو دراوسێیانە لە نێوان خۆیاندا هەماهەنگی بکەن تاکو ڕێگە لە عێراق بگرن نەگاتە ڕێککەوتن لەبارەی شێوازی فیدرالییەوە لەگەڵ کورد، نەوەکا ببێتە پێشینەیەک بۆ کوردەکانی نێو دەوڵەتەکانی خۆیان، ئەمەیش بە دیدی ئەوان قابیلی فەرامۆش کردن نییە، بۆیە لەم بوارەدا هەمیشە لە کاردان و هاوکاری یەکتری دەکەن، بە پێچەوانەی هەموو ناکۆکییەکانیان. دەبێت ئەوەیش بێژین کە هەر یەک لەو وڵاتانە قوڵایییەکی ئیقلیمی و نێودەوڵەتیانیش هەیەو زلهێزەکانیش حیسابیان بۆ دەکەن. هەژ بەو چاوەیش دەبێت تەماشای کۆبوونەوەی وەزیرانی دەرەوەی وڵاتانی دراوسێ (ئێران، تورکیا، سوریا، میسر، سعودیەو ئوردن) بکرێت کە لە سەرەتای مانگی١١ی ٢٠٠٣دا کە لەدیمەشق بەسترا، بۆ باس کردنی باردۆخی عێراق بێ ئەوەی دەعەوەتی وەزیری دەرەوی عێراق بە شێوەیەکی پرۆتۆکۆلی و رەسمی بکرێت. زۆر لە چاودێران لەو باوەڕەدان: **ئەگەر وەزیری دەروەی عێراق کورد نەبوایە ئەوە دوور نەبوو وەکو جاران وەزیری دەرەوەی عێراق بە شێوەیەکی ئوسولی بۆ ئەو کۆبوونەوەیە دەعوەت دەکرا...!**

* وەکو لە سەرەتاشەوە ئاماژەمان بۆ کردووە، ئەمریکاو هاوپەیمانانی، وەکو هێزی داگیرکەرو دەسەڵاتدار، ڕۆڵێکی کاریگەرو چارەنووسسازیان هەیە لەمەڕ چۆنیەتی دارشتن و بونیادنانەوەی عێراق و چارەسەر کردنی کێشەی کوردو، بە تەحدید مەسەلەی (فەدرەلە) کردنی عێراق و خواستی رەوای کورد، بەڵام تاکو ئێستا هیچ هەنگاوێکی روون و تۆکمەیان نەناوە، بگرە ئیجرائات و هەڵسوکەوتی رۆژانەیان لە ناوچە جیاوازەکانی کوردستان جێگای نیگەرانیە. ئەم زلهێزانەو بە تایبەتی ئەمریکا، جاری یەکەم نییە بەکارمان دێن و پاشان بە هەرزان دەمانفرۆشن.

* جا ئەگەر رەوشەکە وایە :

بۆ دەبێت کورد ناچار بێت لە یەک قەوارەدا لەگەڵ عەرەبی عێراقی بالادەستدا بژێت...؟ زێدەڕۆیی نییە گەر بڵێین ئێمەو عەرەبی عێراق و ئەمریکاو هاوپەیمانانی ئەزانین کە:

١- پێشتر شتێکی وا نەبووە ئێمەی کورد ببەستێتەوە بە هاوسێ عەرەبەکانمانەوە، کە زۆرینەن لە عێراقدا. تاکە هۆکە پێکەوەی کۆی کردینەوە ئەوەیە کە وەختێک دەوڵەتی عێراق دامەزرێنرا کوردی باشووری کوردستانیان ناچار کرد لەو قەوارەدا بژی. کەچی تاکو ئێستا دوو وڵاتی عەرب کە (بە رەگەزو زبان و ئایین و مێژوو و کلتوور..هتد هاوبەشن) لە یەک قەوارەدا ناتوانن بژین، ئیدی بۆ دەبێت کورد ئیجبار بکرێت لە یەک قەوارەدا لەگەڵ عەرەبی عێراقدا بژێت بێ هیچ جۆرە زەماناتێکی نێودەوڵەتی و دەستووری و، بەو شێوەیە کە کوردی کوردستانی باشوور دەیخوازێت و بریاری لەسەر دەدا..

٢- ئامانجەکانی برای عەرەبمان لە چوارچێوەی عێراق راناوەستێت. نەتەوەپەرستەکانیان کۆششی یەکێتیەکی عەرەبانن لە (خلیج)وە بۆ (محیط). لای ئەمانە گەلی عێراق پارچەیەکی نەتەوەی عەرەبە و کوردستان بە خاکی عەرەبان دەزانن، هێشتا زۆرن ئەوانەی کە کوردیش بە عەرەب لە قەڵەم دەدەن.

٣- ئێمەی کوردیش ئامانجمان لەوان جوودایە. کوردین و کوردستانیش وڵاتی خۆمانەو پارچەیەکە لە کوردستانی گەورە. لەم قۆناغە بۆ ١٢ ساڵ ئەچێت کوردستانی ئازاد نیمچە سەربەخۆییەکی بە خۆیەوە بینیەوە ،ئەگەر رێگا بدرێت بە ریفراندۆمێکی ئازاد، بێ یەک و دوو کورد بریاری سەربەخۆیی ئەدات، هەرچەندە (فیدرالیەتی) ئیختیار کردووە لە چوارچێوەی عێراقێکی دیموکراتی بۆ ئەم قۆناغە. عێراق و عێراقیەکان پارچەیەکی خاک و نەتەوەی عەرەب نییە، بەڵکو عەرەبی عێراق و عێراقی عەرەبی دەکرێت وەکو پارچەیەک لە نەتەوە و خاکی عەرەب بژمێردرێت، هەرچۆن کورد و کوردستانی عێراق بەشێک و پارچەیەکە لە نەتەوەو لە خاکی کوردستان.

٤- بنچینەی نەژادیی و رەگەزی کوردو عەرەب لە یەک جوودان: یەک بنەماڵە (سلالە) کۆیان ناکاتەوە. کورد (ئاری نەژادە)و عەرەب (سامی).

٥- کورد و عەرەب زمانێکی هاوبەشیان نییە. زمانی هەر یەکمان لای ئەوی تر مەفهوم نییە. زمانی کوردی لە زمانە(هیندۆئەوروپییە)کانەوە هاتووە، لە کاتێکدا زمانی عەرەبی لە زمانە (سامییە)کانە.

٦- هەرچەندە هەردوولا (کوردی کوردستانی عێراق و عەرەبی عێراق) یەک ئایین پەیرەو دەکەن، وەلێ لەمەیش چون یەک نین، چونکە زۆرینەی عەرەبی عێراق شیعەن و کوردیشی سوننی مەزهەب.

٧- له دامەزراندنی عێراقەوەو بۆ ماوەی زیاتر له٨٣ ساڵ، واته تاکو نەمانی ڕژێمی (سەدام)، عەرەبی سوننە مەزهەب دەسەلاتدار بوونه له عێراق ، کەچی هاومەزهەبی کورد لەگەڵ عەرەبی سوننی مەزهەب نەبووە مایەی دان نان به مافی کورد بەو شێوەیەی که خواستی کوردە، ئەوەی به سەرمانیش هاتووە هەر به دەستی ئەم تاقمەوە بووە، که خاوەنی دەسەلات بوون له عێراق، ئێستایش زۆر له هێزە سیاسی و کۆمەلایەتییە سوننییەکانی عێراق به توندی و ڕاشکاوی دژی (فەدرەله) کردنی عێراقن.

٨- کوردو عەرەب مێژوویەکی هاوبەشیان نییە تا هەردوولایان پێکەوە یادی سەروەرییەکان و تێکشانەکانی ڕابردوو بکەنەوە. لەبەر ئەوەی هەردووکیان له کۆنترین گەلانی ناوچەکەن، جۆرەها پەیوەندی له نێوانیاندا دروست بووە، لەوانه شەڕو ئاشتی و بالادەستی و پاشکۆیەتی.

٩- ئێمەی کوردو عەرەبی بالادەست له عێراقدا یەک تێڕوانینی هاوبەشمان نییە سەبارەت به ڕووبەڕووبوونەوەی هەڕەشه هاوبەشەکان:

٩-١- عەرەبی (برامان) خولیای هەرە سەرەکییان: چەسپاندنی دەسەلاتێکی ڕەهای حکومەتێکی ناوەندی بۆ هەموو عێراق. کورد بەردەوام بەربەرەکانی ئەو بیرۆکەیەی عەرەبی(برای) بالادەستی کردووە، چونکه هەمیشه لەو جۆرە قەوارەدا بەش خوراو و کۆیلەو زەرەرمەند بووە.

٩-٢- کورد هەردەم خولیای هەرە سەرەکی ئەوە بووە : سەرکردەکانی عێراق (واته عەرەبی برای بالادەست) قەناعەت پێ بێنن به خواست و دیدو بۆچوونەکانی، ئەگەرنا ئەوە ناچاریان بکەن گوێیان لێ بگرن.

٩-٣- هەڵوێستی (برای) عەرەبی بالادەستمان لەمەڕ داخوازی کورد لەم سەردەمە، هەر وەکو پێشتر باسمان کرد تاکو ئێستا ڕوون نییە سەبارەت بەو (فیدراڵیەته) که پەرلەمانی کوردستان بڕیاری لەسەر داوە. هەروەها کێشەی ناوچە ئیدارییەکانی کوردستان که ڕژێمی پێشووی عێراق دابەشی کردۆته سەر پارێزگاکانی ناوەڕاست، یان کێشەی کۆتایی هێنان به سیاسەتی تەعریب و گەڕانەوەی کوردە ڕاگوێزراوەکانمان بۆ جێگای خۆیان و گەڕانەوەی عەرەبەکان بۆ ئەو جێیەی لێی هێنراون. به پێچەوانەوە ئەوەی (باش)ـەکەیانه ئەمڕۆ فیدراڵیەتی نەتەوایەتی و جوگرافی ڕەت

دەکەنەوەو (لا مەرکەزی) ئیداریمان بۆ پێشنیار دەکەن. وە مانەوەی تەعریبچییەکانیش بە مافی (المواطنة) پاساو دەدەنەوە..! و، بە داکۆکیمان لەسەر کوردستانیەتی کەرکوک و مخموور و خانەقین....هتد، یەکسەر بیر لە نەوتی ئەو ناوچانە دەکەنەوە وەکو بڵێیت نەوت حەرامە لە کورد ...! کوردستانیش (شمال) الـ(حبیب)ـە.

١٠- راستە ئەمڕۆ عێراق داگیر کراوەو حکومەتەکەی هەڵوەشاوەتەوەو، وا سەر لە نوێ هێزی داگیرکەرو هاوپەیمانانی سەرقاڵی دارشتنەوەین. لەمەیش ئێمەی کوردو برای عەرەبی باڵا دەستمان لەم داگیر کردنەو لەم دارشتنەوەیەشدا یەک دیدو یەک بۆچوونمان نییە: برای عەرەبمان لەم داگیرکردنەو لەم هەڵوەشاندنەوەی حکومەتی عێراقدا نە مەترسی کیانی هەیەو نە کێشەی یەکێتی وڵاتەکەی و، گرفتی داگیر کردنی عیراق و دامەزراندنی حکومەتەکەشی گرفتێکی کاتییە. واتە مەترسی نییە لە سەرلەنوێ دارشتنەوەی عێراق لەم بارەیەوە. چونکە هەردووکیان مسۆگەرن لە لایەن هێزی داگیرکەرو هاوپەیمانانی، هەروەها لەلایەن خودی سەرکردایەتی کوردیش. کەچی ئێمەی کورد هەم مەترسی کیانمان هەیەو هەم یەکێتی خاک و نیشتمانی کوردستانی عێراق، هەروەها ئێستاو دواڕۆژی هێزی داگیرکەرو هەڵوێستی لە دارشتنەوەی عێراق و حکومەتی ئایندەیش. چونکە ئەگەری پارچە پارچە بوونی کیانی ئەمڕۆی کوردستانی عیراق و پێک نەهاتنی یەکێتی خاکی کوردستانی عێراق لە ئارادەیە.

١١- لە بارەی ئابوورییەوە ئەولەویاتی هەردوولا وەک یەک نییە. لە کاتێکدا ئێمەی کورد داوای بەشی رەوای خۆمان لە سامانی کوردستان و لەبەرچاو گرتنی زیاتر لە نیو سەدەی شەڕ و کاول و وێران کردنی وڵاتەکەمان دەکەین. عەرەبی (برای) باڵادەست هێشتا پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە سامان هی سەرتاسەری نیشتمانە، دابەش کردنەکەی دەبێت (ناوەندی)بێت.

## پوختەکەی:

**ئەو هۆکـارانەی دەکرێ ببنە پاڵپـشت و هاندەر بۆ پێکەوە ژیان لە چوارچێـوەی یەک قەوارە لە نێوان کوردو عەرەبی دەسەڵات باڵا لە عێراقدا، بوونیان نییە. ئەوەی هەیە مێژوویەکی دوورو درێژی بێ بڕوایی و بێ متمـانەیی و خراپەکـاری و شەڕەو، هیچ ئارەزوویەکی راستەقینە لە ئاراد نـییە هانی ئێمەی کورد بدات خۆمـان گرێ دەین لە قەوارەیەکی پێکەوە ژیانی بەردەوام، هەتاکو ئەگەر ئەو قەوارە فیدراڵیش بێت.**

بڕیاری فـیـدراڵـیـەت بۆ ئەم قۆناغە بڕیاری پەرلەمـانە. سـاڵی ١٩٩٢ وەرگـیـراوە. وەرچەرخانێکی چارەنووسساز بوو. **کوردستانی ئازاد لە ژێر مەودای چەکی سووک و تۆپ و ڕۆکێتی کیمیاوی و بایەلۆجی سەدام حسێنی خوێنڕێژ بوو. هێشتا تۆزو تارمایی هەڵەبجە و ئەنفال و کـۆڕەوەکـە باڵی بەسـەر وڵاتەکـمـاندا راکـێـشـابوو. ژێرخانێکی دارماو و دوو ئابڵووقەی ئابووری. لایەنە سیاسییەکانی کوردستان یەک دیدو یەک هەڵوێست نەبوون لەمەڕ جۆری پەیوەندی لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەند. یەکەم جار بوو بە هۆی ئەو بڕیارەوە هەڵـوێستی زۆربەی هەرە زۆری لایەنە سیـاسییـەکانی کوردستـان لەسەر چارەنـووسی هەرێمی کوردسـتـانی عێـراق رێکخرا. ئێستاو ئەوسا دوو قـۆناغی جوودان. بۆیە (مـغـامـرە)یەکی زۆر سـامـناکـە ئەگـەر بێت و دەست بەرداری ئەو سـەربەسـتـیـیـانە بین کە لە پێناویاندا نرخـێکی گرانمان داوە، بەرامـبەر شتـێـک دڵـنـیـاین لەوەی کـە هێـشـتـا هەر وجـوودی نـیـیـە لە بیـرو بۆچـوونی (برای** عەرەبی عێراق)ی زۆرینەمان، یاخود شتێک تەنانەت ئەگەر بێتە دیش ئەوە دوور نییە بەردەوام نابێت، بە هۆی فاکتەرەکانی سەرەوە کە ئاماژەمان بۆ کرد.

خاڵێکی گرنگتر کە پێویستە بخرێتە روو ئەوەیە:

کە لە هەموو سیستەمێکی فـیدراڵیدا دەسەڵاتی بە هێز هەیە کە لانی کەم ئارامی و ئاسایش بۆ یەک لە بەشدارانی فـیدراڵیەکە دابین دەکات، ئەگەر هۆکارێکی گرنگ نەبێت بۆ دابین کردن و زامن کردنی ئەو (فیدراڵیەتە)، ئەمریکاو ئێرلەندییەکان لە خەباتیان دژی بەریتـانیا، فـەرەنساو ئەڵمانیـا و ئیـتـالیا بۆ کانتۆنەکانی فـەرەنسی و ئەڵمانی و ئیتـالی لە سویسرا، فەرەنسـییەکان بۆ کیوبیکەکان لە کەنەدا و ئەلبانیا بۆ کۆسۆڤۆییەکان، وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی بۆ بۆسنیا، پاکستان بۆ کشمیرییەکان، تورکـیـا بۆ تورکـەکـانی قـوبرس، عـەرەب بۆ ئەریتـرییـەکـان تاکـو دامـەزراندنی

دەوڵەتەکەیان لە حەبەشەی کۆن، عەرەب و فەلەستینییەکان، عەرەب و وڵاتانی ئیسلامی بۆ تەیموری شەرقی... هتد.

**بەڵام بەدبەختی ئێمەی کورد لەوەدایە کە، نەک هەر بێ پارێزگاری و بێ حیمایەین، بەڵکو گەمارۆ دراوین لەلایەن دراوسێکانمانەوە، ئەو دراوسێیانەیش دوژمنایەتی و بەربەرەکانیمان دەکەن، تاکو رادەی تەهدیدی دەستتێوەردان و سەرکوت کردنمان** و، بۆ ئەو مەبەستە لەگەڵ رژێمە یەک لە دوای یەکەکانی عێراقی رێککەوتننامەو پەیمانیان بەستبوو (پەیمانی سەعەد ئاباد-سنتو- پەیمانی بەغدا، رێککەوتننامەی الجزائر ٦/ئازاری/ ١٩٧٥، رێککەوتننامەکانی سنووری لە نێوانیاندا، کۆبوونەوە دەورییەکانی وەزیرانی دەرەوەی: (عێراق و ئێران و تورکیا و سوریا)، هەر لە سەرەتای هەڵبژاردنی پەرلەمانی کووردستان ساڵی (١٩٩٢)وەو، فشار و تەهدیداتی تورکیا (وەکو قسەکەرێک بە ناوی هەموویان) سەبارەت بە مافی کوردو فیدراڵیەت و ئاڵای کوردستان و تاکو بچووکترین مافێک لە مافەکانمان. وە هەر یەک لەم وڵاتانەیش ئیمتدادی خۆی هەیە لە قوڵایی عێراق و لەسەر سەتحی جیهانی.

بە دەر لەوانەی کە باسمان کرد هەر دەسەڵات و وڵاتێک بچووک یان گەورە، بە هێز یان لاواز، بە پێی بەرژەوەندی باڵای خۆی تێکەڵ بە کێشەکان دەبێت.

ئەزموونی رابردوومان هەر لە سەرەتای میرنشینەکانی سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ئال عوسمان و سەفەوییەکان و روسەکان، پاشان وڵاتانی هاوپەیمان لە سەردەمی شەڕی جیهانی یەکەم و دووەم، وڵاتانی ئیقلیمی و ئەمریکا لە دوای شەستەکانی سەدەی رابردوو، ئەو راستییەمانە بۆ دەخاتە روو کە:

**هیچ هێزێک، بە زلهێزو وڵاتانی ئیقلیمیەوە، ئامادە نەبوونە تاکو دوایی پشتگیری لە کورد بکەن، بە پێچەوانەوە کارتێکی فشار بووە، بە کاریان هێناوەو، لە کاتی گەیشتن بە مەرام، دەستیان لێ هەڵگرتووە.**

ئێستاش کوردستانی عێراق، رووداو و کارەساتەکانی پێشوو و، تەنگەژەی ئەمڕۆی دەسەڵات، وای کردووە هێشتا وڵاتەکەمان لە بازنەی دواکەوتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیدا بژێت، وەکو بەشێکیش لە عێراق کورد زۆرینە نییەو، هیچ ئاسۆیەک نییە، تاکو ئێستا، بۆ دەرچوون لەم قەوارەیە، تاکو ئەو رادەیەی دەسەڵاتدارانی کورد خۆشیان ئەسیرو گیرۆدەن.

**چی هێزێکی دەرەکی و خاوەن بەرژەوەند ئامادەیە لە پێناوی ٧-٨ ملیۆن کورد لە عێراقی زۆرینەی عەرەبی، حیساب بۆ سوود و بەرژەوەندی خۆی لە قولاییەک لە سنووری (٣٠٠) ملیۆن عەرەب و پانتاییەکی جوگرافی نزیکەی (١٤) ملیۆن کم٢ نەکات، ئەمە جگە لە قولاییەکی سیاسی و ئابووری هەرێمی و ئیقلیمی و نێودەولەتی عەرەبان.**

دوور دەبین لە واقع ئەگەر هەموو فاکتەرەکانی هاوکێشەکە بە چاکی نەبینین و نەینرخێنین لە کاتی خوێندنەوەی رووداوەکان و رێچکەی هەنگاوەکان.

بیرو باوەڕ و ئازادی و پرنسیپەکانی مرۆڤایەتی و مافی گەلان و دیموکراتیەتی و یەکسانی، زۆر جار خۆیان رانەگرتووە بەرامبەر بەرژەوەندییەکان، ئەگینا هەر هەمان پرنسیپ و ماف و بەڵێنەکان لە دێر زەمانەوە نووسراون و گوتراون و نەدراون و، لە مێژ زەمانەوە کورد زەحییەی غەدری مێژوو و جوگرافیا و بڕیاری هێزەکانی دەرەکییە، بە تایبەتی زلەکانیان.

**تەنها رووداوی گرنگ. هەڵوێست و ئیرادەی حەدی و حاسم و یەکگرتوو. بەرژەوەندی هێزی گەورەو بە تواناو بێ باک بە دەر دەبێت لەو (قاعیدە)یە....!**

ئا لێرەدا ئەهمیەت و رۆڵی ئەمریکاو هاوپەیمانان وەکو دەسەلاتی داگیرکەرو موقع و رۆڵی کورد لە هاوکاری و هاوبەشی لە رزگاری عێراق و تەنسیق و پشتیوانی بۆ چەسپاندنی بەرنامەکانیان دێتە پێشەوە، نەک تەنها بۆ مسۆگەر کردنی داخوازی کورد لە دامەزراندنەوەی عێراق، بەڵکو لە پشتگیری و پاراستنی لە هەر جۆرە پاشگەزبوونەوەو دەستتێوەردان و هەوڵی تێکدەرانی دەسەلاتی ناوەندی عێراق و ولاتانی دەوروبەرمان.

ئەوەی سەرنج رادەکێشێت، هەندێ لە کاربەدەستانی ئەمریکاو هاوپەیمانانی، هەمیشە ئاماژە بە ئەوە دەکەن، کە چیتر کورد تووشی کارەسات نابێت وەکو هەڵەبجە، مەبەستیش بە کارهێنانی چەکی کۆکوژە، **کەچی باسی داخوازییە چارەنووسسازەکانمان ناکەن جگە لە مافی هاووڵاتی و بنیادنانەوەی عێراقێکی دیموکراتی.** مەرج نییە لە سستەمێکی دیموکراتی لە عێراقی نوێ کێشەی مافی چارەنووسی کورد تەئمین بکرێت، بەو پێیەی کە کورد دەیخوازێت و بڕیاری لەسەر داوە، ئەگەر پێشوەخت حەسم نەکرێت.

رووداوەکـانی کـۆتایی سـەدەی رابردوو و، سـەرەتای ئەم سـەددیەو، شـەڕی کـوێت، وکۆڕەوە ملیۆنییەکەی خەڵکی کوردستانی عێراق و، هێڵی ئارام لە ساڵی ۱۹۹۱، کـێشـەکانی یوگسـلافـیای کـۆن و ئەو چەند نـەتەوانەی کە جـیابوونەوەو، دەوڵەتی سـەربەخۆی خـۆیان جارِ داو، کارەسـاتی ۱۱/ئەیلوول/ سـاڵی ۲۰۰۱ی ئەمـریکا، شەڕی ئەمریکا و هاوپەیمانانی دژی تالیبان لە ئەفغانسـتان و، دواتر هێرشیان دژی نیـزامی سـەدامی هەڵهـاتوو و لە ناوبردنی ئەو دوو رژێمە و رزگـار کـردنی هەردوو وڵات و، پاشان داگیر کردنی عێراق، ئەمانە هەر هەموو بەڵگەنە بۆ بەرپەرچ کردنی ئەو بیـرو بۆچوونانەی کـە دەڵێت (مـافی گـەلانی هەر وڵاتێک و گـیروگرفـتەکـانی، کارێکی ناوخۆییە لە چوارچێوەی یاسای ناوخۆ چارەسەر دەکرێت).
بۆیە لە کـاتی تەنگژەی نێـوان کـوردو بەرامـبـەرەکـانی لەسـەر بڕیاری چارەنووسی خەڵکی کوردسـتـان، چی کێشـەو گرفت نەماوە بۆ هاوکـاری و یارمـەتی دانی کـورد لەلایەن ئەمـریکا و هاوپەیمانانی و زامن کـردنی مـافـەکـانی لەلایەن کـۆمـەڵگەی نێودەوڵەتی و رێکخراوە پەیوەندارەکانیەوە.

بە پشت بەستن بە رووداوەکـان و ئەوەی لە ئارادایە، سـەرکـردایەتی کـورد بەرامـبـەر دوو (خیار)ـە:

١- بە کار هێنانی هەمـوو هێزو توانایەکی دیپلۆماسی و جەماوەری و نێودەوڵەتی بۆ فـشـار خسـتنەسەر ئەمریکاو هاوپەیمانانی، کـە بە حـوکـمی دەسـەڵاتیـان لە عـێراق و پرنسـیـپـەکانی جارنامـەی (وێلسن)و (بۆش)و بنەماکـانی پەیمان و رێککەوتننامـەکـانی نێـودەوڵـەتی، **مـافی کـورد تـەسـبـیت و زامن بکرێت بەو شێوەیەی کە کورد بڕیاری لەسەر دەدات بە سەربەخۆیی کوردستانیشەوە.**

٢- ئەگەر کورد لە دامەزراندنەوەی عێراق مافەکانی مسۆگەرو زامن نەکرا، بەو پێیەی کە گەلی کورد لە کوردستانی عێراق بڕیاری کۆتایی لەسەر داوەو، پێش کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکاو هاوپەیمانانی، **کوردسـتـانی عێـراق بەسنووری سـروشـتی خـۆی بخـرێتـە ژێر (وصـایە)ی ئەمـریکا یان کـارگـێـڕی سـیـاسی دەستـەیەکی نێودەوڵەتی بە سەرۆکایەتی ئەمریکا**، ئەو کـات بە پێی یاسـای نێودەوڵەتی (القانون الدولی) ئیدارەی کوردستان بەڕێوەدەچێت، لەم بارەیەوە هەرێمی کـوردسـتـان نەک هەر تەنهـا بوونێکی رەواو (شەرعی) دەبێت، بەڵکو

ئارامییەکی رامیاری بۆ خۆی و بۆ عێراق و ناوچەکە سەقامگیر دەکا، کە دەبێتە کلیلی چارەسەر کردنی بنەڕەتی گیروگرفتی کوردو عێراق، بۆ ئەمەیش دەبێت زەمینە خۆش بکرێت بۆ ریفراندۆمێکی ئازادو لە ژێر چاودێری ئەمریکا یان هەیئەتێکی نێودەولەتی، بە سەرۆکایەتی ئەمریکا، بۆ ئەوەی کورد خۆی بڕیاری کۆتایی لە چارەنووسی خۆی بدات و، ئەم هەنگاوە ببێتە سەرەتای قۆناغێکی نوێ لە پێکەوە ژیان و دیموکراتی و ئازادی و ئاشتی لە عێراق و لە ناوچەکەیش.

کورد لە ١٢ ساڵی رابردوو هەلی باشی لەدەست داوە. لەم ١٢ ساڵەدا زیاتر لە (٣٥) نەتەوەی جیا جیا لە جیهان ئازاد بوون لە پێکەوە ژیانی بێ ئارەزوو و، (٣٥) ولاتی تازە لە دایکبوون و، بوونە ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان، کەچی ئێمەی کورد هێشتا دەپاڕێینەوە بۆ ئەوەی باوەڕمان پێ بکەن کە جوداخواز نین و عێراقییەکی (قح)ین و، واز لەو نیمچە سەربەخۆیی و ئازادییەی خۆمان دێنین لە پێناوی مەحکەم کردنی یەکێتی عێراق.

**چەند هۆکارەکانی دەرەکی کاریگەر بوون بۆ لە دەستدانی هەلەکان، ئەوەندەیش ململانێی شەڕی ناوخۆ. نە عیبرەت و نە سوودمان وەرگرتووە لە دووبەرەکییەکانی رابردوو و، سەرنەکەوتنمان لە گەمە ئیقلیمی و نێودەولەتییەکان و نە لە رووداوەکان، بە تایبەتی:**

تەنگژەی رژێمی سەدام لە شەڕی عێراق و ئێران (١٩٨٠-١٩٨٨)و، شەڕی کوێت (١٩٩٠-١٩٩١)و، کارەساتەکانی هەڵەبجەو ئەنفال (١٩٨٨)و، کۆڕەوە ملیۆنییەکەی خەڵکی کوردستان لە بەهاری و١٩٩١، هێڵی ئارام و هێزی نێودەولەتی بۆ پاراستنمان ساڵی ١٩٩١، وەکو دیاردەیەکی بێ هاوتا لە مێژووی رامیاری نێودەولەتی لە کۆتایی سەدەی رابردوو و سەرەتای ئەم سەدەیەو، گەمارۆی ئابووری و سیاسی و گۆشەگیری رژێمی سەدامی نەفرەت لێ کراو و، بە هەند وەرنەگرتنی دەسەلاتی خۆماڵی و لاواز و سووک کردنی ئەزموونەکەمان و، بەشداریمان لە پرۆسەی رزگاری عێراق لەگەڵ ئەمریکاو هاوپەیمانانی و هاوکاریکردنی داگیرکەر لە ئیدارەی عێراق، بێ هیچ بەڵێنێکی رەسمی و زەمانەتێک و، دابەش کردنی کوردستانی ئازادو دامەزراندنی دوو ناوەندی بڕیارو دوو حکومەت لە پێناوی دەسکەوتی تایبەتی و لایەنگیری سیاسی و حزبی

(هەرچەندە پارتی و ینک و لایەنەکان یەک هەڵوێستن لەسەر فیدراڵیەت بۆ واقعی ئەمڕۆی کوردستان)، بەڵام ئەو هەڵوێستە نە زەمانەتیشە بۆ تەسبیت کردنی ئەو داخوازییە و نە خاڵێکی بە هێزە لە حیوارو گفتوگۆی لایەنی کوردی. بۆیە:
* یەکخستنی هەردوو ئیدارەی کوردستان و پێکهێنانی یەک حکومەتی ئیئتلافی بە هێزو بە دەسەڵات و یەکگرتوو و، بە بەرنامەیەکی تۆکمەو موحەدد بۆ ئەم قۆناغە، پێویستییەکی مێژووییە.
* تەفعیل کردنی پەرلەمانی کوردستان وەکو تەنها دەزگای شەرعیەت لە کوردستانی ئازاد.
* گرێدانی هەموو مەڵبەندەکانی بڕیارو کەناڵەکانی پەیوەندی بەم دوو دەزگایەوە، (پەرلەمان و حکومەت).
* ریفراندۆمێک لە کوردستانی ئازاد بکرێت بە ناوچە لێ براوەکانیشیەوە، ئەگەر هێزی داگیرکەر کۆسپ بوو، بە شێوەو شێوازی دیموکراسی و ئارام لە رێگای دەزگاکانی شەرعیەت و بە پشتیوانی جەماوەری کوردستان چارەسەر بکرێت.
* دەستنیشان کردنی ناوەندێکی نەتەوایەتی کوردستانی، وەکو هەیئەتێکی لێکۆڵینەوەو بە دواداچوونەوە بۆ دیراسەت کردنی چارەنووسی هەرێمی کوردستان و ئەو پرسانەی کە پەیوەندییان هەیە بەو کێشەیەوە. هەیئەتەکە لە پسپۆڕانی ئەو مەیدانە لە کورد و لە غەیرە کورد پێک بێت.

هەست کردن بە بێ کەسی و پشت بەستن بە هێزی دەرەکی، چی ئیقلیمی بێت یان دەولی و، خۆبەستنەوە بە قسەی سەر زارەکی و دروشمی بێ ناوەڕۆک و،گرێی برابچووکی و، گۆشەگیری بارودۆخی جیۆپۆلەتیکی کوردستانی عێراق و، زل کردنی فیشاری وڵاتانی ئیقلیمی (تورکیاو ئێران و سوریا)، سوودی نییە. **کورد لە کوردستانی عێراق وەکو گەل، وەکو کیان و، ئەزموون کارتێکی کاریگەری ئەمڕۆ و ئایندەی عێراقە. (واقیع)ێکەو هەیە. دیاردەیەکی بێ هاوتای غەدری مێژوو و جوگرافیایە.**
لە ماوەی ئەم ١٢ ساڵەو، لەو (٣٥) نەتەوانەی کە رزگار بوون و بوونە ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان، بارودۆخی دەرەکی زۆریان لە ئێمە خراپتر بوو، تەزحیەت و کارەساتیان بەراورد ناکرێت لەگەڵ زەرەرو زیانی ئێمەی کوردو، هەلە

هەڵکەوتووەکانیشیان لەوانەی ئێمە باشتر نەبوو، کەچی ئەوان سەرکەوتن و ئێمەیش هەر دەپاڕێینەوە..!
**ئەزموونی زیاتر لە ٨٣ ساڵی (عێراق)ی داتاشراو ئەو راستییە بەرجەستە دەکات کە کیانێکی بە زۆر لکێندراو و، دەسەڵاتێکی ناوەندی رەهای یەک رەگەزو یەک مەزهەب لە کۆمەڵگایەکی فرە رەگەزی و ئایینی و مەزهەبی، لە غەیری لاوازی و کوشتن و ماڵ وێرانی و نائارامی و لەدەستدانی سەروەت و سامان و پێشێل کردنی مافەکانی مرۆڤ و گەلان و داگیرکردن، چی تری پێوە نایەت، واتە یەکێتییەکی ناتارەزوومەندانەی عێراق (سەراب)ێک بوو.**
واقعی عێراقی بە زۆر لکێندراوی زیاتر لە ٨٣ ساڵ، ئەوە دەگەیەنێت کە یەکێتی خاکەکەی بە هۆی لە یەک نەچوونی نەتەوایەتی و ئایینی و مەزهەبی هەمیشە لە ئاژاوە و قەیرانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و دەروونی دەخولێتەوە.
دەرچوون لەم تەنگژەیە بە خودی عێراق و گەلانی و، بۆ ناوچەکەو جیهانیش، **تەنها راستکردنەوەی هەڵەکانی مێژووە، کە سەرەتاو بناغەکەی لە بریارو رۆژی دامەزراندنی ئەم عێراقەوە دەستی پێکردووە.** پاش ئەم سەفەرە دوورو درێژە بە هەموو نسکۆ و کارەساتەکانی و لەم زەلکاوەی ئەمڕۆ، مافی خۆمانەو کاتی ئەوەیش هاتووە بڕیاری چارەنووسی خۆمان بدەین و بەو پێیەی کە بەرژەوەندی کوردی تێدا بێت و لە پێناوی ئەویشدا بێت.
چونکە دەبێت:
لەوە تێبگەین کە نە زلهێزەکان و نە رێکخراوە نێودەوڵەتییەکان و نە دۆستەکانمان (ئەگەر هەبن) بە دەر لە بەرژەوەندی باڵای خۆیان، ئەوەندە بە پەرۆشی ئەرک بە ئەستۆی خۆگرتن نابن لەم ناوچەیە.
بەرژەوەندی ئەوانیش لەوەدایە ئێمە وەکو هێزو وەکو کێشە، تاکو بکرێت بێدەنگ بین و گرفتیان بۆ دروست نەکەین، پاروەکەیان بە ئیسراحەت قووت بدەن و بە کەمترین (ئیلتزام) بۆی دەرچن، با ئەمانە هەر هەمووی لەسەر حیسابی میللەتەکەمانیش بێت.
کاتی ئەوەیە کورد بە هەموو هێز و باڵەکان و ناوەندەکانی بڕیار، خۆیان یەک خەن و، سوور بن لەسەر مافەکانیان، ئەگەر رێک نەبن لەسەر داخوازی و پێویستیان بە رۆڵی لایەنی هاوپەیمانان بە سەرۆکایەتی ئەمریکا، بە مانەوەو بوونیان، ئەمڕۆ و

دوارۆژ، له کوردستان، تاکو رادەی ناچارکردنیان به زیاتر ئیلتزام و بەرپرسیارەتیان له چەسپاندنی مافەکانمان و زامن کردنیان له دوارۆژیش، ئەوە هەر وەکو جارانی پێشوو دەمانگۆڕنەوەو، له کاتی پێویست دەڕۆن و پشتمان تێ ئەکەن.
ئەمە هەلێکە نابێت دوودڵی و کوردە ناموسەی بۆ بکرێت. هەموو دونیا بە کارەساتەکانامان ئاشنایەو، روویان له عێراقە: چی ئەبێت و چۆن ئەبێت.
سفرەی رازاوەو باوەشی گەرم و دۆشەکی نەرم وچەمانەوە بۆ نوێنەرانی هێزی داگیرکەر کاریگەری نابێت لەسەر بڕیاری پرۆسەی ئەوان و دادی چارەسەر کردنی کێشەکەمان نادات. بۆیە:
ئێستاو هەر ئێستا کاتی ئەوەیە کە بە راشکاوی و بە هەموو توانایەکمانەوە داوای مافی خۆمان بکەین وبیخەینە روو و، دونیای لێ ئاگادار کەین. کە ئەم هەلە بە سەرچوو، پەشیمانی سوودی نییە..!

۲۰۰۳/۱۱/۲۰

---

تێ بینی:
ئەم با بەتە بە چوار بەش لە روژنامەی ( خەبات ) ژمارە - ۱۳۳۹، ۱۳٤۰، ۱۳٤۱، ۱۳٤۲ - بلاوکرایەوە .

## بەشی دووەم

# کوردو هاوپەیمانیەتی ئەمریکا بۆ کوێ..؟!

«من بەڵێنم داوە ئامادەم بەسەر بەرزی بژیم
گەر سەرم بڕوا لە ڕێدا قەت لە ژێر پێ ناکەوم»
«عەونی»

پاش ڕێککەوتننامەی ١٥/١١/٢٠٠٣*، لە نێوان دەسەلاتی مەدەنی ئەمریکی و ئەنجومەنی کاتی دەسەلات، سەبارەت بە گەڕانەوەی دەسەلات لە مانگی حوزەیرانی ئەم ساڵ بۆ عێراقیەکان (ئەنجوومەنی کاتی)و، تەسبیت کردنی پرنسیپی فیدراڵیەت لە سەر ئەساسی (پارێزگاکان)و، ڕەتکردنەوەی ئەو پرنسیپە لەلایەن خەڵکی کوردستانەوە بە گشتی، چەند ڕۆشنبیری عەربی دۆست و نزیکمان و هەندێ دۆستی ئەوروپی و ئەمریکیمان، لە هەمان کاتدا، زنجیرە وتارو لێکۆڵینەوەیەکیان بلاو کردەوە ، و(هێشتایش بەردەوامە)، تێیدا جەخت لە سەر چاکەی ئەمریکا دەکەن بەرامبەر بە کوردو، ئەو بابەتەیان کردۆتە وێردی سەر زبانیان، تاکو ئەو ڕادەیە یەکێکی وەکو ( ولیم سافیر)ی ئەمریکی، کە یەک لە دۆستە دێرینەکانی کوردە، وەکو ڕۆژنامەوان و نووسەرو، ئاگادار ونزیکی مەڵبەندی بڕیاری ئەمریکاو، کەناڵێکی باوەڕ پێ کراوی هەردوولایە. ڕۆژی ٢١/١/٢٠٠٤ لە ڕۆژنامەی (الشرق الأوسط)ی لەندەنی وتارێکی بلاوکردبووەوە لە ژێر ناونیشانی (حتى لا يضيع الاكراد في وحل الماضي والحاضر) .نووسەر ئەگەر چی لەو وتارەدا دوو گازندەی هەبوو لە ئەمریکا (هەڵوێستیان لە ١٩٧٥ و ١٩٩١ بەرامبەر بە کورد)، بەلام دووجار وسێ جار کوردی منەت بار کردووە سەبارەت بە لوتفی ئەمریکا (پاراستنی هێڵی ئارام ورماندنی صدام....هتد) ئامانجی نووسەر لەو نووسینە و ئەو بە چاودانەوەی (دوو لوتفەکەی ئەمریکا) بە زەقی ئەو بوو کە :

( دەبێت کورد فیدراڵیەتی پارێزگاکان پەسند بکات ...!)

دۆستێکی دیکەمان بەڕێز ( صالح قلاب)ە، وەزیری ڕۆشنبیری پێشوتری ئوردن و ڕۆژنامەنووسی ناسراوی عەربی، هەر پاش بابەتەکەی کاکە (ولیەم) بە (٣) ڕۆژ و لەهەمان ڕۆژنامەی (الشرق الاوسط)ی لەندەنی ژمارەی ڕۆژی ٢٤/١/٢٠٠٤ وتارێکی بلاوکردوەتەوەو، زۆر شت بە ڕەوا دەبینێت بۆ کوردی کوردستانی عێراق، بەلام (ئاخ لە بەلامی دۆستانی کورد): لەم سات وکاتە کەی کاتی ( فیدراڵیەتە ...! )

کاکە ( سافیر) بە(BUT)، کاکە( قلاب )یش بە( لکن ) چ باشیان فەرمووده کردبوو دەیسڕنەوە . (بات) و(بەلام) ی خۆماڵیمانیش زۆرەو، دوور نییە لەوەی ئەو دوو زاتە و ئەمسالیان زۆرتر بێت.

* بڕوانە دەقی ڕێککەوتننامەکە لە پاشکۆی ژمارە «٤» - ل ٢٣٠

واته ئەمریکای پیاو چاک و رزگاریکەرو دووربین و، کوردی سفلەو بەلەزو کورتبین و ناشارستانیەتی خێڵەکی. بێ ئەوەی هەندێ وردبنەوە لە مەوقیع و رۆڵ و ئیستراتیجیەتی ئەمریکا و ئێمەی کورد و کارەسات هەل و هێڤی و داخوازیەکانمان... هتد
هەموو لایەک، ئەگەر بە مەوزوعیەتەوە کێشەکان هەڵسەنگێنن دەردەکەوێت:
* ئەمریکا و هاوپەیمانانی لە بەرچاوی رەشی کورد و عێراقییەکان بریاری گەمارۆ و ئابلۆوقەو لاواز کردن و لێدان و پاشان رمانی رژێمی سەدامیان نەدابوو.
* لاواز و رمانی صەدام و رژێمەکەی چەند لە بەرژەوەندی بالآی میللەتانی عێراق و ناوچەکدا بوو، زیاتریش لەخزمەت و بەرژەوەندی ئەمریکاو یارانی دایە.
* بۆ ئێمەی کورد وەرچەرخانێکی مێژوویی بوو و، نزیکەی یەک سەدە چاوەڕوان و شەیدای بووین، گۆرینی هەڵوێستی ئەمریکا لە هێزێکی (رزگار )کەر بە (داگیر)کەر، بایەخی تایبەتمەندی دیکەی بەو وەرچەرخانە دا. **کاکلەکەی :**
* **کە ئەمریکا بە رەسمی و بە بریارێکی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی ئەرکی بەرێوەبردنی عێراقی پێ سپێردرا، وەکو هێزو دەسەلآتی داگیرکەر، زنجیرەیەکی دوورو درێژی ئیلتیزاماتی بەرامبەر بە گەلانی عێراقی کەوتە ئەستۆ، بە پێی رێککەوتن و پەیمانە نێودەوڵەتییەکان، دەبێت ئەمریکا لەو ماوەیەدا، کە دەسەلآتی داگیرکردنی پێ سپێردراوە رەچاو و پیادەیان بکات و، ناوەرۆکی ئەو رێککەوتن و پەیمانانە، زۆر لە مافەکانمان زامن دەکات بە مافی (چارەنووسەوە). ئەهمیەتی ئەم لایەنەی وەرچەرخانەکە لە پرۆسەی رزگاری عێراق، ئەگەر زۆرتر نەبێت بۆ ئێمەی کورد قەت کەمتر نییە.**
* کوردیش بە رێزو حورمەتەوە سیاسەتی ئەمریکا و هەنگاوەکانی لەمەڕ رزگاری عێراق نرخاندو، سوپاسگوزاری خۆی بە راشکاوی راگەیاند، لە رمانی دیکتاتۆریەتی سەدام و نیزامەکەی و، دابین کردنی ئارامی وهەوڵ دان بۆ زامن کردنی ژیانی خەڵک و چاککردنی باری ئابووریان و ئاوەدان کردنەوەو سەرەتاکانی بە دیموکراتی کردنی عێراق و، **پێشتریش خەڵکی کوردستان، بریاری تەسبیت کردنی هێڵی ئارام و پاراستنی ناوچەکەمان لە هێرشی سوپای عێراق، بە ئەوپەری رێزو حورمەتەوە نرخێندرا. هەر ئەمەش بووە فاکتەرێکی کاریگەر و زەمینە خۆشکەر، کە کورد هەندێ لە تاوانەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانی لە بیر**

**بکات و، سوپای ئەمریکی گولباران کات و بە خاک و هێز و ئیمکانیەتی خۆیەوە لە پێشوازی و لە خزمەتی دا بن..!**

* ئەم راستیانە هەر چۆن لای ئێمە مەعلوومە و تەعبیر بووە لە خواست و ویژدانی تاکی کوردو میللەتەکمان، کاربەدەستانی ئیدارەی دەسەلاتی مەدنی و سوپای ئەمریکی لە عێراق بگرە گەلی ئەمریکاو دوستانیشی پێی دەزانن . هەر ئەم پێزانین و وەفاداریەی کورد لە نواندی رەزامەندی و خۆشحالی بە رۆلی ئەمریکا لە پرۆسەی ئازاد کردنی عێراق، **وای کرد ئەم رۆل و هەلویستەی کورد ، ببێتە مایەی گلەیی و گازندەی توێژەیکی فراوانی عەربی عێراق و جادەی عەرەبی، هەروەها نیگەرانی ولاتانی دەرواسێشی وروژاندووە.**

ئەمەیش خۆی لە خۆیدا و لە پرۆسەیەکی وەهادا و لە هەلومەرجی کورد لە کوردستانی عێراق (ناوخۆ و ئیقلیمی) و، مێژووی پڕ لە کارەسات و هەرزان فرۆشیمان، لە لایەن زل هێزەکانەوە بە ئەمریکاو بەریتانیاوە، دەبوایە بە هەند وەبگیردرایە، بە تایبەتی **نە پێش و نە لەکات و نە لە پاش رزگاری عێراق ئەمریکا هیچ بەلێنێکی فەرمی نەداوە بە کورد سەبارەت بە دوا رۆژی..!**

ئەم دیدو بۆچوونانەی دۆستانی ئەمریکی و عەربی (برامان) و بگرە هەندێ لە (مووتە ئەمریکییەکانی) خۆمالیشمان، زیاد لە لزووم منەت بارمان دەکەن تاکو ئەو رادەیە رۆلی ئەم زل هێزە لەو غەدرە مێژووییەی کە بە درێژایی سەدەی رابردوو بەسەرمانیان هێنا لە بیر بکەین، **هەر ئەم منەتبارییە پاساوێک بێت لە خۆ دزینەوەی ئەمریکا و یاوەرانی لە رۆل و مەسئولییەتیان لە دابین و مسۆگەر و زامن کردنی مافە رەواکانمان و، سووک کردنەوەی باری گرانی ئەو غەدرەی، کە بە درێژایی مێژووی ئەم ولاتە کە پێی ئێژن عێراق لە کوردیان کردووە ..**

**راستە ئەمریکا:**

* هێلی ئارامی بۆ هەندێ ناوچەی کوردستانی عێراق زامن کرد (لە سنووری ٤٠٪ رووبەری کوردستان و نیوەی ژمارەی هاوولاتیانی کە دەکەوێتە سەرووی هێلی پانی ٣٦)و، هێزەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانانی ئاسمانی ئەو ناوچەیەیان دەپاراست لە هێرشی رژێمی سەدام. کوردیش درێغی نەکرد. بە پێچەوانەی

هەمـوو تەوەقـعـات و كـۆسـپـەكـان، **توانى ئەزمـوونێـكى ديموكـراسى كـەم‌وێنە لە مێژووى عێراق و ناوچەكە بەرپا بكات، كە ئەمريكا و هاوپەيمانانى شانازى پێوە بكەن لە كاتى بەراوردكردن و پاساودانى بريار و كردەوكانيـان دژ بە سەدام تاكوو رمانى.**

* لە هەمـووشى گـرنگتـر ئەو (ناوچە ئارام)ـە بوو، كـە هەر لە سـەرەتاى پرۆسـەى (رزگـارى) عـێـراق، بۆ ئەمـريكاو هاوپەيمانانى بووە پايگە و بنكەى يەكـەمى هێـزەكـانى، لە رووى (عـەمـەليـاتى) و هاوكـارى و تەنسـيق و، لە كـەش و هەوايەكى دۆسـتـايەتى و هاوكـارى و هاسـانكارى ئەركـە سـەربازى و لۆجيستييەكانيان لەلايەن ئيدارە و هێزى پێشمەرگەى كوردستانەوە، ئەوەى زياتر بايەخى بە رۆڵى ناوچەى ئارام و رۆڵى كـورد لە پرۆسـەى ئازاد و رزگـار كـردنى عـێـراقدا ئەوە بوو كـە: **ئەم (ناوچە ئارام)ـە بۆ چەند سـاڵ ئەچوو، بە تايبـەتى لە قـۆناغـى پێش پرۆسەى (رزگـارى) عـێـراق گـمارۆ درابوو، بە زياتر لە٧٥٪ى گـشت سـوپاى عـێـراقى نيـزامى، جگـە لە سـەدەها هەزار لە جـەيش شەعبى و فيدايى سەدام و جەيشى قودس. ئەم هێزە نيزاميەى سوپاى عێراق كە بە درێژايى هێڵى تەماس جێگير ببوو و پاراستنى شارى مووسڵ و كەركوك و تكريت و ديالەى لە ئەستۆ بوو، وەكو پشتـوێنێكيش بۆ پاراستنى شارى بەغدا لە باكـورەوە بە تايبـەتى، واتە (٣) لەسەر (٤)ى سـوپاى عـێراق. كە پرۆسـەى رزگارى و ئازاد كردنى عێراق دستى پێ كرد و بە هۆى ئەو ( ناوچەى ئارام)ـە و هاوكارى سياسى و عەسكەرى و جەماوەرى كوردستانى ئازاد، لە ماوەى چەند رۆژێكدا و بێ شەڕ و پێكدادان ناوچەكـانى پشت هێڵى ئارام، بە شـارەكـانى (مـووسـل وكـەركوك و تـكريت و ديالەشـەوە) ئازاد كرا، بێ زيانێكى گيـانى لە نێو سەربازەكانى ئەمريكا. زۆربەى زۆرى سوپاو مـيليشياكەى سەدام، لە رێگاى كەناڵەكانى لايەنە سياسيـەكانى كـوردستـانەوە يان تەسليم بوون يان چوونەوە ماڵى خۆيان، كەچى بۆ كـەمتـر لە (٢٥ ٪) باقى سوپاى عێراق، لە ناوەڕاست و لە خـوارووى عـێـراق، سـوپاى ئەمريكاو هاوپەيـانان مۆدێرنترين و خەترناكـترين چەكيـان بە كـار هێنـاو، لەسنـوورى زياتر لە (٣) هەفـتـەى خاياند تاكـو گـەيشـتنە بەغـداو، لە نێـوان هەردوولا زيانێكى زۆرى گيـانى و مـادى لێ كـەوتەوە ئەگـەر چى زيانى لايەنى عێراقى بەراورد ناكرێت.**

* سەرەڕای ئەوانەی سەرەوەش، ئەم ناوچە (ئارام)ـە بە هۆی بنیادنانەوەی باری سیاسی و ئابووری و ئاوەدانکردنەوەی، کە لە ماوەی (١١) ساڵی رابردوو ئەنجام درابوو، هۆکارێکی گەورەو کاریگەر بوو، وەکو ناوچەیەکی ئارام و هێمن و ئامادە باش بۆ حەوانەوەو لە باوەش گرتنی هێزەکانی ئەمریکاو هاوپەیمانانی، نەک تەنها بۆ رێکخستنەوەو تەنسیق و سەرەتایەکی موناسب بۆ جموجوڵی سوپایی و سیخوری و سیاسی مەیدانی دژی رژێمی سەدام، بەڵکو بۆ حەسانەوەی سەربازەکانیان، لە کاتێکدا ئەمریکا و هاوپەیمانانیان لە خواروو و ناوەڕاستی عێراق ئەو کات و تاکو ئێستاش رۆژانە رووبەرووی شەڕ و **پێکدادان و بەرخودان و کاری تیرۆریستی دەبن. ئەو کات و تاکو ئێستاش رۆژانە سەرباز و کارمەندانی سەر بە ئەمریکا و هاوپەیمانانیان لەو ناوچانە گیان لە دەست ئەدەن و دەکوژرێن و تەرمەکانیان دەنێردرێتەوە جێگای خۆیان، جگە لە سەقەت و بریندارو، باری نالەباری دەروونییان.**

* ئەوەی ئەمریکا و هاوپەیمانانی ئەنجامیان دابوو پێش هاتنیان بۆ کوردستان، چ بۆ پاراستنی هێڵی ئارام، یان ناراستەوخۆ و لە رێگای رێکخراوە نێودەوڵەتی ومرۆییەکانەوە، بەرهەمەکەی ئەزموونێکی دیموکراتی و ئیدارەیەکی سەربەخۆی فرەلایەن و، زیاد لەوەش هەر ئەو ناوچەیە وا ئەمڕۆ پانتاییەکی پان و بەرین و ئارام و ئامادەباش و پێگەیشتوو بۆ هێزەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانان پێک دێنێت **کە زیاتر لە چوار جار لە پانتایی(لبنان) گەورەترەو، ئیدارەکەی و زۆربەی هەرە زۆری خەڵکەکەی و راگەیاندنی کوردستان بە تێکرا لە خزمەتی پرۆسەی رزگاری عێراقدا بوو.** واتە ئەوەی ئەمریکا و وڵاتانی دیکە هەوڵیان بۆ داو کاریان بۆ ئەم (ناوچە ئارام)ـە کردبوو بە فیرۆ نەچوو. **ئەوەی (چاندیان) زۆر بە خێر و بێر گەڕایەوە بۆیان.**

**زیادە رۆیی و ناواقیعییانە نییە ئەگەر هاتوو بڵێین مافی کوردە، لەم بوارەدا ئەمریکاو هاوکارانی منەت بار بکات،** ئەگەر بکرێت و جائیز بێت تەعبیری وەها بەکار بێنین، یان دروستتر پێیان بڵێین **ئەمە ئێمەین ئەگەر هاتوو بە دروستی پشتیوان و هاوکاریان بکرێت.**

* سوپای هاوپەیمانان کوردی رزگار کرد لە رژێمی بەغدا وئێستا کورد وەکو گەلانی تری عێراق بەشدارن لە مەڵبەندی بڕیاری ناوەند، بە هەموو کۆسپ و کەم و کورییەکانی ئەم پرنسیپە، وەکو کەمینەیەکە لە نێو زۆرینەیەکی عەرەبی باڵا دەست بێ هیچ جۆرە گەرەنتییەک و، تاکو ئێستا ئەمریکا وەکو هێزی (داگیرکەر)، هەروەها ئیدارەی هاوپەیمانان، مامەڵەیان لەگەڵ کورد لە چوارچێوەی مافی هاوولاتییە نەک وەکو میللەتێکی خاوەن کێشە و بەش خوراوو، قوربانی بەرژەوەندی ئەوان ...هتد

بەڵام ئەزموونی کورد لەگەڵ ئەمریکا جگە لەم لایەنە شیرینەی، لایەنی زۆر تفت و تاڵیشی تێدایە:

* هێڵی ئارامی بۆ دابین کردین، **بەڵام کێ بوو کوردی تووش کرد کە ناچار بێت بکەوێتە باروودۆخێکی وەها کە پێویستی بەو زۆنە ئامینە بێت** ..؟ پێشتر گوتمان بە چراغی سەوزی ئەمریکا کورد راپەڕی دژی رژێمی سەدام و بەچراغی سەوزی ئەمریکا سەدام کوردی سەرکوت کرد و ناچاری کرد لە سنووری تا دوو ملیۆن هاوولاتی دەست لە هەموو شتی خۆی هەڵگرێت رووکاتە کەژو چیاکانی کوردستان و سنووری (موقەدەسی) عێراق ببەزێنێت بەرەو هەندران، لە هەلومەرجێکی سیاسی و ئابووری و سروشتی نالەبار.
* ئەو رژێمەی کە ئەمریکا لە ترسیدا بۆ کورد ناوچەی ئارامی بۆ ( نیوەی خاکەکەی و نیوەی میللەتەکەی) دابین کرد و نیوەکەی دیکەی هەر مایەوە لە ژێر رەحمەتی ئەو دیکتاتۆرە فاشیە، **لە بنەڕەتدا بەرهەمی ئەمریکا و بەریتانیا بوو، بۆ سەلماندنی ئەم راستیەش کردەوەو هەڵوێست و بەڵگەنامەی زۆر هەیە بۆ** نموونە:

١- (علي صالح سعدي) وەکو (امين سر القيادة القطرية)ی حزبی بەعسی سوشیالیستی عەربی لە عێراق و چەند ئەندامێکی دیکەی سەرکردایەتی ئەم حزبە بە قسە و بە نووسین ئیعترافیان کردووە کە ئینقلابی (٨)ی شوباتی ١٩٦٣ و ئینقلابی ١٧-٣٠/ تەمووزی/ ١٩٦٨، بە (قیتارێکی ئینگلۆ ئەمریکی ئەنجام درا)ن، پێش و لە کاتی ئینقلابەکەیان و پاشتریش ( ئەم دوو زل هێزە) بەتایبەتی، هاوکار و پاڵپشتی بەعسیەکانی عێراق بوونە.

٢ــــ ( **جواد هاشم له پاش ئینقلابی ١٧-٣٠ / تەمووز١٩٦٨ بەعس، وەزیری نەخشەکێشان = التخطيط**) بووەو، زۆر نزیکی ئەحمەد حەسەن البکر وسەدام بوو، یەک لە پسپۆڕو ئەکادیمیەکانی عێراقی بوو لە نێو بەعسی ئەوسادا، لە کتێبەکەی (**مذكرات وزير عراقي مع البكر وصدام**)* لە لاپەرە(٢٧١) لەم بارەیەوە دەڵێت :( ليست لدي وثائق ... غير أن احداثا متعاقبة، وتذاكر سفر متناثرة في محطات وقوف "ا لقطار الامريكي، يشير الي وجود حلقة او حلقات اتصال أمريكية أعانت البعث العراقي منذ عام ١٩٦٣ ، وقد تستمر في أعانته لزمن طويل حفاظا على المصالح الأمريكية في المنطقة العربية.)

٣- هەمان سەرچاوە و لەلاپەرە (١٠٩-١١٠) باسی ئەو دەکات کە : لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٨ بە سەرۆکایەتی وەفدێکی عێراقی نێردران بۆ فەرەنسا و پاشتر بۆ لەندەن، ئەمەیش یەکەم وەفدی ئینقلابچییەکانی بەعس دەبێت بۆ دەرەوی وڵات. پاش گەڕانەوەیان راپۆرتێک بەرز دەکاتەوە بۆ سەرۆک کۆماری عێراقی ئەوکات (ئەحمەد حەسن البکر)، پاش هەفتەیەک (البکر) داوای دەکات بۆ کۆشکی کۆماری و پێی دەڵێت: ( نريد منك أنا وصدام حسين ان تدرس موضوعا اخرا هو : كيف نلغي المقاطعة التجارية مع أمريكا من دون ان يحدث هذا الألغاء أي رد فعل سلبي في صفوف الحزب . فأنت تعرف ان أكثر البعثيين شبان متحمسون، ولا يفهمون من أمور السياسة الدولية شيئا. أريد أن ألغي المقاطعة بشكل هادئ. هل لديك مقترحات ؟ كان الطلب مفاجئا." لم استطع تقديم مقترحات آنية له ، ثم أن الأمر يعود الي وزير الأقتصاد وليس الى وزير التخطيط. وعندما أبديت له هذه الملاحظة ، ضحك البكر وقال : التخطيط هو تخطيط البلد. أذهب وخطط لهذا الأمر وقدم الى تقريرا" حول المقاطعة من دون أن تخبر به احدا". أكتبه بخط يدك، ولا حاجة الى طباعته.) بعد يومين او ثلاثة، قدمت الى البكر تقريرا بخط اليد أقترح فيه اصدار (التعليمات) من لجنة التموين العليا ( التي أصبحت فيما بعد مجلس تنظيم التجارة) نلغي بموجبها مقاطعة البضائع الأمريكية. ومن أجل الا تحدث تلك التعليمات بلبلة عقائدية في صفوف الحزب ونتهم بالعمالة

---

* مذكرات وزير عراقي مع البكر وصدام، ذكريات في السياسة العراقية ١٩٦٧-٢٠٠٠/ جواد الهاشم- دار الساقي- الطبعة الاولى ٢٠٠٣.

والخيانة والجاسوسية، فقد أقترحت أن يكون نص التعليمات كالآتي **"بناء على مقتضيات المصلحة العامة ، ونظرا الى استمرار أمريكا في سياستها العدوانية ضد مطامع الأمة العربية ، فقد قررت لجنة التموين العليا مايلي :**
**١- استمرار مقاطعة البضائع الأمريكية .**
**٢- يستثني من أحكام الفقرة (١) أعلاه البنود من كذا الى كذا من بنود تصنيف التجارة الدولية . "**
- والواقع ان الفقرة (٢) من التعليمات استثنت ما يقارب ٩٠٪ من البضائع الأمريكية من أحكام المقاطعة .
- صدرت التعليمات بتوقيع وزير الأقتصاد ، **وبقي الكادر الحزبي معتقدا ان مقاطعة أمريكا وبضائعها مستمرة ! )**

٤- له سالّى ١٩٧٢ كه ( بهعس) نهوتى عێراقى خۆمالّى (تأميم) كرد، كۆمپانياى (نهوتى عێراق)و، كۆمپانياى ( نهوتى مووسلّ)، خۆمالّى كران، كه چى كۆمپانياى( نهوتى بهسره) دهستى لێ نهدرا، چونكه ئهم كۆمپانيايه سهر به كۆمهڵێكى كۆمپانياى نهوتى ئهمريكى بوو. **كۆمپانياى نهوتى بهسره بهرههمى دهرهێنانى نهوت و فرۆشتنى سالآنهى له ٣٢ مليۆن تهن بهرز كردهوه بۆ ٨٠ مليۆن تهن.** له كاتێكدا بهشى ههموو كۆمپانيا ئينگليزى و فهرهنسى و هولّهنديیهكان و كهلو پهلهكانيان خۆمالّى كران ودهست بهسهرياندا گيرا. بازرگانى كرينى نهوتى عێراق كهوته ژێر فشارى ئهو كۆمپانيانهو ولآتهكانيان، بهرههمهێنانى دهركردنى نهوتى عێراق و بازارِى كرينى زۆر كهم بووهوه، كۆمپانيا ئهمريكيهكان **ئهركى پر كردنهوهى ههندێ لهو بۆشايهتيانهيان خسته ئهستۆى خۆيان...!**

(جواد هاشم ) له ههمان سهرچاوهو له لاپهره(١٩٦) دا دهلّێت : "وبقيت شركة نفط البصرة (المملوكة من شركات نفط أمريكية) خلال هذه الفترة غير مؤممة ... (وزادت ) من انتاجها من النفط الخام من (٣٢) مليون طن عام ١٩٧٢ ليصل الي (٨٠) مليون طن عام ١٩٧٦ ." ههلّوێستى كۆمپانيا ئهمريكيهكان چ له بهردهوام بوونى دهرهێنان وفرۆشتنى نهوتى عێراق و چ زياد كردنى بهرههمى سالآنهيان بهو شێوهيه، پێويستى به تهعليق نييه .

٥- له كاتێكدا زوڵم و زۆری سەدام و رژێمە خوێن ڕێژەكەی هەموو كون و قوشبنێكی عێراقی گرتبووە خۆ، ئەمریكاو وڵاتانی رۆژئاوا نەک هەر بێ دەنگ بوون، بەڵكو پاڵپشتیشی بوون لە كۆمەک كردنی بە چەک و تەكنەلۆجیا و زانیاری و سیخوڕی... دیكۆمێنتی ئەمریكی ژمارە (R090825Z٤٨-ADP) لە ٧/٨/ ١٩٨٠، كە راپۆرتێكە، لە لایەن **لێپرسراوی بەشی رعایەتی بەرژەوەندییەكانی ئەمریكا لە بەغدا (ئەلیزابیث جۆنز) (مسؤولة شعبة رعاية المصالح الأمريكية في بغداد)،** (Jones .A.Elizabith)، بۆ وەزیری دەرەوی ئەمریكای بەرز كردوەتەوە تیشكێكی تر دەخاتە سەر هەندێ لەو راستیانە. راپۆرتەكە بریتییە لە هەندێ زانیاری سەبارەت بە پلە و پایە و هەڵوێستی سەدام و مەترسییەكانی سەر خۆی و رژێمەكەی **(ان سياسة صدام في التقرب من الجماهير لها فاعلية ايجابية لدى طبقة الفلاحين والمسحوقين. اما شيعة العراق والأكراد والمثقفون وطبقة المهنيين والفنيين ، فلا يعتقد بولائهم ، وبالتالي فان اجهزة المخابرات تتحرك بهدوء وسرية وفعالية لتجتث جذورهم والتخلص منهم ومن أحتمال قيامهم بما قد يزعزع كيان صدام وسلطته .)** وذهب التقرير أبعد من ذلك، ليحذر من أحتمالات الخطر القادم من طبقة العسكريين، وينصح بضرورة أهتمام صدام بتلك الطبقة مع مراقبة نشاطها، اضافة الي التحذير من خطر حقيقي آخر هو الأغتيال برصاصة غادرة أو بأنقلاب تحاك خيوطه في ردهات القصر الجمهوري ودهاليزه ). بعد هذا التحذير، يعود التقرير الي تطمين الأدارة الأمريكية الى أن كفاءة المخابرات العراقية من جهة، ومقدرة صدام حسين وشجاعته من جهة اخرى، كفيلة بالقضاء على اية ثورة شعبية، خاصة أن سياسة صدام في القضاء على خصومه قد برهنت على قدرة فائقة في ازاحة كل من يحتمل أن يكون مصدر خطر عليه ، حتى وان كان ذلك الخطر بعيد الأحتمال .) ( **ان الخطر الحقيقي كما يقول التقرير هو الأغتيال الذي حتى وان وقع، فسوف لا يؤدي الي تبدل جوهري في سياسة السلطة العراقية الحاكمة واتجاهاتها...)**. (هەمان سەرچاوەی پێشوو).

شایەنی باسە **(ئەلیزابیث جۆنز)** ساڵی ١٩٩٩ لێپرسراوی بەشی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوو لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریكاو، سەرپەرشتی و بە

دواداچوونەوەو چاودێری چۆنیەتی جێبەجێ کردنی ڕێککەوتننامەی واشنتۆنی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستانی ساڵی ١٩٩٨ پێ سپێردرابوو و، سەردانی کوردستانی ئازادیشی کردو، لایەنی کوردیش بایەخێکی زۆری بەم خانمە داو دواتریش تەعین کرا بە سەفیرو ئێستاش لێپرسراوی بەشی یەکێتی ئەوروپایە لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا..!!

٦- پێش داگیر کردنی کوێت لە لایەن سەدام حسێن بە نزیکەی ساڵێک، کۆبوونەوەیەکی گرنگ بەسترا لە نێوان وەزیری دەرەوەی عێراقی ئەوکات (طارق عزیز)و وەزیری دەرەوەی ئەمریکای ئەو دەم (جیمس بیکر) لە واشنتۆن و لەسەر داوای عێراق. بە پێی دیکۆمێنتێکی ئەمریکی کە پوختەکەی (٨) لاپەڕەیە و لە ژێر ژمارە **(Z١٣٠٢٠٧) لە ٦/ ١٠/ ١٩٨٩** تەوسیق کراوە وەکو کۆنووسی ئەو کۆبوونەوەیە، لە لاپەڕە ١٨٩ سەرچاوەی ئاماژە پێ کراوی سەرەوە ( جواد هاشم) تەسبیت کراوە. دیکۆمێنتەکە بەو شێوەیە دەستی پێ دەکات: (**أفتتح جيمس بيكر الأجتماع مرحبا بالوفد العراقي المؤلف من طارق عزيز وزير الخارجية والسفير محمد المشاط وعدد آخر من موظفي وزارة الخارجية العراقية، مؤكدا حرص الأدارة الأمريكية على تطوير علاقاتها مع العراق. وبدأ بعد ذلك طارق عزيز الكلام معربا عن شكر الحكومة العراقية وامتنانها لمساعدات الحكومة الأمريكية ووكالة الأستخبارات الأمريكية " السي آي أيه " في تزويد العراق بالمعلومات التعبوية والصور الفضائية التي ساعدته في حربه مع ايران** . وأستطرد طارق عزيز قائلا ان المعلومات المتوفرة لدى الحكومة العراقية تشير الى موقف سلبي للادارة الأمريكية تجاه العراق، في اربعة مجالات هي : )

أ- التصريحات السلبية الصادرة عن مسؤولين أمريكيين حول نوايا العراق أتجاه دول الخليج.

ب- الصعوبات والعراقيل التي تضعها الأدارة الأمريكية أمام حصول العراق على التكنولوجيا المتقدمة من أجل اعادة بناء الأقتصاد العراقي بعد سنوات الحرب الطويلة مع ايران.

ت- المواقف السلبية للكونگرس الأمريكي تجاه العراق.

ث- تخفيض الحكومة الأمريكية لمبلغ الأعتماد المصرفي المخصص للعراق من بليون دولار الى ٤٠٠ مليون دولار خلال السنة المالية ١٩٩٠.

**وتشير المذكرة السرية الأمريكية الي أن جيمس بيكر أبدى دهشته وأستغرابه من أتهامات عزيز، متسائلا (كيف يمكن لصدام حسين وحكام العراق تصديق اشاعات أو معلومات مخابراتية في الوقت الذي بذلت أمريكا كل ما في وسعها لمساعدة العراق في حربه مع ايران، بما في ذلك انشاء دائرة خاصة لـ(سي أي أيه) في مبنى السفارة الأمريكية في بغداد لمد السلطات العراقية بالمعلومات العسكرية عن ايران، وكذلك المعلومات الأمنية عن التحركات الداخلية ضد النظام العراقي).**

واته پەیوەندی دووقوڵی و هاوکاری و پشتیوانی لە نێوان ئەمریکا و رژێمی سەدام کە بە درێژایی تەمەنی ئەم رژێمە نکوڵی لێ کردووە زیاتریش خۆی بە دوژمن و بەرەنگاری ئیمپریالزمی ئەمریکی بە خەڵکی عێراق و جادەی عەرەبی و ئیسلامی دەفرۆشت، یاری کردن بوو بە ئیحساسات و هەستی ئەو جەماوەرە.... ئەم سیاسەتەیش لەلایەن ئەمریکاوە سەبارەت بە پشتگیری سەدام تاکو سەدام (عصا الطاعة)ی شکاند لە رووی ئاغاکانی هەر بەردەوام بوو و، وای دەزانی تاکو دوایی بۆی دەچێتە سەر، بەڵام کە لە دەستی دەرچوو کاتی پەشیمانی نەمابوو.

* زیاتر لە ٣٦ساڵ لە دەسەڵاتی بەعس و سەدام کەم یان زۆر ئەمریکا هاوکاری بووە، ولە کاتی پێویست و چارەنووسسازدا یاریدەر بوون. هۆی ئەم هاوکارییە لە ناوەڕۆکدا: جووتبوونی کردەوەکانی سەدام لەگەڵ بەرژەوەندیە باڵاکانی ئەمریکا و دۆستانی بووە. هەر کاتیش مەترسی هەبایە لە سەر سەدام و رژێمەکەی، هەموو ئیمکانیات و زانیاریان دەخستە خزمەتی بۆ نموونە:

١- هەموو جۆرە کارهاسانی و هاوکاری بەعس کرا کە بێنە سەر حوکم. بە ئیعترافی سەرانی.

٢- کارهاسانی و هاوکاری سەدام و سەدامیەکان، لە بەربەرەکانی و تەفرو توونا کردنی لایەنە سیاسی و کەسایەتییە عێراقییەکان کە لە بنەڕەتدا دژی سیاسەت و پیلانی ئەمریکا و هاوپەیمانانی بوون لە عێراق و ناوچەکە، یان سەریان شۆڕ نەکردووە بۆیان.

٣- ڕێککەوتننامـەی ( الجـزائر) لە ٦ ی/ ئازاری/ ١٩٧٥ لە نێـوان شـای گۆڕبەگۆڕی ئێران و سەدامی بەدناو، کە تێدا ڕۆڵی نهێنی ئەمریکا لە ڕێگای وەزیری دەرەوەی ئەو سەردەمـە (هینری کیـسنگەر) لە مـەیانگیـری نێـوان هەردوولا، کـاریگەری خـۆی هەبوو لە سـەر ئەو پرۆسـەیەو قـۆناغـەکـەشی. **ئەنجامی: تیرۆر کردنی شۆڕشی مەزنی ئەیلول و نسکۆی بزاڤی ڕزگاری خوازی کـورد بوو**، بە پێچـەوانەی بەڵێن و هاوکـاری و هاندانی ئیدارەی نیکسون و ڕۆڵی ڕاستـەوخۆی کیسنجەرو (CIA) وەکـو کـەناڵێکی پەیوەندی ئیـدارەی ئەمـریکای ئەو سـەردمـە لەگـەڵ سـەرکـردایەتی شـۆڕشی ئەیلول و، پاشـان (کیسنگەر) و ئەمسالی کیسنگەر ئۆباڵی ئەو کارەساتە دەخاتە ئەستۆی خودی سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول و دواکەوتنی کوردان لە کوردستانی عێراق...هتد ئەو ڕێککەوتننامەیە بووە مایەی هەموو ئەو نەهامەتەیەی کە سەدام بە سەری کوردی هێنا، تاکو ئەو رادیە کـە دەکرێت بڵـێین هەر ئەوەیش زەمینە خۆشکەر بوو کـە سەری شـاو سـەدامی خوارد. ناوچەکـەش تووشی زنجیـرەیەک ڕووداو و کارەسات بوو تاکو کار گەیشتە داگیرکردنی عێراق !

٤- ئێـرانی شـا پایگای هەرە گـەورەو گـرنگی ئەمـریکا و هاوپەیمانانی بوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، چی بە حوکمی دراوسێتی لەگەڵ یەکێتی سۆڤییەتی جاران، چ بە هۆی مەوقیعی ئێران و ڕۆڵی لە کەنداو، هەروەها هاوپەیمانیەتی ئێرانی شا لەگەڵ ئیسرائیل وەکو دەوڵەتێکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئیسلامی و، تەنسیقیان لەگەڵ تورکیا، باڵی باشووری (ناتۆ) دژ بە ( وارشۆ)ی پێشو. سـەرەڕای ئەمـە هەمـوو، سـەروەت و سـامـانی نەوتی ئێران وەکـو ئەندامـێکی (ئۆپـێک) **بەدەر لە بازنەی وڵاتانی نەوتی عـەرەبی** و، نەوتیش وەکـو مەعلوومە پێویستـییەکی حەیاتیە بۆ ئەمریکا و ڕۆژئاوا. بۆیە شۆڕشی ئیمام خومەینی و دامـەزراندنی کـۆمـاری ئیسـلامی و نەمـانی شـاو ڕژێمـەکـەی بوژانەوەی بیرو باوەڕی ئیسـلامی ئینقلابی، لە واقعدا دژ بە بەرژەوەندی ئەمریکا و دۆستـانی بوو، بە هەمـوو حـیـسـابێـک دەبوایە چی نەبێت وڵاتانی عـەرەب و لە پێش هەموویانەوە (عێراق ئەوانەی کە ئیدیعائی بەربەرەکانێ کردنی ئیمپریالیزم و ئیسـرائیلیان دەکرد و خەڵکیان پێ فریوو ئەدا)، نەک هەر پێشـوازییـان لەو شۆڕشە بکردایە، بەڵکو هاوکار و پشتیوانی بایەن. کەچی بە پێچەوانەوە، هەر

له ڕۆژانی یەکەمی ئەم شۆڕشە، ڕژێمی سەدام ئاڵا هەڵگری بەربەرەکانێ و دژایەتی کردنی بوو و، زۆریشی پێ نەچوو شەڕی بەرپاکرد لە دژی. ئەو شەڕە بە فیت و پلان و پشتیوانی ئەمریکاو زۆر لە وڵاتانی دیکە بوو. لە میانەی ٨ ساڵی شەڕدا ژێرخانی ئابووری هەردوو وڵات خاپوور کرا، سەدەها هەزار لە خەڵکی هەردوولا ژیانیان لە دەست داو و سەقەت و بێ دەرەتان بوون. ئابووری و ئەمن و ئارامی ناوچەکە بە گشتی تووشی قەیران و هەژاندن بوو، بە سەدەها ملیار دۆلار چووە خەزنەی ئەمریکاو وڵاتانی ڕۆژئاوا. بە کورتی: وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لە پێش هەموویانیشەوە عێراق و ئێران، تووشی قەیران و نەهامەتی هاتن و، گەورەترین زەرەرمەند بوون، جگە لە ئیسرائیل و تورکیا، **ئەمریکاو ڕۆژئاوا و زۆر وڵاتانی تریش، گەورەترین سوود بەخش بوون.**

٥- داگیر کردنی کوێت و پاشان گەردەلوولی بیابان لە ١٩٩١ و شەڕی ئابلۆقەی سیاسی و ئابووری و دیپلۆماسی (١٩٩١-٢٠٠٣)، لەلایەن کۆمەڵگای نێودوڵەتی، بە ئەمر و راسپاردەی ئەمریکا، تەنها خەڵکی عێراق زیانمەند بوون و. لە قازانجی سەدام و ڕژێمەکەی بوو و توانی ١٢ ساڵ تەمەنی خۆی درێژ بکات و عێراق و ناوچەکە بهێڵێتەوە لەو گێژاوەیەی کە تێدا دەژیا.

٦- ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ کە بە چراغی سەوزی ئەمریکا بوو چ لە کوردستان و چ لە باشووری عێراق، هەر بە چراغی سەوزی ئەمریکا سەدام سەرکوتی کردن و سەدان هەزار کورد و عەرەب گیانیان لە دەست دا و، **کوردیش تووشی کۆڕەوێکی ملیۆنی بوو، کە بە گەورەترین تراجیدیای کۆتایی سەدەی ڕابردوو لە قەڵەم ئەدرێت،** ئیتر ناچار بوون هێڵی ئارام دیاری بکەن بۆ پاراستنی خەڵکی ئەو دەڤەرە. جا ئەگەر ئەمریکا و هاوپەیمانانی ئەو (هێڵەیان) زامن نەکردایە، دەبوایە هەڵوێستی ( بوش) و گشت هاوپەیمانانی بەرامبەر کارەساتێکی وەها و بەرامبەر بە رای گشتی جیهان چی بوایە؟.. بەتایبەتی گشت کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی دونیا لە نێو ڕووداوەکاندا بوون و دیمەنە سامناکەکانی دەچووە نێو هەموو ژوورێکی کاربەدەستان و هەموو ماڵێک لە هەموو کون و قوشبنێکی ئەم سەر زەویە.

٧- له ماوەی ١١ ساڵی هێڵی ئارام، ڕژێمی سەدام بەردەوام بوو له کوشتن وگرتن ڕاونان و ڕاگوێزان و گۆڕینی شناسنامەی نەتەوایەتی و به زۆر به عەرب کردن و هێنانی عەرەب بۆ کوردستان و گۆڕینی عائدیەتی ئیداری گوند و ناحیەکانی ناوچەکانی کوردنشین لەو ناوچانەی که له ژێر دەسەڵاتیدا بوون و، تاڵان و هێرش و تەجاوز کردنی خەتی سنووری هێڵی ئارام، سەرباری ئابڵووقەی ئابووری و تیرۆر و دروست کردنی گیروگرفت بۆ هەموو جۆره دەرفەتێکی باش، بۆ ناوچەکانی کوردستان بەدەر له دەسەڵاتی خۆی، هەروەها تەگەره و کۆسپ دانان له ڕێگای جێبەجێ کردنی بڕیاری ٩٨٦ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی. واته ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی به گشتی و ئەمریکا و هاوپەیمانانی به تایبەتی لەو ماوەیدا، نه خۆیان ڕاستەوخۆ هەوڵەکانی سەدامیان پەک خست و، نه مەجالیشیان دا به خودی کورد ئەو ڕۆڵه ببینێت. واته ١١ساڵ تەمەنی سەدام و ڕژێمەکەی درێژەی پێ دراو خەڵکی عێراقی له ژێر ئێش و ئازار بناڵێنێت و، **ئەو ڕژێمه توانی لەو ١١ ساڵەدا تاکو ڕادەیەک جادەی عێراقی و عەرەبی ڕابێنێت بۆ بەربەرەکانێی گۆڕین و دیموکراسی و ئازادی و، تین و گوڕێکی عەرەبی شۆفێنی بخاته پاڵ هەوڵەکانی له چوارچێوەو دیدێکی ئایینی توندڕەو، ئەمەیش تەوژمێکی گەورەی دا به بزاڤی توندڕەوی ئیسلامی تەسک بین و تیرۆریستان.** سەرباری ئەمانه هەمووی سەدام و دەزگا تیرۆریستەکانی، به هەموو تواناو ئەزموونی خراپەکارییان و **هەمـــــوو ئیمکانیاتی مادی عێراقی پێشوو و، کەناڵەکانی پەیوەندییان و، پرۆژەکانی نەوت بەرامبەر به خۆراک و دەرمان، واریداتی نەوتی قاچاغ،** تەرخان کات، بۆ ئەو مەبەستانه. هەروەها **کێشەی ئابڵووقەی ئابووری** کۆمەڵگای نێودەوڵەتی لەسەر عێراق بکاته بەهانه و پاساو بۆ بزر کردنی ڕاستییەکان. لایەنێکی زۆری ئەوەی له میانی ئەم (٨) مانگەی پاش (ڕزگاری) عێراق و نەمانی ڕژێمی سەدام ڕوو ئەدات له عێراق، ئەنجامی ئەو سیاسەتەیه و نرخی ئەو چاوپۆشینەیه لەلایەن ئەمریکاو کۆمەڵگای نێودەوڵەتی به تایبەتی دەرحەق به سەدام و ڕژێمەکەی.

٨- له ماوەی ١١ ساڵی هێڵی ئارام و چاودێری ئاسمانی کوردستانی ئازاد، لەلایەن هێزەکانی ئاسمانی ئەمریکا له ئەنجەرلیکەوە، ڕژێمی سەدام ڕۆژانه به

دەیان خروقات و تاوانی دژ بە هاوولاتیانی کورد و عێراقییەکان دەکرد: گرتن، کوشتن، راونان، راگوێزان، تەعریب، تەبعیس، گۆڕینی شناسنامەی نەتەوایەتی (تصحیح القومیة)، سیخوڕی، تیرۆر، تەقینەوە، تەهدید، هێرشی سوپایی،. ئابلـووقـەی ئابووری ...هتـد هەر یەک لەم تاوانانە دژ بە مـافی هاوولاتی و بنەمـاکـانی مـافی مـرۆڤن، کـە بە پێی بڕیاری ٦٨٨ ئەنجـوومـەنی ئاسـایشی نێودەوڵەتی و هێزی چاودێری ئەمریکا و بەریتانیا لە ئەنجەرلیک بەرپرسیارن لە مەنع کردنی. هێزە سیاسیەکان و پەرلەمان و کەناڵە جیا جیاکانی حکومەتی هەرێم و رێکخراوە جەماوەری و مرۆیەکان و کەسایەتییە نیشتمان پەروەرەکانی کوردستـان، بەردەوام دەزگا نێودەوڵەتییـەکانی ئاگادار دەکردەوە، بە تایبـەتی مەڵبەندەکانی بڕیار لە ئەمریکا و بەریتانیا و یەکێتی ئەوروپا و ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی، کەچی بێ دەنگ بوون و، هەمیشە فشاریان دەخستە سەر کوردان کە نابێت دەستپێشخەر بن لە ئاڵۆزی و گرژی دژی رژێمی سەدام. سەدام دەستی خسـتبووە نێـو کـاروباری ناوخـۆی کـوردستـان، بێ دەنگی و گـوێنەدانی ئەمـریکا و کـۆمـەڵگای نێـودەوڵەتی بە رووداو و داخـوازییـەکـانی خەڵکی کوردستان بەرامبەر بەو خروقات و دەستتێوەردانەی سەدام، زیاتر بێ باوەڕی و تـرس و نا ئومـێـدی دروست دەکـردو، رۆژ بە رۆژ پەرەی دەسـەندو، هەردوو هێـزە سـەرەکـیـەکـەی کـوردسـتـان (پارتی ویەکـێـتی)، جـارێکی دیکە کەوتنە داوی ولاتانی ئیقلیمی کە رۆژانە نفووزو رۆڵیان لە کوردستانی ئازاددا کـاریگەر تر دەبوو. پەیوەندی نێـوان بەغـدا و ناوەندی بڕیاری هەردوو حـزب و هەردوو ئیدارە لە پەرە سـەندندا بوو. هەندێ جاریش ئەندامـانی سـەرکـردایەتی هەردوولا لە بەغـدا کۆ دەکرانەوەو، (ئامـۆژگاری) دەکـران..!!. پیاوانی رژێم و رێکخستنی بەعس لە هەولێر و دهۆک و سلێمانی بە گشتی تەراتێنیان دەکرد و ئەم هەڵوێستە جێگای ترس و گلەو گازندەی جادەی کوردستان بوو.

٩- شـەڕی بەهاری ٢٠٠٣و، رزگـاری عـێـراق لە رژێمی سـەدام و، داگـیـر کـردنی عێراق لەلایەن ئەمریکا و هێزی هاوپەیمان، هۆی هەڵگیرساندنی شەڕەکەو ئەو داگیرکردنە هەر سەدام لێی بەرپرسیارە. ولات خاپوور کرا ،شیرازەی ئیدارەو ئەمن و ئاسـایش تێکچوو و هەمـوو شت رۆیشت و خۆی مـایەوە. ئەمـریکایش پاش هەمـوو ئەو کـارەسـاتانە کە بەسـەر مـیللەتانی عـێراق و ناوچەکـە هات بە

هۆی کردەوە و سیاسەت و تاوانەکانی سەدام، کەچی سەدام حسین کە گیرا لە تاوانباری جەنگەوە کردیان بە ئەسیری جەنگ...! دەنگی وایش هەیە دادگایی کردنی سەدامی تاوانبار (ئەگەر بکرێت) بەرامبەر دادگایەکی عێراقی نابێت، بەڵکو دەدرێت بە دادگایەکی نێودەوڵەتی ....!

* لەو ماوەیە کە ئەمریکا و هاوپەیمانان هێڵی ئارامیان تەئمین کرد، وەکو کورد، وە بە پێچەوانەی کۆسپ و گرفتەکان توانی ئەزموونێکی دیموکراسی فرەلایەنی بنیاد بنات، تێدا ئازادی بیرورا و رۆژنامەگەری و مافی کلتووری و ئایینی و مەزهەبی گشت دانیشتوانی کوردستانی ئازاد بە برایانی تورکمان و کلدۆئاشووریشەوە مسۆگەر بکات، ئەمەیش بۆ پرۆژەکانی ئەمریکا و گشت کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، لە بەرەبەرەکانییان دژی رژێمی نەفرەت لێ کراوی سەدام، هێمایەکی گرنگ و پراکتیکێکی باش بوو، چ بۆ پاساودانی هەوڵ و کۆششیان لە ئابڵووقەدانی ئەو رژێمە و لاواز کردن و رماندنی و، چ بۆ دوا رۆژی عێراق و ناوچەکە و ئەو ئیستراتیجیەتەی ئەمریکا و هاوپەیمانانی کە بۆ عێراق و (رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گەورە) نەخشە کێش کراوە، بەڵام هەڵسوکەوتی ئەمریکا وەکو هێزو دەسەڵاتی (داگیرکەر) بەرامبەر بە کێشەی کورد لە کوردستانی عێراق لە ماوەی نزیکەی یەک ساڵ، گەواهی ئەوە نادات ئەم ئەزموونەیانە وەکو کیانی کوردستانی عێراق هەتاکو لە چوارچێوەی عێراقیشدا زۆر پەسەند بێت لەلایان. **دوور نییە لە ئایندە ئەم هەڵوێستە هێشتا روون و ئاشکراتر بێت، ئەگەر هەڵسوکەوتی لایەنی کوردی هەر وەکو ماوەی رابردوو بێت.**

* هەرچەندە هێڵی ئارام رۆڵێکی کاریگەری هەبوو لە پاراستنی خەڵکی کوردستان و ناساندنی کێشەکەی و مەسەلەی غەدری مێژوویی، بەڵام مانەوەی بەو شێوەیە رەنگدانەوەیەکی وەهای نەبوو لە نێو خەڵکی کوردستان بە گشتی، چونکە:

١- ئەو هێڵە تەنها ئاسمانی بوو. واتە تەنها بەرەنگاری هێزە ئاسمانییەکانی سەدام دەبووەوە ئەگەر هاتوو هێرشی بکردایەتە سەر ناوچەکانی سنووری ئەو هێڵە.

٢- لێدانی هێزە ئاسمانییەکانی سەدام لە کاتی دەستدرێژی، لە لایەن هێزەکانی ئاسمانی ئەمریکاو هاوپەیمانانییەوە کات و شوێنی تەحدید دەکرا!.

٣- رووبەری ناوچەی ئارام لە سنووری ٤٠٪ی رووبەری گشتی کوردستانی عێراق بوو و، لە سنووری نیوەی خەڵکی کوردستانیان دەپاراست. واتە لە سنووری ٦٠٪ی خاکی کوردستان ونیوەی میللەتەکەمان لە ژێر کۆنترۆڵی رژێمی بەدناوی سەدام مابوودوە بێ هیچ جۆرە پشتگیری و پاراستنێک. **سەیر لەوەدایە تاکو ئێستاش ئەو خاکە و ئەو خەڵکە شاد نەبوونەتەوە لەگەڵ ئیدارەی حکومەتی هەرێمی کوردستان** و، تاکو ئێستا خەڵکی کوردستان لە دڵەڕاوکێ و بێ باوەڕیدا دەژین و، ناوچە لەت لەت کراوەکانی هەر وەکو خۆی ماوەتەوە لەسەر پارێزگا عەرەبییەکان. ئاوارەکانمان هێشتا رێگایان پێ نادرێ بگەڕێنەوە سەر زێدی باوباپیرانیان، عەرەبە تەعریبچییەکان هێشتا لە جێگای خۆیانن...هتد. **لەگەڵ تەقدیرمان بۆ ئەو هێڵە ئارامە، لەگەڵ ئەوەیش ئەوە ناگەیەنێت بەو شێوەیە کوردی لەسەر منەتبار بکرێت و ئەمە بکرێت بە مەهانە بۆ قەبووڵ کردنی پرۆژەی فیدراڵیەتی پارێزگاکان.**

رزگار کردنی عێراق لە لایەن ئەمریکاو هاوپەیمانان خزمەتێکی گەورەی گەیاند بە گەلانی عێراق بە گشتی و ئێمەی کورد بە تایبەتی، چونکە نەجاتی داین لە دڕندەو ترسناکترین رژێمی فاشی و شۆڤێنی دژ بە بوونی خاک و نەتەوەو مرۆڤ لە کوردستان و لە ناوچەکە، بەڵام ئەم شەڕە هەر وەکو ئاماژەمان بۆ کرد، لەبەر چاوی رەشی خەڵکی عێراق و خەڵکی کوردستان نەبوو. **ئەگینا بۆ پێش شەڕی عێراق و ئێران حەدێکیان بۆ سەدام دانەنا، کە بە خۆیان هەر لە سەرەتاوە ئاگاداری هەموو شتێک بوون..؟ بۆ لە کاتی رزگار کردنی کوێت پرۆسەکەیان تەواو نەکرد...؟ بۆ ١٢ ساڵی دیکەیان لە تەمەنی سەدام و موعاناتی میللەتەکەمان درێژە پێ دا...؟!** .

ئەمەی ئەمریکا و بەریتانیا و هاوپەیمانانیان کردیان دژ بە سەدام، نەخشەو پلانێکی فراوان و قووڵترە لەوەی بە دەری دەخەن. پوختەو ناوەڕۆکی بەرژەوەندی باڵای ئەمریکاو و پاراستنی نەتەوایەتیان بوو.

هەر چۆن ئەمریکا و هێزەکانی رۆژئاوا خولقێنەر وپشت و هاوکاری زۆر لە هێزە بە ناو ئایینی و مەزهەبییەکان بوون لە ولاَتانی ئیسلامی لە سەردەمی شەڕی سارد، بۆ بەکار هێنانیان دژی کۆمەنیزم و بزووتنەوەی رزگاری خوازی گەلانی ئەو ولاَتانە، هەروەها هەمان هێزو جەمسەر خولقێنەر و پشتیوانی رژێمە کۆنەپەرست و دیکتاتۆریەت و فاشییەکان بوون، وەکو تالیبان و سەدام. کە لاپەڕەی ئەم جۆرە رژێمانە سوتا و مانەوەیان بووە بارگرانی بۆ ئەو جەمسەرە، ئابلۆوقەدران بە ئومێدی ئیحتواو لاوازکردن و گۆڕینیان بۆ قەدو بالاَی قۆناغی یەکجەمسەری و عەولەمەو عەلمەنە. چاکسازی وەها بۆ ئەو جۆرە رژێمانە مانای نەمانیانە. دوور نەبوو ئەگەر رووداوی ١١/ ئەیلولی سالَی ٢٠٠١ نەبوایە گۆڕینی، یان لابردنی ئەو جۆرە رژێمانە جێگای باس نەبوایە. بۆیە ئەو رووداوە پەلەی بە دانان و جێبەجێ کردنی نەخشەی لادانی سەرانی ئەو دوو رژێمە کرد، تاکو بە ناچاری بیان گۆڕن. جێگای سەرنجە رژێمی تالیبان لە ئەفغانستان و رژێمی بەعس لە عێراق نەما، کەچی نە (مەلا عومەر ) ونە (بن لادن)ی یاریدەری و، نە (سەدام ) و نە ( عیزەت دووری) یاریدەری لە ناونەبران. کە سەدامیش گیرا وەکو باسمان کرد، لە تاوانباری شەڕەوە کرا بە ئەسیری شەڕ ..!

هەر چی و چۆن بێت نەخشەو پلانی ئەمریکا سەبارەت بە عێراق و ئایندەی، ئێمەی کورد لە پرۆسەی(رزگاری عێراق) بۆ ئەمریکا و هاوپەیمانانی رۆلێکی کاریگەرمان هەبوو:

١- لە رووی دەسەلاَت و ئازادی و ئومێد لە پرۆسەی ئازادی عێراق، کورد و کوردستانی ئازاد تەنها هێزو پایگای پتەو و توکمە و گرنگ بوو بۆ هێزەکانی ئەمریکا. رووبەری لە سنووری ( ٤٥ ) هەزار کم چوارگۆشە لە خاکی ئازادی کوردستان هاو سنووری ئێران و تورکیاو سوریاو، کەمتر لە ١٥٠ کم نزیک لە بەغدای پایتەخت و لە سنووری (٤) ملیۆن ئینسانی کورد لە کوردستانی ئازاد و زیاتر لە (٣) ملیۆنی دیکەی کورد لە ناوچەکانی ژێر کۆنترۆلی رژێمی سەدامی داڕماو، هاوکارو لە پێشوازی سوپای ئەمریکا بوو. تەنها و تەنها لە ناوچەکانی کوردستان سوپای ئەمریکا گولباران و لە ئامێز دەگیرا.

واتە تەنها کوردستانی ئازاد رووبەرێکی وەهای بۆ هێزەکانی ئەمریکا دروست کرد، کە زیاترە لە رووبەری ولاَتانی ( کوێت =١٧ هەزار کم چوارگۆشە، قەتەر

=١١ هەزار کم چوارگـۆشـە، لوبنان ١٠ هەزار کم چوارگـۆشـە) هەروەها پاش رزگار کردنی مووسڵ و کەرکوک و خانقین و مەندەلی ئەوە رووبەری کوردستانی ئازاد جگە لەو رووبەرەی کـە ئامـاژەمـان بۆ کـرد رووبەری وڵاتانێکی وەکـو (قوبرس ٩ هەزار کم چوارگۆشە، تیمۆری شەرقی ١٥هەزار کم چوارگۆشە)یش بخرێتە سەر ئەوانەی تر، هەروەها لە رووی ژمارەی هاووڵاتیانی کورد بەرامبەر بە وڵاتانی تر ئەوە، ژمـاری کـوردی هاوکـار و پێشـوازی کـەری کـوردسـتـانی (٧-٨ ) ملیۆن کەس، زیاترە لە ژمـارەی هاووڵاتیـانی (عـومـان ٧ر٢ ملیـۆن، قەتەر ٧٠٠هەزار، کویت ١ر٢ ملیۆن، ئیماراتی عەرەبی ٤ر٢ملیۆن) یان زیاتر لە نفووسی ئەم وڵاتانە (کۆماری تیمۆری شەرقی ٩٠٠هەزار، کۆماری قوبرس ٧٠٠هەزار، کـۆمـاری بۆسنەو هرزەگـۆڤـینا ٩.٣هەزار، کـۆمـاری مـاڵتـا ٣٠٠ هەزا، کۆماری ئەرمینیا ٣ر٣ ملیۆن).

٢- هێـزێکی پێشـمـەرگـەی پڕ چەک و خاوەن ئەزمـوونێکی دوور و درێژ لە شەڕی پارتیـزانی و بەرەیی دژ بە سـوپای سـەدام کـە لە ( ١٠٠ ) هەزار ئەفـسـەرو پێشـمـەرگە زیاتر پێک هاتووە، لە سنووری هەمـان ژمـارە پۆلیس و ئاسایش و هێزی بەرگری و جەماوەریش لە خزمەتی هێزەکانی ئەمریکادا بوون، لە پرۆسەی (رزگـاری) عـێراقدا. بە بەراورد کـردنی ئەم هێـزە لە رووی ئەزمـوون و ژمـارەوە، زۆرتر و بە تـواناترە، لە سـوپای زۆر لەو وڵاتانەی کـە لەسـەرەوە ئامـاژەمـان بۆ کـرد. ئەم هێـزە شـان بە شـانی هێـزەکـانی ئەمـریکا لە سنوری ناوچەی چالاکی سوپای ئەمریکی (باکووری عێراق) بەشداری هەمـوو چالاکییەکانی پرۆسەکەی کـردووە بە پێی ئیـمـکانیـات و رۆڵی خـۆی، جگە لە چاو سـاغی و پاراسـتنی بنکەکانی ئەو سوپایە لە رۆژانی گەیشتنیان بۆ کوردستانی ئازاد..

٣- لە بەراوردکـردنی کـوردسـتـانی ئازادو، خـوارو و، ناوەڕاسـتی عـێـراق: سـوپای ئەمریکا لە کـوردستانی ئازادەوە بە هاوکاری هێزەکـانی پێشـمـەرگە و جەماوەری خەڵکی کـوردسـتـان لە شارو شـارۆچکەکانمان، کـە دەکەونە ژێر کۆنتـرۆڵی رژێمی دارمـاوی سـەدام، بێ شـەڕ لە رێـگای نوێنـەرانی کـورد تسلیم بوون بە هێـزی پێشـمـەرگە و پاشـان بە هێـزەکـانی ئەمـریکی. کە چی لە خـواروو و ناوەڕاسـتی عێراق بە زەبروزۆر و بەشەڕ.

٤- تەنها دەزگای ئیداری و خزمەتگوزاری لە سەرتاسەری عێراق، ئیدارات و دەزگا خزمەت گوزاریەکانی کوردستانی ئازاد بوو، کە لە خزمەتی هێزەکانی ئەمریکادا بوون و تەنها ئەو ئیداراتانەیش بوون، کە لە عێراقدا، وەکو خۆی مابووەوەو پارێزراو بوو لە هەموو جۆرە دەستدرێژییەکی تێکدەرانە وەکو تالآن و وێران کردن و خراپەکاری.

٥- لەسەرتاسەری عێراق و بگرە ناوچەکەش تەنها راگەیاندنی کوردستان بوو، نەک هەر لە خزمەتی هێزی رزگارکەری ئەمریکی بوون، بەڵکو بە هەموو کەناڵەکانیەوە، بە تایبەتی کەناڵەکانی تەلەفزیۆنی ئاسمانی، شەڕی ناحەزانی پرۆسەی ئازادی عێراقیان دەکردو، هەمیشە دەنگی زوڵاڵی پرۆسەکە بوون لە سەرەتاوە تاکو ئەمڕۆ.

٦- سەرکردایەتی کورد هەر لە سەرەتای پرۆسەی رزگار کردنی عێراق، خۆی کردە هاوشەریکی ئەمریکاو هاوپەیمانانی، بێ ئەوەی هیچ بەڵێنێکی رەسمی پێ بدرێت سەبارەت بە مافی رەوای خەڵکی کوردستان و ئەم ئازادییەو ئەم ئەزموونە، کە بە خوێن و فرمێسکی سەدەها هەزار شەهید و ملیۆنەها هاوولاتی کورد وەدەست هێنراوە، لەگەڵ ئەم هەموو ئامادەباشی و خزمەت کردنە، ئەمریکاو هاوپەیمانانی حیسابێکی ئەوتۆیان بۆ کورد نەکرد نەک وەکو کێشەو پرس، بەڵکو وەکو هاوپەیمانیش، بگرە لە سەرەتای پرۆسەکە و پاش رمانی رژێم، لە کوردستان و لە کوردەوە دەستی کرد بە هەندێ ئیجرائاتی قەتیس کردنی رۆڵ و قەبارەی لایەنە سیاسییەکان و دەسەلاتی هەردوو ئیدارە. بۆ نموونە:

أ- کە هێزەکانی ئەمریکا لە کورستانی ئازاد جێگیر بوون و، لەوێشەوە حەرکەتیان کرد بۆ ئازاد کردنی شارەکانی کەرکوک و خانقین و مووسڵ و ناوچەکانی تر، رۆڵی هێزەکانی پارتی و یەکێتی هاوپەیمانیان تەحدید کرد: **یەک** : نابێت هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە هێڵی تەماسی نێوان کوردستانی ئازاد و حکومەتی دارماوی سەدام پێش پرۆسەی ئازادکردنی عێراق تێپەڕن. **دووهەم**: نابێت هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان داخیلی ناوچەکانی کوردستان بن کە پێشتر لە ژێر کۆنترۆڵی رژێمی سەدام بوو. **سێیەم**: نابێت دەرکراوەکانی خەڵکی کوردستان بگەڕێنەوە سەر زێدی بابوباپیریان. **بە کورتی نابێت کورد لە**

**هێڵی سەوز کە سنووری هەردوو ئیدارەی کوردستانی ئازادبوو لەگەڵ ڕژێم تاکو ٢٠٠٣/٣/١٩ تێپەڕێت.** هەر ئەم سنوورەشە لە (دەستووری کاتی عێراق) کە لـــە (٢٠٠٤/٣/٨)* ڕاگەیەنرا بە ڕەسمی تەسبیت کرا بۆ "**هەرێمی کوردستان**".

ب- ئەو تەعریبچیانەی کە هەڵهاتن لە کاتی پرۆسەی ڕزگاری عێراق، بە تایبەتی لە ناو کەرکوک و دەوروبەری و لای شێخان و سنجار و زەمار و جەلەولا..هتد. هاندران بگەڕێنەوە بۆ جێگای خۆیان. سەیر لەوەدابوو لە هەندێ لە ناوچەکانی مووسڵ چەند لێپرسراوی کورد، وەکو پیاوەتی بە ئاوی حەمامەوە بکەن، داوایان کرد لە تەعریبچییەکانی ئەو ناوچانە جارێ ڕانەکەن و دەتوانن بە لای کەمەوە ٣ مانگی دیکەش لە جێگای خۆیان بمێننەوە....! بڕیاری وەهاو لە سات و کاتی ئەوسادا خەتاو هەڵەیەکی مێژوویی بوو، دەبوایە ئەوانە بکەوتنایەتە بەر پرسیار و لێپێچانەوەو، ئەو کوردانەیش کە گەڕانەوە بۆ ناو کەرکوک و جێگاکانی خۆیان زۆریان لە ژێر فشاری سوپای ئەمریکا جێگاکانیان چۆڵ کردەوە بۆ تەعریبچییەکان و، هەندێکیان لە نێو شارو شارۆچکەی خۆیان جارێکی تر ئاوارە بوونەوە.

ت- دەسەڵاتی ئەمریکی (هاوپەیمان) لە دامەزرانەوەی دەسەڵاتی خۆماڵی لە کەرکوک و مووسڵ چ حیسابێکی بۆ کورد نەکرد. کورد لە کەرکوک وەکو عەرەب و تورکمان و مەسیحییەکان حیسابی بۆ کرا. لە مووسڵیش زۆر کەمتر لەوە.

ث- پاش دامرکاندنی بارودۆخەکەو ئیعلان کردنی تەواو بوونی شەڕی عێراق لەلایەن (جۆرج بۆش)ەوە، کاربەدەستانی ئەمریکی و هاوپەیمانانی کەوتنە قەدەغەکردنی لایەنێکی زۆرو بەرچاوی چالاکی کوردایەتی، بە تایبەتی بەرز کردنەوەی ئاڵای کوردستان. نووسینی درووشمەکان بە کوردی، کەم کردنەوەی بارەگا حزبی وجەماوەریە کوردستانییەکان، نواندنی ڕەفتاری بێ حورمەتی دەرحەق بە بارەگاکان و کادیرانی لایەنە سیاسیە کوردییەکان، وەکو چەک کردن. منع کردنی لێپرسراوانی حزبی و ئیداری لایەنە کوردییەکان لە ناو شارە کوردستانییەکانی دەرەوەی ئیدارەی حکومەتی هەرێمی کوردستان و ناوچەکانی

* بڕوانە دەقی یاساکە لە پاشکۆی ژمارە «٧» - ل.٢٤٠

تری ئەو دەڤەرانەو، پشکنینیان و مامەڵە کردنیان بە شێوەیەکی وەها، کە لە ناو جەماوەردا سووک و ریسوا و بێ نرخیان بکەن. پشکنینی بارەگاکان و دەست بەسەرا گرتنی چەک و تفاقی ئەو بارەگایانەو کاربەدەستان و مامەڵە کردن لە گەڵیاندا بە شێوەیەکی توندو دوور لە دۆستایەتی و رێز، لە کاتێکدا هەموو شت لای بەرپرسانی ئەمریکی دیاربوو، وەکو ژمارەو جۆری چەک و ناوی بەرپرسان و بارەگاکانیان و.. هتد. شەڕ فرۆشتنی لێپرسراوانی ئەمریکی گەیشتە ئەو رادەیەی لە شارۆچکەیەکی وەکو پردێی نێوان کەرکوک و هەولێر، هێزی ئەمریکی لەشکرکێشی بکات بۆ چێشتخانەیەک لەسەر جادەی ئەو شارۆچکەیە، چونکە ئاڵای کوردستانیان لە سەر ئەو چێشتخانەیە بەرزکردۆتەوەو تابلۆی سەر دیواری چێشتخانەکە بە ناوی (کوردستان) تۆمار کراوە، گەمارۆی چێشتخانەکە درا. ئاڵای کوردستانی بە بێ حورمەتی لە بەرچاو حەشامەتێکی کوردی شارۆچکەکە و بێ ئیزن وەرگرتن لە خاوەنی چێشتخانەو بێ پرسی ئەو هێنایانە خوارەوە. تابلۆکە کە لە سەری نووسرابوو (چێشتخانەی کوردستان) بە بۆیە رەشیان کردەوە. سەرنجی خاوەن چێشتخانەیشیان راکێشا کە ئەگەر دووپاتی بکاتەوە سزا دەدرێت..!
ئێستایش مانگانە زیاتر لە کاربەدەستێکی سوپای مەدەنی ئەمریکا هەر بۆ ئیستفزازی هەست و مشاعیری کورد سەردانی ناوچە بە عەرەب کراوەکانمان دەکەن، وەکو قەزای مەخمور کە هەندێ جاریش پارێزگاری مووسڵیشیان لەگەڵدایە، هەر بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە (مەخمور) سەر بە پارێزگای (مووسڵ)ـە نەک هەولێر، بە ناوی هاوکاری و پشتگیری لە ئاوەدان کردنەوە و بایەخ دان بەم قەزایە، دەبێت کاربەدەستانی قەزاکەو دانیشتووانیشی کۆ بکرێنەوەو، زۆر جار بەزم و هەڵپەڕکێشیان بۆ ساز بکرێت و گوڵبارانیش بکرێن، جگە لە ئامێزگرتن. کە دروست و راست تر وایە: دەبێ هەر کاتێ دێن بۆ ئەو قەزایە کاربەدەستانی ئیدارەی قەزا و گشت جەماوەری شارەکەو دەوروبەری خۆپیشاندان و مان گرتن ساز بکەن، چونکە شارەکەیان ئەنفال کراوەو، بێ هیچ بەڵگەیەکی رەوا خراوەتە سەر مووسڵ!. **پیشاندانی خۆشحاڵی و مەراسیمی ئیستقبال بەو شێوەیە کە کەناڵەکانی راگەیاندن پیشانی ئەدەن، هەڵوێستی کورد بەرامبەر تەعریب و تەزاهوراتی ئەو چەند**

**ئەفسەرە ئەمریکیە بۆ چەسپاندنی ئەو دیاردەیە، لاواز و سووک دەکات**. باشە ئەگەر ئەمریکیەک بەو هەموو گوڵباران و هاوکاری و خزمەتەی کە کورد بۆی دەکات، چاوی تێر نەبێت و بە هیچی نەزانێت، سەرەڕای ئەوەش بێ ڕێز گرتن لە مەشاعیر و هەستی خەڵکی دەڤەرەکەو لەبەر خاتری چەند شۆڤینیەکی عەربی مووسڵاوی کە ڕۆژانە تەقەیان لێ دەکەن و بە گولله و (تی ئین تی) و خۆپیشاندان پێشوازییان لێ دەکەن، ئەڵێین سەرەڕای ئەمە هەمووی، بێن و بەو شێوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت، ئەمە خۆی لە خۆیدا جێگای پرسیارە. ئێمە دڵنیاین خەڵکی مەخمور و گشت شارە بە عەرەب کراوەکانی کوردستان لە ناخەوە لەگەڵ ئەو جۆرە رەفتار و مامەڵە کردنەی چەند کارمەندێکی فرسەت تەڵەب نین. ئەو کات لە ئامێزگرتن و گوڵباران و نیشانە بەخشین قیمەت و نرخی دەبێت ئەگەر بەرامبەر حیساب و بایەخ بۆ هەست و خواستی خەڵکەکە بکات. سەدام و کاربەدەستانی رژێمە گۆڕ بەگۆڕەکەیشی باشتر خەڵاتی ئەوانەیان دەکرد کە ئامادەبوون بەو شێوەیە هەڵسوکەوت لەگەڵ داگیرکارانی خاک و میللەت و کێشە رەواکەی بکەن، زۆر بوون ئەوانەی (نوط الشجاعە)یان وەرگرت، داگیرکردن و مساوەمەت و قەرزدار کردنەوەو نکوڵی کردن لە خواست و هەستی خەڵکی کوردستان لە ناوەڕۆکدا هەر یەکە، با داگیرکەریش ئەمریکا بێت.

کورد هەر لە سەرەتاوە بە پێ خواسی کەوتە داوی ئەمریکا، خۆی کرد بە شەریکی پرۆسەکەی لە عێراق بێ هیچ بەڵێن و پەیمانێکی فەرمی، دواتریش کە بۆی دەرکەوت لە ئەجندەی ئەمریکا بۆ عێراق و ناوچەکە بابەت و کێشەیەک نییە پێی بڵێن کێشەی کورد، روونتر کێشەی کورد و چارەسەرکردنی نە پێش رزگاری عێراق و نە ئێستایش وجوودی نییە لە ئەجندەی ئەمریکا. لەگەڵ ئەوەشدا سوورن لەسەر هەمان سیاسەت، **ئەمریکا لە پرۆسەکەی بۆ عێراق، بە کوردستانیشەوە ستراتیجیەتی خۆی گۆڕی. لە هێزێکی رزگارکەر بۆ هێزێکی داگیرکەر**، لە هەردوو بەشەکەی ئەم ئیستراتیجیەتەش، لەنێو میللەتی ئەمریکاو هێزەکانی دووبەرەکی و رەخنە و ناڕەزایی هەیە، بگرە لە خودی ئیدارەی (بۆش)یشدا کۆمەڵێک گیروگرفت و رکابەری و دژایەتی ئەم سیاسەتە ناشاراوە نییە. (پۆڵ بریمەر) خۆی لە قسەو

نووسینەکانیدا کە بڵاوی دەکاتەوە، باسی گرفت و هەڵەکانی داگیر کردنی عێراق دەکات و ئەڵێت: (لا أحد یحب الاحتلال) لە مانگی/٨/ی ساڵی ٢٠٠٣ لە نامەیەکی هەفتانەی بۆ گەلی عێراق بریمەر بۆ نموونە ئەڵێت: (ان الوضع سوف یتغیر، وأن الحالة الراهنة لن تدوم، وأن الأزمة ستتجلی مع الأدراك أن من الصعب الحفاظ علی کرامة الأنسان عندما تکون قوات أجنبیة تجوب الشوارع مهما تکن نوایا تلك القوات ..) .یان سیناتور ادوارد کەنەدی برای جۆن کەنەدی سەرۆکی پێشووتری ئەمریکا لە نووسینێکی کە لەرۆژنامەی (الشرق الاوسط) بڵاوکرایەوە ئەڵێت: (قبل عام من الان، شنت الولایات المتحدة حربا علی العراق، لأن الرئیس بوش وإدارته أقنعوا الکونغرس بأن صدام حسین یمثل خطرا ماثلا یقتضي المواجهة العاجلة. وقد دفعت الامة ثمنا باهظا نتیجة هذا القرار. استند الدفاع عن خوض الحرب علی سببین اساسیین: ان صدام علی وشك الحصول علی اسلحة نوویة، وأن لدیه علاقات قویة مع إرهابیي القاعدة الذین نفذوا فضائع ١١ سبتمبر ٢٠٠١. وقد اتضح بالأدلة القاطعة أن الزعیمان کاذبان). بڕوانە کتێبەکەی (ریچارد کلارک)ی مونەسقی بەربەرەکانێی ئیرهاب لە کۆشکی سپی ئەمریکی، کە بە ناوونیشانی (ڕووبەڕووی نەیاران) کە لەم ماوەیدا لە ئەمریکا بڵاوکراوەتەوەو رۆژنامەی ( الشرق الاوسط) لایەنێکی لێ بڵاوکردەوە. لە کتێبەکەی (کلارک) بە درێژی باسی شەڕی دژی ئیرهاب دەکات و تیشک دەخاتە سەر لایەنێکی هەرە گرنگی شەڕی خودی نێو ئیدارەی بوش، ئەو هەوڵانەی کە لە پشت پەردەو، لە کلیدۆرەکانی کۆشکی سپی ئەنجام درا. رۆژی ٢٠٠٤/٤/٧ (فهمی هویدی) لە هەمان رۆژنامەدا و لە ستونی ( الرأی) بابەتێکی بڵاوکردوەتەوە تێیدا ئاماژە بە لایەنێکی گرنگی کتێبی (کلارک) دەکات و (هویدی) دەڵێت :
(في فصل عرض فیه المؤلف ما جری داخل کوالیس البیت الابیض وفي الیوم التالي مباشرة للهجوم علی مرکز التجارة العالمي ذکر کلارك ما یلي توقعت ـ یوم ١٢ سبتمبر ـ ان اعود الی سلسلة من الاجتماعات للوقوف علی طبیعة اي هجمات اخری محتملة ومناقشة الاهداف (الامریکیة) المعرضة للخطر، وبدلا من ذلك دخلت في سلسلة من المناقشات حول العراق، وادرکت ان رامسفیلد ونائبه وولفویتز سیحاولان الاستفادة من المأساة القومیة للترویج لاجندتهما الخاصة بالعراق. فقد ظل کلاهما منذ قدوم ادارة بوش یضغط لشن حرب علی العراق.

وقال لي اصدقاء في البنتاجون (وزارة الدفاع) ان الولايات المتحدة ربما تغزو العراق في وقت ما خلال عام ٢٠٠٢م.

اضاف: لم يكن تركيز وزارة الدفاع صباح يوم ١٢ سبتمبر منصبا على تنظيم القاعدة، رغم ان وكالة الاستخبارات المركزية اكدت انه من دبر الهجمات، الا ان وولفويتز لم يقتنع بذلك، وقال ان الهجمات اتبعت اسلوبا معقدا ومتقدما، يتجاوز قدرة اي جماعة ارهابية، واذا ما أرادت أي جماعة ان تقوم بها فان الامر يتطلب مساعدة من دولة هي العراق على الأرجح. وكان وولفويتز قد قال الكلام ذاته في اجتماع لمناقشة قضية الارهاب عقد في شهر ابريل عام ٢٠٠١، عقب تولي الرئيس بوش مهام منصبه (وقبل احداث سبتمبر) وفيه طالب كلارك باتخاذ اجراء ضد تنظيم القاعدة، وهنا انبرى وولفويتز قائلا ان التركيز على القاعدة تفكير خاطئ، وانما ينبغي تعقب الارهاب الذي يرعاه العراق. وفي الاجتماع رفض وولفويتز تأكيد كلارك وتأكيد الاستخبارات المركزية على انه لم يكن هناك ارهاب ممول من العراق ضد الولايات المتحدة منذ عام ١٩٩٣م.

ظهر يوم ١٢ سبتمبر - والكلام لايزال لريتشارد كلارك - كان الوزير رامسفيلد يتحدث عن توسيع اهداف رد الولايات المتحدة على الهجوم الذي تعرضت له، والالتفات في ذلك الى العراق، الا ان كولن باول حث المشاركين على التركيز على تنظيم القاعدة، وهو ما دعا كلارك الي الترحيب بهذا الرأي وقوله ان مهاجمة العراق، ردا على هجوم تعرضنا له من جانب تنظيم القاعدة، سيكون تماما مثل غزو الولايات المتحدة للمكسيك بعد هجوم اليابانيين علينا في بيرل هاربور(!)

في وقت لاحق من نفس اليوم شكا رامسفيلد من عدم وجود اهداف مناسبة للقصف في افغانستان، وقال انه يجب ان ندرس قصف العراق بدلا من افغانستان، لان لديه اهدافا افضل، وهو ما علق عليه كلارك قائلا: اعتقدت في البداية ان رامسفيلد يمزح، لكنني تأكدت انه كان جادا، كما ان الرئيس لم يرفض فكرة مهاجمة العراق. وبدلا من استبعاد الفكرة فورا، فان بوش اشار الى ان ما نحتاج اليه في العراق هو تغيير حكومته، وليس قصفه بالمزيد من صواريخ كروز، كما قال رامسفيلد.

استطرد كلارك في شهادته قائلا: في وقت متأخر من مساء ١٢ سبتمبر جمعهم الرئيس بوش في غرفة المؤتمرات وطالبهم بان يراجعوا كل شيء، وان يتأكدوا مما اذا كان صدام حسين هو الذي دبر الهجمات، وكرر هذا التوجه مرة ثانية.
حسب كلامه، فان كلارك اصيب بالدهشة، وقال للرئيس بوش ان تنظيم القاعدة هو الذي فعلها، فكان رده: اعرف ذلك. اعرف ذلك، راجعوا ما حدث و تأكدوا مما اذا كان صدام حسين متورطا.
ازاء ذلك لم يملك كلارك الا ان يقول للرئيس انه سيعيد النظر مرة اخرى، لكنه ابلغه في الوقت ذاته بأن مسألة العلاقة بين القاعدة والعراق بحثت اكثر من مرة من جانب جهات عدة، واكد الجميع ان تلك العلاقة غير قائمة، وحينئذ رد الرئيس الامريكي قائلا: انظروا في امر العراق وصدام. ثم انصرف.
وهو يصف تلك اللحظة قال كلارك ان كونداليزا رايس مستشارة الامن القومي التي كانت تقف اثناء الحديث خلف الرئيس عقدت الدهشة لسانها وتطلعت اليه بفم مفتوح من المفاجأة، وهي الدهشة التي اصابت كل معاوني الرئيس الذين سمعوا كلامه، وحين دخل عليهم احد زملائهم وهم في حالتهم تلك، لاحظ الوجوم والدهشة على وجوههم، فاستغرب وسأل ما الذي يجري هنا ؟ فردت كونداليزا قائلة: لقد تمكن منه وولفويتز .. انتهت الشهادة.)

(داوای لێبووردن دەکەم کە ناچارم جار جار دەقی هەندێ درێژ) تۆمار بکەم مەبەستیش زیاتر بۆ ئەوەیە کە خوێنەرانی بەڕێز بخەینە نێو چوارچێوەی وێنەکەوە)

**بۆ ئەوەی لە تەسبیت کردن و گەڕانەوە بۆ ئەم دەقەی (کلارک)و ئەوانەی تر، خراپ لێم تێنەگەن، پێشەکی وەکو کوردێک دەستخۆشی لەو راو بۆچونانە دەکەم لە ئیدارەی ئەمریکی و غەیرە ئەمریکی هەوڵی لێدان و نەمانی سەدامیان داوە، ئەوەیش کرا دژی ئەم رژێمە لە قۆناغی رزگاری عێراق و نەمانی رژێمی سەدام و هەڵوەشاندنەوەی دام و دەزگا و بیروبۆچونیان کارێکی گرنگ و پیرۆزە چی بێت هۆ و هۆکاری.**

بەڵام مەبەستم لەم دەقانە ئەوەیە کە چۆن خەڵکی بۆ بەرژەوەندی کێشەی وڵاتی خۆی بیر دەکاتەوەو کار دەکات و راستییەکان دەخاتە روو، ئەگەر چی تاڵ و ناخۆشیش بێت.

باشه بۆ ئێمەی کورد، پاش ئەو هەموو سەراو دەراوە و ئەو شێوە مامەڵە کردنەو وەلاوە نانەوەی داخوازییەکانمان، هەر دەبێت (**کەوڵ سووری پێش لەشکر بین**)...؟ وەکو گوتمان قۆناغی لە ئامێزگرتن و گوڵباران باش بوو، بەڵام بەسەرچوو، ئێستا کاتی چەسپاندنی مافەکانمانە، رازی کردنی ئەفسەرێکی ئەمریکی لێرە ولەوێ هیچ لە کێشەکە ناگۆڕێت، ئەوانە ئەفسەرو کارمەندن، بەرنامەی خۆیان هەیە، بۆ یەک تۆزقالێکیش ئەو جۆرە مامەڵەکردنە تەئسیر ناکات لەسەریان. **ئەوانە جێبەجێ کەرن.** ئەوەی بۆیان دادەدنرێت ئەوە پیادە دەکەن و کێشەی خۆیان هەیە، بۆ رەوا بێت بۆ ئەوانە، چی وەکو تاک و چی وەکو دەسەلات، پەنا بەرن بۆ ئێمە بۆ هاوکاری کردن و خزمەت کردنی مەرام و ئامانج و ئیستراتیجیەتەکەیان، بەرامبەر بە هیچ بەڵگەیەکی رەسمی، **ئەی بۆ رەوا نەبێت بۆ ئێمەی غەدر لێ کراو و بەش خوراو و پشتگوێ خراو پێیان بڵێین نە...!** .خەڵکی کە خۆی هەرزان فرۆش بکات سووک دەبێت و کە خۆی سووک کرد لاوازتر دەبێ و ئەوەندەش حیسابی بۆ ناکرێت، ئەمریکا لەسەر قوەت و خۆ فەرزکردن و غەدری مێژوویی دروست و گەورە بووە. بۆ خەڵکی خۆی بۆ بەرژەوەندی باڵای میللەتی خۆی، دریغی ناکات و سنووری بۆ نییە، ئەو بە ئەندازەی **خۆی جلەومان دەگرێت و تەهمیشمان دەکات، حەقە ئێمەش بە ئەندازەی خۆمان بە قەد رەوایی کێشەکەمان و تەزحیەمان بەرۆکی بگرین و** رووبەرووی ببینەوە. ئەمریکا راستە تاکە هێزی گەورەی ئەم سەرزەویەیە، ئێمەش لەسەر خاکی خۆمان و لە ولاتی خۆمان و لە ناو میللەتی خۆمان تەنها هێزی کاریگەرو بزوێنەری ئەو جەماوەرەین و قولاییەکی کوردستانی و نەتەوایەتیمان هەیە و بە هەزارەها کوردی تێکۆشەر و ولات پارێزمان لە ئەوروپا و ئەمریکا لەگەڵدایە. دەبێت ئەمریکا و میللەتەکەشی و دونیا ئاگادار بێت ئەمریکا بۆ چەند جار دەستی کوردی بڕیوە رۆڵی گەورەی هەبووە لەو کارەساتانە کە بە سەر کورددا هاتووە و تاکو ئێستاش هیچی وەهای نییە بۆ میللەتەکەمان. ئەمەیش دژی خواست و ویستی گەلەکەمانە و ناگونجێت لەگەڵ نامەی ئەمریکاو بەڵێنەکانی ئیدارەکەی و، بەراوردیش ناکرێت لەگەڵ قوربانییەکانمان وئەم سیاسەتە خەتەرناکە بۆ ئێستا و بۆ ئایندەمان و بۆ ناوچەکەش. **لە روانگەی رووداوەکانی ئەمرۆ و هەڵوێستی ئەمریکاو، دوا رۆژی کێشەکەمان وچیمان دەوێت، لای ئەمریکا گرنگ نییە، بەڵکو چیمان پێ دەکرێت. دیارە تاکو ئێستاش وەکو پێویست پیشانمان نەداوە چیمان پێ**

**ئەکرێت!، دوور نییە کاتی ئەوەش هاتووە کورد خۆی ئامادە بکات بۆ ئەوەی رووبەڕووی ئەو قۆناغە ببێتەوە.**

٧- لە ئەمریکا و لە دۆستانی ئەمریکا و دۆستانی ئەمریکیمان ئەوە قەبووڵ دەکەین کە بە هۆی پاراستنی ئەمریکا و هاوپەیمانانی ئەم ئەزموونەمان لە دایک بووە و گەیشتینە ئەم قۆناغە. هەروەها ئەگەر ئەمریکا نەدەبوو، رزگاری عێراق و نەمانی سەدام دوور بوو، ئەگەر موحاڵ نەبایە. لە هەموو ئاستێک، خەڵکی کوردستان بە بۆنەو بە بێ بۆنە سوپاسگوزاریی خۆی گەیاندۆتە ئەمریکاو میللەتی ئەمریکاو هاوپەیمانانی، بەڵام ئێمەیش جگە لەوانەی کە باسمان کرد زۆر شتمان لە پێناوی هاوپەیمانیەتی ئەمریکا و سەرکەوتنی پرۆسەی ئەمریکا لە عێراق و بەرژەوەندی ئەمریکا لە دەست داوە:

١- هەنگاوی یەکەمی پرۆسەی داگیرکردنی عێراق لە کوردستانەوە دەستی پێ کرد، جاری یەکەم و لەسەرەتای بەهاری ساڵی رابردوو، هێزەکانی ئەمریکا لە سنووری تورکیاوە داخلی کوردستان بوون و لە نێو خاکی کوردستانی ئازاددا بنکەکانی سوپایی و سیخوڕی خۆیان دامەزراند بە زەمینی و ئاسمانییەوە . بەو داگیرکردنەش سەربەستی راستەقینەی ١١ ساڵەی دەسەڵاتی کوردستانی ئازادمان لەدەست دا، (ئەگەر چی گشت توێژە جیاجیاکانی خەڵکی کوردستانی بەشەرف لەگەڵ هاتنی سوپای ئەمریکا و هاوپەیمانانی بوون بۆ عێراق بە کوردستانیشەوە)، نموونەمان لەبەر دەستدایە لەمەڕ چۆنیەتی (لەدەست) دانی ئەو (سەربەستییە)ی کە هەمان بوو وەکو دەسەڵات. لەگەڵ ئەوەش وەکو ئاماژەمان بۆ کرد خەڵکی کوردستان بە گوڵ و بە ئامێزی گەرم پێشوازی لە سوپای ئەمریکا دەکرد، کە چی لە ناوەڕاست و خوارووی عێراق بە تۆپ و گولەو خۆپیشاندان و نارەزایی پێشوازییان لێ دەکرد و ئەفسەر و سەربازێکی زۆریان لێ کوشت و بریندار کردو، تاکو ئەمڕۆ پرۆسەی بەربەرەکانێ لەو ناوچانە بەردەوامە و لە زیاد بووندایە و بە پێی سەرژمێری خودی ئەمریکییەکان تاکو کۆتایی ساڵی رابردوو، **رۆژانە، ئیرهابیە عەرەبەکان و ئەوانەی کە بەربەرەکانێی هێزەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانانی دەکەن، لە ناوەڕاست و خوارووی عێراق**

**(٣٠-٣٥) کردەوەی، تیرۆر، یان بەرهەڵستکاری، دژی سوپای ئەمریکا و هاوپەیمانان ئەنجام دراوە.**

٧- بەم هاوپەیمانیەتیەو ئەو پێشوازییە و گوڵباران و هاوکاری و پشتیوانی سیاسی و سوپایی و خزمەتگوزاریەی کوردستان، **توێژێکی گەورە لە گەلی عەرەبی عێراق و حکومەتەکانی عەرەبی و ئیقلیمیمان لە خۆ ئاڵوز کردووە**. هەروەها ڕێژەیەکی گەورەی جادەی عەرەبی (زیاتر لە ٣٠٠ ملیۆن) و لە ئێران و تورکیایش، بە نۆکەر و دەستکردی ئەمریکامان لە قەڵەم ئەدەن و، **هیچ کات بەقەد ئێستا جادەی عەرەبی عێراق دژ بە کورد نەبووەو، ئەوەی بە سەدەها ساڵە ڕەچاومان کردووەو هەوڵی پاراستنمان داوە و خۆمان لێ دوور خستوەتەوە، وا بە چەند مانگێک لە دەستمان دا.**

٨- ئەگەر مرۆڤ تەماشای هاوکێشەکە بکات وەکو زۆر لە چاودێرە سیاسیەکان بۆی دەچن (جگە لە توێژێکی فراوانی ئەمریکا و ئیسرائیل و کورد) هیچ دەسەلاتێک یا ولاتێک نییە بە دڵ و بە گیان لە پشت ئەم ڕۆڵەی ئەمریکا بێت لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، بە هاوپەیمانەکانیشیەوە، وەکو بەریتانیا و ئەوروپاییەکان، **کێشەی کەڵەگایی ئەمریکا و دامەزراندنی یەک دەسەلاتی کەونی، گونجاو نییە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی نێودەوڵەتی و ئیقلیمی و نیشتمانی**.. مێژوو نموونەی یەک ئیمپراتۆریەت، یەک جەمسەر، یەک دەسەلاتی تۆمار نەکردوە، کە حاکمی دونیا بێت و چارەنووسی دونیا لە **چوارچێوەی بەرژەوەندی ئەودا بێت**، یەک دەسەلات و یەک جەمسەریی دیاردەیەکی ناسرووشتیە..تەنها (**بۆ خوا باشە**)، مرۆڤ و ڕەوتی مرۆڤایەتی لە مێژەوە ئیمپریالیەتی کەونی ڕەدکردۆتەوەو، ئێستاش و ئایندەیش هەروەها دەبێت، با ئەو ئیمپریالیەتە (**ئیمپریالیەتێکی کراس پۆشی دیموکراتی ومافی مروڤ ئاسا**)یش بێت!.

٩- ئەم هاوپەیمانیەتیەی سەرکردایەتی کورد لە کوردستانی عێراق لەگەڵ ئەمریکا، هەر وەکو چۆن پێناسە کراوە، لە ڕووی تیوری چۆن یەک نییە لەڕووی تەرازووی هێزو ڕۆڵ و ئامانجەکان، ئەگەر چی بە ڕواڵەت هەندێ خاڵی بەرژەوەندی هاوبەش لە نێوانیاندا بە دی دەکرێت)، هەروەها لە پراکتیکدا ئەم

هاوپەیمانییە لە روانگەی دید و بەرژەوەندی باڵای خەڵکی کوردستانەوە هێچ جۆرە سوودێکی بنەڕەتی وەهای نییە بۆ کێشەکەی، ئەو لایەنە پۆزەتیڤانەش کە هەیە، (ئەگەر سەرکردایەتی سیاسی کورد ورد و هوشیارو دوور بین نەبێت، دوور نییە نرخەکەی بە قورسی لە سەر کورد بکەوێت. وەکو ئامارژەمان بۆ کرد لە سەرەوە: وێنەی کورد و کێشە رەواکەی لە عێراق بە هۆی بەرەلایی و رەفتاری دوور لە نەریتی کوردایەتی و مرۆڤایەتی توخمێکی خۆپەرست و فرسەت تەلەب لە مووسڵ و کەرکوک و، بەغدا بە تایبەتی و، هاوپەیمانیەتی سوپای ئەمریکی هەر وەکو راگەیاندنی خۆماڵی و جیهانی پیشانی ئەدات لەبەرچاوی جادەی ولاتانی عەرەبی و ئیقلیمی لەگەڵ ئەقلیەت و نەفەسی دەمارگیری نەتەوایەتی و شۆڤینزمی، وای کردووە کە ئەوەی رژێمە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق بە تایبەتی رژێمی بەدناوی سەدامی خوێنرێژ پێی نەکرا لەم بارەیەوە بیسەلمێنێت، ئەوە لە قۆناغی داگیرکردنی عێراق لای توێژێکی گەورەو فراوانی جادەی عێراقی و عەرەبی جێگر بێت؛ تەسبیت کردنی، یان رەنگدانەوەی ئەو وێنەیە لەسەر بۆچوون و بنەمایەکی نادروستە، خەتایەکی گەورەیە بە خەبات و مێژووی کۆن و نوێ و دوارۆژی دۆزەکەمانە، چەند پاساوی ئەم هەڵوێستە بدەینەوە کە لە جادەی عەرەبی، یان ئیقلیمی، یان ئیسلامی دروست بووە دژ بە کورد، هێشتا بێ هودەیە، **ئەوان زۆر و ئێمە کەم، ئەوان بە ئیمکانات و ئێمە بێ ئیمکانات. ئێمەی خاوەن ماف و زۆرلێکراو و خەفەکراو، ئەوان نەیار و چەواشەکەر**، بەڵام بۆ بەڵگەی وەها بە دەستەوە بدەین کە داشی ئەو نەیارانەمانە سوار بێت و بتوانن زۆرینەیەک لە خەڵکی خۆیان چەواشە بکەن، کێشەو میللەتەکمان لەکەدار کەن !.

١٠- بەو داگیر کردنەی ئەمریکاو، لە پێناو یەکێتی خاکی عێراق، سەربەخۆیی و ئازادی کوردستانی ئازادمان لەدەست دا،...! . یەکێتی خاکی عێراق بە مانای چەسپاندن و بەهێز کردنی دەسەلاتی ناوەند!. ئەو ناوەندەی کە کوردی تێدا کەمینەیەو برای عەرەبی بالادەستمان زۆرینەیە. بۆ ١٢ ساڵ ئەچێت کوردستانی ئازاد بە بڕیاری خودی رژێمی دارماوی پێشوو دابڕابوو لە بەغدا، هێزو ئیدارەی لە کوردستان کشانەوەو، ئابڵوقەی ئابووری و سیاسی خستە سەر و هەموو جۆرە بەربەرەکانییەکی دەکرد، بە تەقینەوەو تۆقاندن و هەڕەشە و هێرشی

سـوپاییش...! **کورد له نێوان گشت هێزه بەرهەڵستکارەکانی عێراق تەنها** زەرەرمەند بوو لەپرۆسەی ئازادی عێراق لە **رووی ئازادی و سەربەخۆیی و پیادە کردنی مافەکانی. لە پێناوی یەکگرتنی دەسەلاتی سەرتاسەری عێراق. ئێمەی کورد مافی بڕیاری:**

١- یاسـادانانمان لەدەست دا. بەبڕیارێکی بریمەر هەمـوو یاسـاو رێسـاکـانمان هەڵدەوەشـێنێـتـەوە، لەوە زیاتریش بۆمـان نییـە یاسـاو بڕیارەکـانی بریمەر نە رابگرین و نە رەدی بکەینەوەو نە چاکسازی لەسەر بکەین.

٢- دەسـەلاتی هەردوو ئیـدارەی (سلێـمـانی و هەولێـر) بە عـەمـەلی سنووردارەو، تەعـاملی بریمەر لەگـەڵ هەردوو ئیـدارە لە رێگای پارێزگـاکـانەوەیە. راسـتـە دەڵێن، یان بڕیاریـان داوە تایبەتمەندی (خصوصیە) کوردسـتـان رەچاو بکرێت، بەلام ئەویش وەکـو فـیـدرالّـیـەتەکـمـانە، درووشـمـێکەو ورد نەکـراوەتەوە، خەفەگیرمان دەکەن تاکو قۆناغی کاتیی تەواو دەبێت، ئەو کات ئێمەو زۆرینەی عـەرەبی عـێـراقی (بالادەست) رووبەرووی یەکـتـر دەبینەوە...! لە زۆر بواردا دەسەلاتی ناوەندی لە بەغدا لەگەڵ هەرێمی کوردستـان وەکو جارانی حکومەتی گـۆڕبەگـۆڕی سـەدام مـامـەڵە دەکـات ...! واتە سـاغ کـردنەوەی ئەم کـێشـەیەی تەرک کـراوە بۆ دوا رۆژ، واتە بۆ پاش دەسـتـووری دائم و هەڵـبژاردنی گـشـتی. هەمـوو لایەکـمـان دەزانین رووداوەکـانی پێشـوو وا پیشـانیـان داوە هەڵپەسـاردنی کـێـشـەی وەها بۆ دوا رۆژ، بە زەرەرمـان شـکاوەتەوە. بەشی کـورد لە رێککەوتننامەی (سیـڤەر) کە دواخرا (لوزان)ی لێ دەرچوو. کە کێشەی کـورد حەسم نەبوو لە (لوزان)، کوردسـتـانی عێراق دژ بە رەغبـەتی کورد لکێندرایەوە بە بەشی عەربی بەغدا، واتە ( عێراق )ی ئەمڕۆ. کە ئەم عێراقەش پێش زیاتر لە ٨٠ سـاڵ داتاشـراو چەند مـەرجێکی بۆ دانرا سـەبارەت بە مـافی کـورد. کـە کورد سوور نەبوو لە سەری، تەرک کرا بۆ کات، لە بیر چووەوەو پشتگوێ خرا. زەقـتـرین نموونە رێککەوتننامـەی ١١/ئازاری سـاڵی ١٩٧٠ بوو. کـە هەمـان کێشەی ئەمڕۆمـان سەبارەت بە سنووری کـوردستـان دواخرا بۆ چوار ساڵ و پاش سـەرژمێـری بڕیار لە چارەنووسی ناوچەکـانی تەعریب بدرێت، پاش چوار سـاڵە کە شۆڕشی کورد لاواز دەبوو ناوەندی بەغدا وەکو دەسەلات بە هێز و بە تواناتر دەبوو، شەڕی ١٩٧٤ بەرپا بوو، سـاڵی ١٩٧٥ ئەوەیش کە بە دەستـەوە بوو لە

کــوردســتــانــی ئازاد دۆڕانمان و تووشی گــەورەترین نسکۆ بووین. هەر ئەو ئەمریکایە کە هاندەر و پشتیوانی سەرکردایەتی سیاسی کورد بوو لە سالانی حەفتاکانی سەدەی رابردوو، نەخشەکێش و سودمەندبوون لە نسکۆ شوومەکەی ٦ ی/ ئازاری سالی ١٩٧٥، هەر ئەمانە، وەکو پێشتر باسمان کرد، پشت و پەنای سەدام بوون و، پێش رزگاری عێراق ئەمریکا و هاوپەیمانانی و هێزێکی زۆر لە بەرهەلستکارانی عێراق و هاوپەیمانانی دوێنێمان و شەرێکی دەسەلاتی ئەمڕۆمان، کۆک بوون لە سەر بڕیاری مافی چارەنووسی کورد، هەندێکیان داوای سەربەخۆیی کوردستانیان دەکرد. کە چی ئەمڕۆ هەر ئەوانن ئەو فیدرالیەتەی کە کورد بڕیاری لەسەر داوەو خواستویەتی رەد دەکەنەوە، یان هەندێکیان و ئەمریکا پێشنیاری فیدرالیەتی پارێزگاکانمان بۆ دەکەن..!. بۆیە دواخستنی ئەم کێشەیە لە قازانجی کورد نییە: پاش ماوەیەک و رۆژ لە دوای رۆژ، ئەمن و ئاسایش سەقامگیرتر دەبێت. دەسەلاتی ناوەند توکمە و بەهێزو یەکگرتووتر دەبێت. ئەمریکا و هاوپەیمانانی زیاتر بە لای ئەواندا دەشکێنەوە. پرۆسەی ئەمریکا بۆ رۆژهەلاتی گەورە ئەگەر ئەسل و ئەساسی هەبێت، لە رووی هاوکێشەی هێز و بەرژەوەندی و موقیع لە قازانجی عەرەبی بالادەست و هێزو نەتەوەکانی بالادەستی دەوروبەرمانن. **بە کورتی هەموو لایەنەکانی هاوکێشەکە لەگەل کاتدا بە هێز دەبێت، تەنها کورد نەبێت ...!**

٣- پەیوەندی دەرەوەمان نەما، نە لەگەل ولاتانی ئیقلیمی و نە بە ئەورووپاو نە ئەمریکا، چ وەکو لایەنەکانی سیاسی و چ حکومەت و، کەسیش ئامادە نییە وەکو جاران حیسابمان بۆ بکات .ئەوەش کە ماوە و جاروبار پێی هەلدەستن، پەیوەندی بە باری نا ئارامی و یەکلا نەبوونەوەی دەسەلات و فشاری باردوخەکە و راگرتنی تەوازناتی نێوخۆ و دەرەوەیانەوە هەیە، نەک لەبەر چاوی رەشی کورد...

٤- سەربەخۆیی ئابووریمان لەدەست دا، چی پەیوەندی بە بازرگانی دەرەوە هەبێت قەدەغە کراوە، یان لە حوکمی ئەوەدایە. هەردوو ئیدارە ناتوانن باج و رسوماتی ناوخۆییش کۆ بکەنەوە بە پێی یاساو بڕیارەکانی جارانیان و، بودجەی کوردستانی ئازاد لەسەر ئەساسی (٣) پارێزگا (سلێمانی و هەولێرو دهۆک)

لەلایەن دەسەڵاتی مەدەنی هاوپەیمانان لە بەغدا دیاری دەکرێت وەکو هەر پارێزگایەکی تری عێراق.....هتد

٥- پاراستنی شارو شارۆچەکە سنوورییەکان کە پێش ئێستا ئەرکی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بوو، ئێستا مەسەلەی یەکەم و سەرەکی هێزەکانی هاوپەیمانان بە تایبەتی ئەمریکی پێی هەڵدەستێت. هێزی پێشمەرگە (تقلیص) دەکرێ و دابەش دەکرێ بەو رێژەیەی کە ئەمریکا و دەسەڵاتی مەدەنی بڕیاری لەسەر داوە....

٦- ١١ ساڵ، کوردستانی ئازاد دراوی تایبەتی خۆی هەبوو، ئەگەر چی دراوەکە عێراقی و بە چاپی سویسری ناسراو بوو، بەڵام لە کوردستانی ئازاد بە رەسمی دراوی هەردوو ئیدارە بوو، پاش نەمانی رژێمی سەدام هەڵوەشایەوەو دراوێکی تریان خستە جێگای، بێ هیچ لێکدانەوەیەک لە ئاسەواری ئابووری و جموجۆڵی بازاڕ. یەک لە ئەنجامە نێگەتیڤەکانی ئەو هەنگاوە دروست بوونی دیاردەی هەڵئاوسانی ئابووری(التضخم ) و شڵەژاندنی بازاڕی کوردستان بوو.

٧- کوردستان بە بڕیاری پەرلەمانە هەڵبژێردراوەکەی ئاڵای خۆی هەیە، لە هەموو موناسەبەو ئاهەنگەکاندا لە شارو شارۆچەکەکانی کوردستان بەرز دەکرایەوە و یەک لە دەستکەوتە مەزنەکانی قۆناغی کوردستانی ئازاد بوو، دەسەڵاتی هاوپەیمانان و، لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان گیروگرفتی بۆ دروست دەکەن و لە هەندێکیش قەدەغە کراوە، ئاڵاکەمان بە پێی بڕیاری پەرلەمان دەرچووەو، بە پێی یاسای (بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی) دانیان پێ ناوەو، ئەو ئاڵایە لای هەموو خەڵکی کوردستان پیرۆزە، باشە بۆ لەبەر خاتری چەند کەسێکی رەگەز پەرست و شۆفینیزم کە چاویان بەم ئاڵایەدا هەڵنایە لێرە، یان لەوێ ئەمریکا بە هەموو گرانی خۆیەوە بێتە سەر خەت و مەنعی بکات. بەڵام ئاڵای عێراق هەر ئاڵای سەدامەو، بۆ ئێمەی کورد کە زیاتر ٧-٨ ملیۆن کەسین هێمای داگیرکردن و ئەنفال و کیمیاباران و تەعریب و راگوێزانە. هەروەها دوور نییە بە قەد ئەوەیش خەڵکی عەرەب وتورکمان و کلدۆئاشوور لە ژێر سێبەری ئەو پەرچەمەدا تووشی زەرەر و زیان بوونەو لە ژێر ئەو ئاڵایەدا سەدامی خوێنڕێژ هەزارەها تاوانی ئەنجام داوە، کەچی ئەمریکا رەچاوی هەست

و هەڵوێستی ئەو هەموو خەڵکە ناکات، مەنعی ئەو ئاڵایە ناکات، وەکو پاساو ئەدرێتەوە گوایە ئەمە ئاڵای دەوڵەتی عێراقە، کەچی عێراق وەکو دەوڵەت داگیر کراوەو هەڵوەشاوەتەوەو ئەو ئاڵایە بە پێی دەستووری کاتی عێراق و بڕیاری سەدام داندراوەو، هەردووش ئیلغا کراوەتەوەو کاری پێ ناکرێت و سەدامیش وەکو (تاوانبار) دەستگیر کراوەو نیزامەکەشی رماو نەما..!

٨- دەسەڵاتی هاوپەیمانی مەدەنی لە عێراق و ئەفسەرانی لە کوردستان و سەرانی ئەمریکا بە بەڕێز (جورج بۆش)ەوە، یەکێتی خاکی عێراق و قوودسیەتی سنووری بووەتە وێردی سەر زبانیان، لە کاتێکدا کەسێکی عێراقی و بە تایبەتی سەرکردایەتی سیاسی کورد (کە مەبەستیانیش هەر کوردە) باسی جیابوونەوەو ناقودسیەتی سنووری عێراقیان نەکردووە، بوختانییەکە کە ناراستەوخۆ دەیخەنە پاڵی و، چەکێکە ئەدرێت بە عەرەبی عێراقی و وڵاتانی عەرەب، بۆ دەم کوتکردنی کورد و هەر هاووڵاتی و هێزێکی بەشەرف کە داکۆکی لە خواستی ئەمڕۆی کورد بکات. بۆ سنووری عێراق موقەدەس بێت و نابێت دەستکاری بکرێت. کە چی بۆ ئێمەی کورد، سنووری کوردستانی، کە لە چوارچێوەی ئەو عێراقەیشەو، بە زۆر و غەدر پێوە گرێدراوە، نابێت موقەدەس بێت....!. ئەگەر سنووری عێراق موقەدەس و پیرۆزە، باشە بۆ ئەمریکا ئەو قوودسیەتەی شکاند و پێشێلی کرد، بۆ ئێران و تورکیا و سوریا چی حورمەتی لێ ناگرن. پێش و ئێستایش رۆژانە قوودسیەتی دەشکێنن...!. بەزاندنی سنووری سۆڤیەتی جاران و بگرە وڵاتانی فیدراڵی و ئۆتۆنۆمی ئەو ئیمپراتۆریەتە و دابەش کردنی لەسەر ئەساسی نەتەوایەتی و بوونیان بە دەوڵەتی سەربەخۆ و خاوەن سنووری نەتەوایەتی خۆیان بۆ گوناه نەبوو. ئەوە یوگۆسلافیای کۆن و دابەش کردنی بۆ چەند وڵاتێکی سەربەخۆ، پێشتر سنووری پاکستان خەرق کرا و بەنگلادیش دروست بوو، بۆ سنووری ئەندونیسیا موقەدەس نەبوو کە کۆماری تیمۆری شەرقی لێی جیابووەوە...! ئەم هەموو مشتوومرە بۆچی و لە پای چی..؟! زۆر لەو وڵاتانە لە کوردستان گەورەترو بە نفووستر و هەندێکیشیان بە قەد یەک قەزای ئێمەیش نابن وەک (کفری، خانەقین، مەندەلی و سنجار)، بگرە لە ناحیەیەکی یەک لەو قەزایانەش بچووکترن، قودسیەتی سنووریان شکاندو، ئێستا وڵاتن. ئەمریکا هەموو

عێراقی داگیر کردووەو، وا خەریکە بە ناوی (ڕۆژهەلاتی ناوەراستی گەورە)وە هەر هەموو ناوچەکە بخاتە ژێر ڕکێفی خۆی، دونیا سەرەوژێر نەبوو. لە ساڵی ١٩٧٥ ڕژێمی سەدام نیوەی (شەتولعەرب)و پانتایەکی فراوانی لەخاکی عێراقی دا بە ئێران، ناوچەی (الحیاد)ی دایە سعوودیە و پێشتریش هەندێ رووبەری عێراقی دا بە کوێت و ئوردن، کەچی کەس باسی قودسیەتی سنووری عێراقی نەکرد، دیاری کردنی سنووری هەرێمی کوردستانی فیدراڵ و لە چوارچێوەی ئەم سنووره (موقەدەس)ەی عێراق دەبێتە هات و هاوار، وا هەڵڵایە لە سەر کورد. دواخستنی کێشەی چارەنووسسازی سنووری مێژوویی کوردستانی عێراق بۆ چەند ساتێکیش لە ژێر هەر پەردەیەک، لەلایەن ئەمریکاو برای عەرەبی عێراقی باڵادەستمان نیشانەی نەکردنە، مانگی ١٤ سەر لە ئێوارە دیارە، قسەکانی بۆش ڕۆژی ٢٠٠٤/١/٢٩ لە کۆشکی سپی بە حزووری (ئۆردوگان)ی سەرەک وەزیرانی تورکیا و قسەکانی ئۆردوگان پاش دانیشتنی لەگەڵ بۆش و قسەکانی بریمەر ڕۆژی گەیشتنی ئۆردوگان بۆ واشنتۆن و هەموو بیر بۆچوونەکانی ئەندامانی ئەنجوومەنی دەسەلاتی کاتی لە عێراق، ئەوانی غەیرە کورد، ڕێککەوتننامەی نێوان (بریمەر) و ئەنجومەنی دەسەلاتی کاتی عێراق کە ڕۆژی چوار شەممە ٢٠٠٣/١١/١٥ ئیعلان کرا، تاکو ئەمڕۆ ئەو ڕاستییە دووپات دەکاتەوە کە ئەو هێز و لایەنانە هەر هەڵوێستی جارانیان هەیە لەمەڕ فیدراڵیەت و سنووری کوردستان و، هیچ گۆڕانکارییەکی نەوعی لەم بارەیەوە ڕەچاو ناکرێت. ئەوانەی کە ئەڵێن بۆش و بریمەر و ئۆردوگان و برای عەرەبی باڵادەستمان گۆڕاون و قسەکانیان ئیجابیەتی تێدا دیارە، یان ئاگایان لە دونیا نییە یان دیسان دەیانەوێت ناوەڕۆکی ڕێککەوتننامەی ٢٠٠٣/١١/١٥ بەسەر میللەتەکەماندا بسەپێنن و، دواتر داوا بکەن لە میللەت دژی بێت!!.. باوەڕ ناکەم دروشمی مەترسی لەسەر برایەتی کورد و عەرەب و تەدەخولاتی ئیقلیمی و شارستانیەت و دیپلۆماسی.... هتد، سوودی هەبێت چونکە:

٩- بە حوکمی داگیر کردنی عێراق لەلایەن ئەمریکاوەو بە وجودی هێزی ئەمریکا، و بە بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی، هیچ هێزێکی ئیقلیمی ناتوانێت بە هێز داخلی عێراق بێت، ئەو ناماقوڵییەتەش بکات، ئەمریکا

بەرپرسیارە بەرامبەر بە گەلانی عێراق، بەرامبە بە خودی ئەمریکییەکان، بەرامبەر بە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی. هەر هەمان یاسا و رێککەوتننامە و بڕیار کە رێگایان داوە بە ئەمریکا ببێتە هێزێکی داگیرکەر لە عێراق، ئیلزامی دەکات سنوور و ئەمن و ئاسایشمان بپارێزێت و، ویستی رەوای خەڵکی ئێمە رەچاو و پیادە بکات. دیارە ئەمەیش خاڵی سەرەکی ناوەڕۆکی کێشەی کوردە، **لە واقیعی وەهادا دواخستنی حەسمی کێشەی کورد، بە تایبەتی سنووری کوردستان و ئەو فیدرالیەتەی کە کورد دەیەوێت و زەمانەتکردنی، بە تەئکید لە بەرژەوەندی کورد نییە.**

* ئەوەی لەگەڵیدا هەڵسوکەوت و دانووستاندنمانە و حوکمڕانیمان دەکات، لە کۆمەڵگایەکی تازە پێشکەوتوو و بێ بنج و بنەوانەی رەگەزی و کۆمەڵایەتی پێگەیشتووەو، لەو کۆمەڵگایەوە زانیاری و سیستەمی بیر و بیرکردنەوەی هەڵقوڵاوە، کۆمەڵگایەکە لەسەر ئازادی تاک و بازاڕ و ململانێی بێ رەحمانە بنیاد نراوەو، لە پێناوی سوود و قازانجی زاتی هەموو شت وەلاوە دەنێت، پارەو پول و سەروەت و سامان دینامووی بزوێنەری ژیانە. کۆمەڵگایەکە تاکی لە بنەڕەتدا لە هەموو کون و قوشبنێکی ئەم سەرزەمینە سەری خۆی هەڵگرتووەو هەموو شتی لە دوای خۆی جێهێڵاوە، تەنها بۆ سوود و چاک کردنی باری ژیانی خۆی، یان لە کۆمەڵگای خۆی هەڵهاتووە لەبەر هەر هۆیەک بێت، بۆ جیهانێکی تر کە هەموو شت لە پێناو دابین کردنی ژیانێکی خۆشتر و باش بۆ ئەو تاکە رەوا بووە. کۆمەڵگایەک لەسەر پشت و کەلەسەری دانیشتووانی بنەجێی و، بە دەستی خەڵکانێکی بیانی و موغامر و چاوبرسی وچلێس و، شەیدای سەروەت و سامان و دەسەڵات، دروست بووە. بۆیە لای ئەم تاکە: **هەڵسووکەوتی تەقلیدی و مامەڵەی ئەخلاقی لە سەر کێشەکان باوی نییە. داگیرکردنی خاکی خەڵکی تر لای ئەو کێشەیەکی ئەخلاقی و مرۆڤایەتی نییە، بگرە جۆرێکە لە ئازایەتی و مافی شارستانیەت و، دەرگایەکە بۆ ژیانێکی باشتر ئەگەر دژ بە بەرژەوەندی تایبەتی ئەو نەبێت.** کوشتن و قڕکردنی خەڵک، ئامراز و پایگایەکە بۆ گەیشتن **بەو مەرامە**. ئەوەی ئەمڕۆ لە دەستدایە ئەوە گرنگەو **لە پێناویدا نابێت سڵ لە هیچ بکرێت**، هەموو شت **بەستراوەتەوە بە هێز**. ئایین و بنەماکانی رەوشت

**دەبێت لە پێناوی هەمان مەبەستدا بێت، ئەگینا پایگای نییە**. دامەزراندن و یەکێتی ئەمریکای ئەمڕۆ لەسەر حیسابی خەڵکە ڕەسەن و خاوەن وڵاتەکەی دوێنێ بووە، لە پێناوی پاراستنی ئەو واقیعە و پەرە پێدانی، کێشەی ڕەگەز و ئایین و زبان و کلتور و مێژوو وەلاوە نرا، هەر بەو پێیە ڕەفتار دەکەن و ئەمڕۆ و دواڕۆژیان دەنرخێنن. ئەمریکا کە بوو بە هێز و توانا، سلّی نەکرد، هیرۆشیماو نەکازاگی دروست کرد، لە کاتێکدا کاروانی جەنگی دووەمی جیهانی سەرو لێژ دەڕۆیشت، بە هێزو سوپاو، بە ئیمکانیاتی ئابووری جەرگەی کۆمەڵگای جیهانی کۆنترۆڵ کرد.

* سەرۆک کۆمار بۆ تاک و بۆ کۆمەڵ و لەبەردەمی جیهان، هێمایەکە. لەو کۆمەڵگایە لە پێناوی گەیشتن بەو پۆستە، تاکی لێپرسراو مانعی نییە هەموو شت بکات: (نیکسون) بە هەموو توانایەکەوە و بە هۆی تۆڕێکی سیخوڕی چاودێری هەموو جۆرە بزاف و پلانێکی مونافیسەکەی خۆی دەکرد، پاش ئەوەی بوو بە سەرۆک کۆمار، پێی نایە سەر هەموو پرنسیپەکانی یاسایی و مەعنەوی، کە کەشفیش بوو ناچاریان کرد دەست لە کار بکێشێتەوە، وەکو بلّێیت نە با بوو نە باران. پێشتر سەرۆک (جۆن کەنەدی) کە لەبەر هەر هۆیەک بووبێت کوژرا. قاتیلەکەی گیرا. لە باڵەخانەی پۆلیس و لە نێو دەستی حیمایەکانی، ئەو قاتیلەی (کەنەدی) کوژرا، ئەوەی کوشتی گیرا. کەس تاکو ئێستا نازانێت ئەو (فیلیم)ـە بۆ وابوو و چی لێ هات. (جاکلین)ی ژنی( کەنەدی) یەک لە جوانترین ئافرەتانی ئەمریکا بوو، لەتەک مێردەکەی بوو کە تیرۆر کرا و لە کۆشییدا گیانی دەرچوو. وەکو خانمی یەکەمی ئەمریکا و خێزانی سەرۆک کۆمار لە بنەماڵەی ئال کەنەدی، یەک لە دەوڵەمەندترین کەسایەتی ئەمریکا بوو، چاوەڕوانی ئەنجامی کەشف بوونی کوشتنی مێردەکەی نەکردو، ڕێزی نەگرت لە پلەو پایەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و پێداویستی پاراستنی هێمای خانمی یەکەمی ئەمریکا، لەبەر پول و سامان مێردی کرد بە(ئەوانیس)ی یۆنانی کە بە تەمەن لە باوکی جاکلین گەورەتر بوو، ئەوانیس بۆ شووهرەو کەیف بازی، جاکلینیش بۆ پول و پارە...!. کۆمەڵگایەک هونەرمەندێکی مەغروری فاشیلی وەکو (ڕۆناڵد ریگان) ببێت بە سەرۆک کۆماری، کۆمەڵگایەک سەرۆک کۆمارێکی وەکو (بیل کلینتۆن) کە لە بارەگای کۆشکی سپی لە ژووری خۆیدا

خەریکی کەیف بێت لەگەڵ یەک لە کچە کارمەندەکانی، کە بە تەمەن لە عومری کچی کلینتۆن بێت، تاکو ئەو کاتەی کەشفیان کرد، کە کەشف بوو ئینکاری کرد، کە ئیسپات بوو ئیعترافی کرد لە بەرامبەر هەموو دونیا، لە پۆستی خۆیشی مایەوە تاکو ماوەکەی تەواو بوو، تاکو ئێستاش بە رەسمی نوێنەری ئەمریکا دەبێت بۆ کێشەی زۆر گرنگە کۆمەلایەتی وسیاسییە نێودەوڵەتییەکان..!. کۆمەڵگایەک زۆربەی زۆری سەرۆک کۆماری، یان تیرۆر کراون، یان بە سکەندالێک پۆستی سەرۆک کۆماری جێهلاوە و، بۆ یەک سەدە دەچێت دروست کەر و پشت و پەنای زۆربەی زۆری رژێمە دیکتاتۆر و کۆنەپەرستەکانی جیهان بێت، شای ئێران، (بنۆشێتی)شیلی ،(سەدام حوسێن)ی خوێنرێژ زۆربەی زۆری سەرانی ولاتانی عەرەب، تورکیا، زنجیرەیەکی دوورو درێژ لە دەسەلاتدارانی ئەمریکای لاتینی و لە ئاسیا و لە ئەفریقیا....! بەڵێ کۆمەڵگایەکی وەها، چۆن بەقودرەتی قادیر لە شەو و رۆژێکدا دەبێتە هەڵگری پەیامی ئازادی و رزگاری تاک و گەلان وبنیادنەری دیموکراسی...! ئەمە بازاڕەو، نابێت لەم بازاڕە کورد (تاجری شەعشەع) بێت.

* بۆ ئێمەی کورد هەر ئەمریکا و یارانی بوون ولاتەکەمانیان دابەش کردو، پشتگیریان لە ئێران و کەمالیەکانی تورکیا و شای ئێرانی گۆڕ بەگۆڕ و رژێمە یەک لە دوای یەکەکانی عێراقیان دەکرد. پەیمانی سەنتۆ، ئیتیفاقیەی جەزائر، بەهێز کردنی سەدام حسێن و چەکی کیمیاوی، هەر بە بیرو پیلانی ئەمریکاو یارانی هاتە کایەوە..!. چەند لای ئێمە تەعریب و راگوێزانی کورد لەنگە و مانەوەی ئەو دیاردەیە خەتەرناکە، لای ئەم ئەمریکاییانە بە پێچەوانەوەیە، پاڕانەوەش بە لاوازی لە قەڵەم ئەدەن.
* ئەمریکا مافی (المواطنە) و ئینتمای نەتەوایەتی و مەزهەبی و ئایینی دژ بە یەکتر لە قەڵەم ئەدەن، بۆیە (پشتگیری) لە (مافی المواطنە) دەکەن، دەسەلاتیش لا مەرکەزی دەبێت!، و فیدرالیەت لەسەر ئەو ئەساسە دەخەنە روو، بە پێچەوانەی ئەمانە شتی تر باوی نییە!. هەموو جۆرە خزمەت و کارهاسانی لەلایەن (ئێمەی) کورد لای ئەوان بە (فرض الاداء)ی لە قەڵەم ئەدەن، چونکە ئەوان بە هێزو ئێمە لاواز. **پراگماتیکن ئەگەر کاری بە تۆ هەبوو، دەتخاتە نێو وێنەکە، ئەو کاتەیشی کاری نەما دەنگ و رەنگت نامێنێت.** وەفاو ئیلتزام و

بەڵێن لەبەرامبەر بەرژەوەندی ئەمریکا و سەرکەوتنی تاکی مەسئول و دەزگاکانی، قیمەتی نییە! هیچ نییە شەرمی لێ بکەن. دەیانەوێت ئەم قۆناغە ببێتە سەرەتای ئەو سیاسەتەی کە داڕێژراوە، هەر گۆڕانکارییەک بێتە سەر ئەو سیاسەتە ئەوە پەیوەندی بە تەرازووی هێزو کارتەکانە. بەو پێیەش دەجولێتەوە، بۆیە دەبێت کورد هەر بەو پێوانەیە لەگەڵ ئەمریکادا بجولێتەوە، نەک لە قەوارە و هزری رەوشت و وەفاداری و ئەخلاق و بەڵێنەکان و، بەرژەوەندی باڵای خەڵکی کوردستان و کێشە رەواکەی، کە پێویستە لە سەرووی هەموو بەرژەوەندییەکانەوە بێت..!

بەرژەوەندییەکانی خەڵکی کوردستانیش لە بڕیاری سەربەخۆی خۆیەتی کە بە ئازادی چارەنووسی خۆی دیاری بکات کە تاکو ئەم قۆناغە ئەو فیدراڵییەتەی کە پەرلەمانی کوردستان و گشت هێزە سیاسییەکان کوردستان پێش پرۆسەی (رزگاری) عێراق بڕیاریان لەسەر دابوو نەک (فیدراڵیەتی پارێزگاکان)..!

ئاداری / ٢٠٠٤

**- نحن نعتبر شعب كردستان كأخلص أصدقاء للولايات المتحدة الامريكية -**
**- گەلی کوردستان موخلیسترین دۆستی ئەمریکایە -**
واتە - کەس لە خەڵکی کوردستانی عێراق زیاتر هاوڕێی ئەمریکا نییە -
پاش چەندین ئەزموونی هەورازو نشێو و، تاڵ و تفتی بەراوردکراو لەگەڵ کەناڵە پەیوندارەکان و دام و دەزگاکانی ئەمریکا، بەم شێوەیە سەرکردایەتی کورد لە کوردستانی عێراق دۆستایەتی کورد و ئەمریکا پێناسە دەکەن، هەر وەکو لە نامەکەی بەڕێزان بارزانی وتاڵەبانی لە (٢٠٠٤/٦/١)* بۆ سەرۆک (کۆماری ئەمریکا، جورج بوش) دا هاتووە .!
هەرچەندە و پێش ئەم قۆناغە، دەبوایە زۆر لایەنی ئەو جۆرە دۆستایەتییە (پەیوەندیانە) نهێنی بێت، بەڵام ڕەوتی ڕووداوەکان، هیچی وەهای نەهێڵایەوە بە نهێنی، چ لەلایەن خودی کوردەوە یان نەیارانی، هەروەها لە ڕێگای کەناڵە جیا جیاکانی ئیدارەی ئەمریکی خۆیەوە، بە حوکمی تەبیعەت وشەفافیەتی نیزامەکەی و، هەیکەلیەتی دام و دەزگاو مەڵبەندەکانی ململانێ و میکانیزمی دروست کردنی بڕیار.
حزووری ئەمریکا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە گشتی لەپاش شەڕی جیهانی یەکەمەوە، بە تدریج و هێدی هێدی، بە ڕوونی بەدی دەکرێت چ لەمەڕ ڕۆڵی سەباردت بە گۆڕانکارییەکان لە سەتحی جیهان و ناوچەکە بە گشتی و، دواتریش ئەوەی بە سەری کورددا هاتووە لە کوردستانی عێراق بە تایبەتی.
ئەگەر چی ئەمریکا درەنگ تێکەڵی کێشەی کورد بوو، بە بەراورد کردنی لەگەڵ (بەریتانیای عوزماو فەرەنساو روسیا ). لەگەڵ ئەوەش و بەش بە حاڵی خۆمان وەکو کورد ئەوەی ئەمریکا بە سەری هێناوین کەم نییە .
با زۆر دوور نەڕۆین:

* پەیمانی سەنتو، یان (حلف بغداد = منظمه حلف الشرق الاوسط): پەیمانێکی سیاسی عەسکەری بوو، لە نێوان تورکیاو ئێران و عێراق و پاکستان. سەرەتا پرۆژەیەک بوو بە دەستپێشخەری بەریتانیاو ئەمریکا، ساڵی ١٩٥١ پێشکەش کرا، و ساڵی ١٩٥٥ (بە هاندان و پشتیوانی و بەشداری ئەمریکا ئیمزا کرا)، یەک لە مەبەست و خاڵە گرنگەکانی ئەو (حلف)ە، گەمارۆدانی بزاڤی

---
* بڕوانە دەقی نامەکە لە پاشکۆی ژمارە «٦» - ل٢٣٣

رزگاریخوازی کورد بوو..! ئەمریکا داهێنەرو هاندەر بوو، هەروەها لە رێگای ئەندامەتی لە لیژنەی (ئابووری و عەسکەری) ئەو (حلف)ـە رۆڵێکی سەرەکی ئەبینی لە نەخشە و پلان و پاڵپشتی..!

* هاوکاری و پشتیوانی لە رژێمە (یەک لە دوای یەکەکانی عێراق): رژێمی پادشایی عێراق، دواتر ئینقیلابچیەکانی بەعسی فاشی ۱۹٦۳، هەردوو عارفی برا ۱۹٦٤-۱۹٦۸و، بەعسی فاشی ۱۹٦۸و، (لووتکەکەی رژێمی سەدامی لە ناوچوو، هەر لە هێنانەوەی بۆ سەر کورسی دەسەڵات و، پاراستنی رژێمەکەی، لە رمان و ئینقیلاب و کۆمەک و هاوکاری بۆ لە ناوبردنی هەموو بەرهەڵستکارانی، بە گشت لایەنە سیاسییەکان وکەسایەتیە نیشتمانپەروەرەکانی عێراق و، بە تایبەتی دژی ئێمەی کورد)، هەروەها هاوکاری وپاڵپشی ولاتانی دیکەی ناوچەکە کە کوردستانیان بە سەردا دابەش کراوە.

* بە کار هێنانی کێشەی کورد بۆ مەرام و نەخشەو پلان و بەرژەوەندی باڵای ئەمریکا و هاوپەیمانانی لە عێراق و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بۆ نموونە:

١ـ هاندانی سەرکردایەتی سیاسی شۆڕشی ئەیلول و هاوکاری کردنی بە تایبەتی ساڵانی ۱۹۷۲-۱۹۷٤، بە تێهەڵکێشی چەند لایەنێکی دۆست و هاوپەیمانی ئەمریکا، لە پێش هەموویان شای ئێرانی گوڕ بە گوڕ. ئەنجامی ئەو (پشتیوانیە)ی ئەمریکا، رێککەوتننامەی (الجزائر) بوو، لە نێوان سەدام و شای ئێران لە ٦/ئاداری/ ۱۹۷٥، کە بووە مایەی نسکۆی شۆڕشی مەزنی ئەیلوول و، ئیجبار کردنی خۆ بەدستدانەوەی سەدەها هەزار لە سەرکردەو کادیرو پێشمەرگە و تێکۆشەرانی دیکەی کوردستان، بە هەردوو رژێمە جنایەتکار و دوژمنەکەی کورد، ئەویش تەسلیم بوون بە رژێمی شا، یان بە رژێمی خوێنرێژی سەدام...!، و لەو سات و کاتانەدا و لە چرکە خەتەرناک و چارەنووسسازەکانی کارەساتی ٦/ئاداری/ ۱۹۷٥، ئیدارەی ئەمریکی ئامادە نەبوو هەتاکو وەڵامی سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلوولیش بداتەوە. دواتر (هینری کیسنجەر)ی (وەزیر خارجیەی ئەمریکای ئەو سەردەمە)، وەکو لایەنێکی بەرپرسیاری ئەو پەیوەندیە و ئەو خیانەتکاریە، گوناه و تەبەعیاتی ئەو نسکۆیە دەخاتە ئەستۆی خودی کورد و سەرکردایەتی کوردو، توانجیشی لێ ئەدات....! و چی

دوای ئەمە بەسەری خەڵکی کوردستاندا هات: لە ڕاگویزان و تەعریب و تەبعیس و کوشتنی بە کۆمەڵ، تاکو بە کار هێنانی چەکی کیمیاوی و بایەلۆجی و کارەساتی هەڵەبجە و کاول کردنی کوردستان و ئەنفالەکانمان و، کۆڕەوە میلۆنییەکەی بەهاری١٩٩١، ئەمریکا ڕاستەوخۆ یان ناراستەوخۆ، کەم یان زۆر شەریک و تەرەفێکە لەو جنایاتانە..!

٢ـ لە شەڕی کوێت ئیدارەی ئەمەریکی، چراغی کەسکی هەڵکرد بۆ بەرهەڵستکارانی عێراق بۆ ئەوەی ڕاپەڕن دژی ڕژێمی سەدام لە کوردستان و لە خوارووی عێراق. خەڵکی ستەمدیدە ڕاپەڕین. کەم تر لە ٣ هەفتە خەڵکی بە شەرفی کوردستان و پێشمەرگە قارەمانەکانی و بە سەرپەرشتی بەرەی کوردستانی، کوردستانیان ئازاد کرد بە شاری کەرکووکی مەغدوریشەوە. سەرۆک کۆماری ئەمریکای ئەوسا، (جورج بوشی باوک)، پاشگەز بووەوە لە بەڵێنەکانی و، بەچراغی سەوزی بوش و ئیدارەکەی، هێزەکانی سەدام کەوتنە گیانی خەڵکی بێ دیفاعی عێراق و، بە تایبەتی لە کوردستان، لە کاتێکدا (ئەمەریکا و بوش) دەیانزانی سەدام چەکی کیمیاوی و بایەلۆجی هەیە و بەکاری هێناوەو، ئامادەیە دژی کورد چەندباری دیکەش بە کاری بێنێت. **ئەنجامەکەی**: مانەوەی ڕژێمەکی و، شکستی ڕاپەڕینەکە و کوشتن و بێ سەروو شوێن بوونی هەزارەها لە خەڵکی خوارووی عێراق و کوردستان و، لەپێش هەمووی ئەو کۆڕەوە ملیۆنیەی خەڵکی کوردستان بوو، بەرەو سنوورەکانی ئێران و تورکیا، کە بەگەورەترین تراجیدیای کۆتایی سەدەی ڕابردوو دەژمێردرێت و بەهۆی ڕاگەیاندنی جیهانیەوە چووە ژووری گشت لێپرسراوانی دونیا و بگرە چووە نێو ماڵی هەموو خێزانێک و، لە پێش هەموویانەوە، جۆرج بوشی سەرۆک کۆماری ئەو دەمی ئەمریکا و کولن پاوڵ و باقی ئیدارەکەی بوش. لە ناوەوەو لە دەرەوەی ئەمەریکا. لایەن و توێژێکی زۆر، هەر ئەمانەیانە بە لێپرسراوی ئەو کارەساتە ناوزەد دەکرد. باجی ئەو هەڵوێستە نامرۆڤانەی ئیدارەی بوشی باوک، لە دەستدانی هەزارەها شەهید، چ لە بەرەکانی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هێزەکانی سەدام لە کاتی ڕزگاری کوردستان و، چ لە دژە هێرشەکەی هێزەکانی سەدام و کشانەوەی پێشمەرگەکان و جەماوەری ڕاپەڕیوی کوردستان یان لە کاتی کۆڕەوە ملیۆنیەکە، لەبەر برسیەتی و سەرماو

تۆفانی بەهاری ساڵی ١٩٩١و، جگە لە زەرەرو زیانی سەدەها هەزار خێزان بە هۆی داگیرکردنەوەی بەشێکی زۆر لە شارو شارۆچکەکانی کوردستان، لەلایەن هێزەکانی حەرەسی جەمهووری سەدام و دەزگا حیزبی و سیخورییە بەدناوەکانی. **بەشێکی زۆر لە خوێن وزەرەرو زیانی ئەو خەڵکە بە تەئکید لە ئەستۆی ئیدارەی بوشی باوکە. حەق وابوو لایەنە پەیوەندارەکانی کوردستان لە مێژەوە ئەو کێشەیانە بخستایەتە روو و، کاری جیدی بۆ بکرایەت لە ئاستی ناوخۆ و نێودەوڵەتی، هەر چی نەبێت (بوشی باوک، دگان بە هەڵەی خۆیدا بنێت و ئیعتیزار بکات لە گەلی کوردستان، تاکو ماوە)**. چونکە کارەساتی بەهاری ١٩٩١ لەسەرەتا بە هاندان و چراغی سەوزی ئیدارەی ئەو روویدا، زیانێکی مرۆڤایەتی و گیانی و مادی و نەفسی زۆری لێ کەوتەوەدو، هیچ کات بەراورد ناکرێت لەگەڵ ئەودی (آبو غریب)و، (بزانن چیان کرد بۆ ( ابو غریب) کە تەقیەوە)..!

ئەگەر پاساو ئەدرێتەوە بە ناوچەی ئارام : هەرچەندە سوپاس و پێزانینی کورد لە هەموو موناسەبەتەکاندا دووپات کرایتەوە، بەڵام ئەوەش بەمووباددردو پیاوەتی ئیدارەی بوش نەبوو، بەڵکو لە ژێر تەوژمی رەد فیعلی جادەی ئەورووپی ولایەنێکی جادەی ئەمریکی ورۆڵی راگەیاندنی جیهانی بوو. لەگەڵ ئەوەش لە سزاکانی نێودەوڵەتی و ئابلۆوقەی ئابووری دژ بە رژێمی سەدام حیسابی کورد و جەلادەکانی وەک یەک کراو، زۆر لایەنی نێودەوڵەتی و کاروباری مرۆڤایەتی، بەوەش کە پەیوەندی هەبوو بە کوردستانی ئازادوە، هەر لە ژێر کونترۆڵی رژێمی سەدامدا مایەوە.....!

١١ ساڵ کورد لە ژێر شمشێری سەدام و سێبەری چەکی کیمیاوی و بایەلۆجی ژیانی ئەبردەسەرو، بۆ یەک چرکەش رژێمی سەدامی گۆڕ بەگۆڕ لە تەعریب و راونان و گۆڕینی قەوارەی نەتەوایەتی ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی خۆی رانەگرت، بەردەوامیش بوو لە کاری تیرۆر. ئەمریکا چاوی پۆشی بوو لە خروقاتی سەدام و بە تەجاوز و نائارامی لە قەڵەم نە ئەدرا و گوێشی نە ئەدا بە سکاڵا و داخوازی و مەترسییەکانی لایەنی کوردی و، بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی ژمارە (٦٨٨)ش، وەلاوە نرابوو و، نەدەبوو کوردیش

(عكس العمل)ی هەبێت، ئەگەر روویشی بدایەت ئەوە (خەرق)ەو، کورد خۆی بەرپرسیارە لە ردد فیعلی رژێمی سەدامی خاوەن چەکی کۆکوژ و گەمارۆدەری کوردستانی ئازاد..!

٣ـ قۆناغی رزگاری و پاشانیش داگیرکردنی عێراق، بە داگیرکردنی کوردستانی ئازادیشەوە، لە بەهاری ساڵی٢٠٠٣ و تاکو ئێستا و ئەوەی وا لەبەر چاودایە و رۆژانە تێیدا ئەژین، لە هەڵوێستی ئەمریکاو، مامەڵەکردنی لەگەڵ کورد وتەهمیش کردنی کێشەکەی لەو ماوەیدا، نامەکەی ٢٠٠٤/٦/١ بۆ سەرۆک کۆماری ئەمریکا، کە بە دیقەت تەعبیر لەچەند لایەنێکی گرنگی ئەو (پەیوەندییە) و (ئەو دۆستایەتیە)ی ئەم (قۆناغە) دەکاتەوە، کە بە هۆیەوە کورد و کێشەکەی لە کوردستانی عێراق تووشی قەیران و مەترسی بووە.!

هەر هەموو ئەمانەو زۆر شتی دیکەش، لای سەرکردایەتی سیاسی کورد، وەک مانگی چواردە روون و ئاشکرایە، لەگەڵ ئەوەش پیشاندانی هەستی کورد لەم قۆناغە لە دۆستایەتی ئەمریکا دیسان پاساوی خۆی هەیە...!

**بەلام ئەوەی سەرنج رادەکێشێت ئەوەیە کە**: لەگەڵ ئەم هەموو هەڵوێستە نادۆستانەی ئەمریکا کە هەندێکی، لە ئاستی دوژمنایەتی کورد بووە، سوور بوونە لەسەر، دۆستایەتی ئەمریکا، هەتاکو ئەگەر ئەمریکا بەردەوامیش بێت لە دژایەتی کورد، هەر وەکو لە نامەکەی ٢٠٠٤/٦/١دا هاتووە: (نحن سوف نبقى اصدقاء مخلصين لامريكا حتى لو لم يقابل دعمنا دائما بالمثل ...) .( ئێمە وەک هاورێیی دڵسۆزی ئەمریکا دەمێنینەوە، تەنانەت ئەگەر پشتیوانییەکانی ئێمە زۆر جاریش نەنرخێندرێت...)

دروست و پتەو کردنی دۆستایەتی ئەرکێکی پێویست و پیرۆز و گرنگە بۆ کورد، بە تایبەتی لەم قۆناغەو، ئەگەر هاتوو ئەو جۆرە (دۆستایەتیە) لەگەڵ زل هێزێکی وەکو ئەمریکا بێت. بەلام:

تەقدیر و خوێندنەوەی دۆستایەتی بەو شێوەیە و تاکو ئەو رادەیە و لەم بارودۆخەدا، لە چوارچێوەی دۆستایەتی دەردەچێت و زیاتر بە تەبەعییەت و خۆبەدەستەوەدان و بێ دەسەلاتی لە قەڵەم ئەدرێت لەلایەن توێژێکی بەرچاوی خەڵکی کوردستان..!

ئەم جۆرە دیتن و بۆچوونانە وەکو بنەمای پەیوەندی دووقولی لە نێوان (کورد)و

(ئەمریکا)، لە قالّبی تیروانین و خوێندنەوەیەکی تەقلیدی و پیادە کراوی کات بە سەر چوودایەو، ئەم جۆرە مامەڵەکردنە: نە ئەمریکاو نە هیچ لایەنێکی دیکەی وەکو ئەمریکا، دڵنەرم دەکات، یان هەستیان دەبزوێنێت، بۆ ئەوەی هەندێ (بەزبیان بە کورددا بێتەوە)و، بەو ئومێدەی مامەڵەیان هەندێ باشتر بێت...!
بە پێچەوانەوە دوور نییە ئەو جۆرە سیاسەتە وای کردبێت ئەمریکاو غەیرە ئەمریکا بەو شێوەیە تەماشای کورد و کێشەکەی بکات و لەسەر ئەو هەڵوێستەش مامەڵەی لەگەڵدا بکات و سووریش بن لەسەری، هەروەها زیاتریش هانیان بدات کە نەک هەر لە سەری برۆن، بەڵکو خراپتری لێ بکەن، وەکو دەڵێن: (بێ پا بەردە و پێ دار بگرە).

**سیاسەتی فیعلی ئەمریکا لە زۆر رووەوە: خەباسەتی (کیسنجەر)ـەو ئەخلاقی (کلینتۆن)ـەو شەهامەتی (بوش)ـە..!**

یەکەمیان و دووهەمیان: پێویست ناکات زۆر لە سەری بگوترێت:
* چونکە هێشتا زووخاوی رێککەوتننامەی شوومی (٥)ی ئاداری ١٩٧٥ی (الجزائر) رووبارێکی خەستەو، (مۆنیکا)یش ماوە..!

سێهەمیان:
* بەو هەموو بەڵێن و راگەیاندنەی (جورج بوش)ی کوڕ، کە عێراق رزگار دەکات، کە کردی (رزگاری) گۆڕی بە (داگیر) کردن..! ئەم پاشگەز بوونەوە زۆر لە مصداقیەتی بوش و ئیدارەکەی لە دەست دا. **ناوچەکەی رووبەڕووی قەیرانێکی دژواری ئەمنی و سیاسی و ئابووری کرد. عێراق کردە مەڵبەندێکی جەزبی تیرۆرستانی جیهان و هەموو ناحەزان و بەرهەڵستکارانی ئەمریکا وەکو تاکە زل هێز و یەک قوتبی دونیای ئەمڕۆ.** لەم هاوکێشەیە خەڵکی عێراق بە گشتی و کورد بە تایبەتی نرخی گرانی (شەهامەتی) بوش ئەدەنەوە، ئاسۆکەشی بە تایبەتی بۆ کورد، بە پێی دەرئەنجامی رووداوەکانی ئەم قۆناغە، تەم و مژاویە.
* کە لە ناوەختدا قەباحەتی (ابو غریب) کەشف بوو، هەرچەندە چەند مانگێک بوو پێیان دەزانی، ئیدارەی (بوش) چوار پێنج تەزویرچی و دزی سەردەمی رژێمی سەدامیان پەیدا کرد، کە سزا درابوون بە (وەشمی) ناوچاوان، یان (دەست برین و گوێ برین)ـ لەگەڵ ئیدانە کردنمان بۆ ئەو جۆرە کردەوانە، لە کۆشکی سپی (بوش) چاوی پێیان کەوت و دەست کرا بە هەڵمەتێکی راگەیاندن لە

سەرتاسەری ئەمریکا بۆ ئەو چەند (تاوانبارانە) لە ڕێگای کۆڕو کۆبوونەوەو چاوپێکەوتنی کەناڵە جیاجیاکانی ڕاگەیاندنی ئەمریکی و جیهانی و، موعالەجەکردنیان لە ڕێگای چەند نەشتەرگەرییەکی (جوانی)..! **لە کاتێکدا (بوش) تاکو ئێستا ئامادە نییە چاوی بە سەرکردەیەکی کورد بکەوێت، کە خاوەن سەدەها هەزار شەهید و سەقەت و دەربەدەر و ماڵوێران و بێ سەرو شوێن وکاولکراوی کوردستانن، یان هەزارەها کوردستانی تێکۆشەر هەیە کە قوربانی چەکی کیمیاوی و بایەلۆجی (سەدام)ن، یان پاشماوەکانی ئەنفال و گۆڕی بە کۆمەڵ و زیندانیانی بەندیخانەکانی ئەمن و موخابرات و ئیستخبارات و (ابوغریب)**. سەرەڕای ئەمانە هەر هەموو کورد هاوپەیمان وبەشداری (پرۆسەی ڕزگاری عێراق)ـەو بەشدارە لە ئیدارەی ئەم عێراقە لە قۆناغی داگیر کردنی شان بەشانی ئەمریکا و هێزەکانی دیکەی عێراقی و، هەر لەسەر ئەم هەڵوێستەو بۆ جاری یەکەم لە مێژووی ئەم عێراقە، (کورد) ڕوو بەڕووی شەپۆلێکی بێ وێنەی ڕکابەری و دژایەتی جادەی عەربی عێراق بە تایبەتی و جادەی عەرەبی بە گشتی بووەتەوە، تاکو ئەو ڕادەیە هەندێ لایەنی سیاسی کە تاکو دوێنێ دۆست و هاوغەمی بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد بوون، وا لە هەندێ هەڵوێستی پوزەتیڤانەی جارانیان پاشگەز بونەتەوە ....! **واتە جاران کورد وەکو کورد ترسی هەبوو لە ئەمن و موخابرات و پۆلیس و پیاوانی دەزگا بەدناوەکانی دیکەی بەعسی (سەدام)و، ململانێیەکە دوور بوو لە جادەی عەرەبی عێراق و، بگرە بە گشتی عەتفێکیش هەبوو لەسەر کورد. کە چی ئەمڕۆ بە هۆی ئەو (هاوپەیمانیەتیە)ی کورد لەگەڵ ئەمریکا، کورد وەکو (کورد) لە جادەی عەربی عێراق مەبەستمە، کورد و کێشەکەی بۆ جاری یەکەمە لە مێژووی ئەم عێراقە بەو شێوەیە ڕوو بە ڕووی هەڵمەتێکی تیرۆریستی و شاڵاوێکی ڕاگەیاندنی ناحەق ونێگەتیڤانە بووەتەوە.**

**تەصەور ناکەم کێشەی کورد ئەوەندە بێ بنج بنەوانە و ئەوەندە ناڕەوا بێت و، کورد لە کوردستانی عێراق ئەوەندە بێ دەسەڵات و لاواز بێت و، سەرکردایەتیەکەیشی ئەوەندە بێ مێژوو و بێ ئیمکانیات و بێ ئەزموون بێت، کە وای لێ بکات هەڵوێستی وەها پیشان بدرێت.**

مافی ئامۆژگاری بە خۆم نادەم و، دوژمنایەتی ئەمریکاش لە بەرژەوەندی کورددا نییە..!

وەلێ:
نە ئەمریکا و نەعەقڵی ئیدارەکەی هەڵوێستی وەها دەخوێنێتەوە..! و نە بەو شێوەیە پەروەردە کراون و نە ئەولیا و مەلائیکەت و زاتێکی وا پاک و بێگەردن، بەم جۆرە خیتابە دڵیان نەرم بێت و، نە بۆ ئەوەش هاتوونەتە ناوچەکە...!
وەکو دەڵێن: " هەموو شت بە خوێ و خوێیش بە میقدار ."
دوور لە عاتیفە و هەندێ بە مەوزوعیەتەوە، بەش بە حاڵی خۆم لەو باوەڕەدام: دۆستایەتی گەلانی دیکە.. وڵاتانی تر.. حکومەت ولایەنی سیاسی غەیرە کورد، زۆر لە پێش و بەتین و بەهێز و بە سوودترە بۆ ئیدارەی بوش، لەوەی کورد..!
ئەمش مانای وا نییە خاڵ و بەرژەوەندی هاوبەش لە بەرنامە و ئیستراتیجیەتی ئیدارەی بوش و کورددا بە دی ناکرێت.
دۆستایەتی بە مانا عاتیفییەکەی لەسیاسەتدا بوونی بۆ نییە، بەڵکو بەرژەوەندی هەیە.
**مانەوەو بەڕێوەبردن و بەهێزکردنی بەرژەوەندی بەوە دەکرێت:**
**یان دەبێت بیپارێزیت یان دەبێت بیهەژێنێت.**
دوور نییە لە ئیمکانیات و توانای کورددا نەبێت: پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە عێراق و ناوچەکە، بە هۆی ناوەڕۆک و تەبیعەتی ململانێیەکەو تەوازنی هێز...هتد، بەڵام **پێی دەکرێت ئەو بەرژەوەندیانە بهەژێنێت**، بە ئەمرازو متوودی وەها کە هەلەکانی ململانێ **لە کاتی پێویست، فەرزی دەکات**..!
کۆ کردنەوەو پیشان دانی هێزو توانا ویست و خواست یان بیروبۆچوون و هەڵوێستی کورد، ئا بەو شێوەیە کە لە (نامەکەدا) هاتووە، وەکو بڵێیت لە **(خۆشەویستیەکی یەک تەرفە)** دەچێت، مەرج نییە لایەنی ئەمریکی و، بە تەحدید (ئیدارەی بوش)، وای ببینێت .!
**لە مێژەوە کورد باجی(حوبی) یەک تەرفەی داوە و ئەیدات.** نەک تەنها لە پێناوی ئەمریکا، بەڵکو بۆ وڵاتی دیکەش، هۆ و هۆکاری ئەمەش زۆرن. لێرە ئەو دەرفەتە نییە حیساو و کتاوی وەها بکرێت...
**پێناسەی ئەو(حوبە) یەک تەرفە**، لە ناوەڕۆکی نامەکەی ٢٠٠٤/٦/١، بۆ سەرۆک (بوش) بەدی دەکرێت و، خۆی راڤەی خۆی دەکات و، سکاڵایەکی درەنگ و کات بە سەرداچووە.

ئەگەر هەندێ ورد بینەوە لەو نامەیەو، هەڵسوکەوتی سەرکردایەتی سیاسی کورد لە قۆناغی رزگاری عێراق و تاکو ئێستا و دەرئەنجامەکانی هەڵسەنگێنین، دەردەکەوێت کە:

* کورد شان بە شانی هێزەکانی ئەمریکا لە پرۆسەی رزگاری عێراق، جەنگاون و، "خەسارەتی لایەنی کوردی زۆر زۆرتر بوو لە زەرەرو زیانی هەموو هاوپەیمانەکانی **دیکەی ئەمریکا** *". کەچی چارەسەر کردنی کێشەی کورد و کوردستانی عێراق، بە دەرە لە ئەجیندەی ئەمریکاو، ئەو پێشمەرگانەی کە پاسەوان و جەنگاوەر بوون لەگەڵ هێزەکانی ئەمریکاو خۆیان داوە بە کوشتن، بەرەسمی لای ئەمریکییەکان بە (میلیشیات) لە قەڵەم ئەدرێت..! لەمەش گازندە لە بوش دەکرێت، **بەلام**:
* سەرۆک وەزیرانی عێراق - د.ایاد علاوی - لە بەلاغێکی رەسمیداو بە ناوی حکومەتی نوێی عێراق، بەرامبەر بەمیدیاکانی عێراقی و جیهانی رایگەیاند کە: (٩) گروپی میلیشیات لە عێراق نامێنێت و، کە ناوی ( میلیشیاتەکانی) خوێندەوە ژمارە یەک (میلیشیات)ی پارتی بوو، دووهەمیان (میلیشیات)ی یەکێتی بوو ....هتد. ئەم راگەیاندنە بە دەنگ و بە وێنە، کەناڵە ئاسمانییەکانی کوردستانی عێراق لە هەواڵەکانی خۆیاندا زیاتر لە جارێک بڵاویان کردەوە. کەچی لایەنی کوردی سوورە کە پێشمەرگە، میلیشیات نییە، (حەق و راستە پێشمەرگە میلیشیات نییە). ئەوە ئەمریکاو ئەوە سەرۆکی وەزیران کە (لایەنی کوردی گوایە رۆڵی هەبوو) لە دانانی و، ئاگاداری هەڵوێست و حەساسیەتی (الاکراد)ە سەبارەت بە حیساو کردنی (پێشمەرگە) بە میلیشیات و، ٦ وەزیرمان هەیە لە کابینەکەی و، یەک (نائب)و، هەروەها یەک لە (نائب)کانی سەرۆک کۆماریش کوردەو، **ئێستاش بڕیارەکان بە (توافق)ە**...!
* کوردستانی ئازاد بوو بە (دورگەیەکی) (عێراق)ی ئارام و ئامێزگەرم و رووگەش بۆ سەربازەکانی ئەمریکا.. لە کاتێکدا لە ناوەڕاست و خوارووی عێراق راویان دەکەن، رۆژانە تەرمی کوژراو و، جەستەی بریندار و سەقەتیان پۆست دەکەن بۆ ئەمریکا، لە کوردستاندا بە هەوەسی خۆیان دەجوولێنەوەو رادەبوێرن و، تاکو

---

* برگەیەک لە دەقی نامەکەی ٦/١

ئێستا سەربازێکیانیش نە کوژراوە و نە بریندار بووە..! بەرامبەر بەمە تەماشا بکەن ئەمریکا چۆن مامەڵە لەگەڵ کوردو کێشەکەی دەکات...!

* خەڵکی کوردستان بە پێی ئەو پێناسەیە تاکو ئێستاش بەردەوامە لە (داعیورانی) "**داب و نەریتی ئەمریکا**"..! وا زۆر لە دەزگاکانی ئەمریکی لە نێو خەڵکی ئێمە بە (خشپەکی) کاری خۆیان دەکەن وەکو ( ئەوانی دیکە ) لە زۆر کون و قوشبنی وڵاتەکەمان خەریکی هێلینن..! **ئەمەش بووەتە کار نەک عار**.. و خەڵکێکی زۆر بەو (کار)ـە خۆی هەڵدەکێشێت.. دەنگیش ناکرێت.. کار هاسانیشی بۆ دەکرێت..، ئەوان خاوەن ماڵ و خاوەن ماڵ میوان، دوعایش دەکرێت، لە رەزاشیرینی خاوەن ماڵ کەم نەبێتەوە ..!

* پشتگیری و پشتیوانی کورد لە نەخشە و پلانەکانی ئەمریکا لە پرۆسەی رزگاری و پاشان لە داگیرکردنی عێراق و کوردستانی ئازاد، "**بێ سنوورە** "..!

* حکومەتی هەرێمی کوردستان بە هەردوو ئیدارەکەیەوە، زۆر لایەنی گرنگی ئازادی و سەروەری و، زۆربەی زۆری دەسکەوتەکانی، دوای راپەرینی ساڵی ١٩٩١ی کرد بە قوچی قوربانی لە پێناوی ئەو **(حوبە) یەک تەرفەی ئەمریکا**، تاکو رادەی قایل بوون بە داگیر کردنی کوردستانی ئازاد، وەکو پارچەیەک لە عێراق...!

* پەرلەمانی کوردستان کرا بە هۆڵی موناسەبات..!

* (کەرکوک) دڵ و قودسی کوردستان، نابێت بگەرێتەوە بۆ باوەشی هەرێمی کوردستان - برگە (ج)ی مادده (٥٣)*- (یاسای بەرێوەبردنی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی)و، رەفتاری رۆژانەی سەرباز و کاربەدەستانی ئەمریکا و هاوپەیمانانی لە کەرکوک ، دەرحەق بە چالاکی و بارەگا و جموجۆڵی لایەنە کوردییەکان، بە شێوەیەکی وەهایە کە کوردان هەست بە تەهمیش و جیاوازی و دژایەتی دەکەن....!

---

* مادده ٥٣- ج. هەر کۆمەڵە پارێزگایەک **کە لە سێ پارێزگا زیاتر نەبن** لە دەرەوەی هەرێمی کوردستان، **بەغداو کەرکووکی لێ دەرچێ**، بۆیان هەیە لە بەینی خۆیاندا هەرێم پێکبهێنن، حکومەتی عێراقیش بۆی هەیە پێشنیازی میکانیزمی پێکهێنانی ئەو هەرێمانە بکات بەو مەرجەی بخرێتە بەردەم کۆمەڵەی نیشتمانی هەڵبژێردراو تا دیراسەو پەسندی بکات، جیا لە رەزامەندی کۆمەڵەی نیشتمانی بۆ هەر یاسایەکی تایبەت بە پێکهێنانی هەرێمێکی نوێ، پێویستە لە راپرسیەکدا رەزامەندی دانیشتووانی پارێزگا پەیوەندارەکانیش وەربگیرێ.

* ئیفلیج کردنی پرۆسەی بنبڕ کردنی تەعریب و گۆڕینی قەوارەی نەتەوایەتی ناوچە بە عەرەبکراوەکانمان، بە پێی ( دەستووری کاتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی)و، (**تعریب) کە وەکو زاراوەیەکی(سیاسی)، لە سنووری نزیکەی نیو سەدە، جولانەوەی رزگاریخوازی کورد، کاری بۆ کردووەو، بە دونیای ناساندووە و تاوانی سیاسەتی تەعریب و تەعریبچیەکانی ریسوا کردووە، کەچی بە قودرەتی قادر، خەتێک بە سەر زاراوەی (تعریب) راکێشراو، تەعریبچیەکان بوون بە (وافدین)=(هاوردە)...!** ئەمەشمان وەکو (پێشمەرگە = میلیشیات)و، تاکو ئێستا زۆر لە یاسا و رێسای رژێمی سەدامی مونحەل پیادە دەکرێت..!

* پەسند و ئیمزاکردنی، یاسای (بەڕێوەبردنی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی، لەلایەن گروپی کوردی نێو ئەنجومەنی دەسەلاتی کاتی عێراق)، کە دەستووری کاتی عێراقە بۆ قۆناغی ئینتیقالی، تێدا کورد بە عەمەلی، وەکو (گەلێک ): لە ناوەندی بڕیار و سەروەت و سامانی کوردستان و سنووری کوردستانەکەی، فت کراوە..!، داکۆکیش دەکرێت لە دەستووری هەمیشەیش تەسبیت بکرێت..!

* ڤیتۆی (کاکە برێمەر)، سەبارەت بە پۆستە سەرەکییەکانی عێراق و، بە تەحدید (سەرۆک کۆمار) و (سەرۆک وەزیران)، بەرامبەر بە کوردو، مەنەپۆلکردنی هەردوو **پۆستەکە بۆ عەرب: سەرۆک کۆمار بۆ عەرەبی (سوننە)و، پۆستی سەرۆک وەزیران بۆ عەربی (شیعە)، دەوڵەتەکەش (عیلمانی)و (فیدرالی)ـەو، فیدرالیەتەکەیش، لەسەر ئەساسی (مێژوویی جوگرافییە). مێژوو و جوگرافیا، لای ئەمریکا، پەیوەندی نییە بە رەگەزو ئاین و مەزهەبەوەو، ئێژنیش (فیدرالیەتەکە) لە سەر ئەساسی (پارێزگا) نییە..! و سووریشن لەسەر یەکسانی (هاوولاتی)..!**

* تۆ بلێیت سوودفە بێت:

١ـ هەرێمی کوردستانی لای ئەمریکا= ناوچە ئۆتۆنۆمیەکەی لای سەدامی دارماو: (دهۆک و هەولێرو سلێمانی - بە هەندێ کلک و گوێ کردنی پارێزگای دهۆک وهەولێر) بێت.

٢ـ کەرکوک هەرچەندە لای هەردوولا شارێکی عێراقیە، وەکو (رەمادی و نەجف و بەسرە و ناسرییە..هتد)، **بەلام (حوبەکەی) (کورد) رێگای داوە ئەو شارە**

**عەربیانە بە هەوەس و بڕیاری** خۆیان تێکەڵی یەک بن و هەرێمێک پێک بێنن، کەچی ڤیتۆی داناوە لەسەر کەرکوک. جارێک یەک هەرێم لە (٣) پارێزگا دەبێت پێک بێت و، هەرێمەکەی کوردستانیش (تەحدید کراوە بە دهۆک و **هەولێرو سلێمانی**)و، جارێکی دیکە نابێت کەرکوک لە هیچ بەشە فیدراڵیەک **بێت**..! -( نەوەک کوردان بیر لە داش بە داشێک بکەن کەرکوک لە جیاتی سلێمانی یان هەولێر یان دهۆک..!)-. زەمانێک (سەدامی خوێن ڕێژ و فاشی) ڕازی بوو بە ئیدارەی هاوبەشی کەرکوک (لە نێوان حکومەتی مەرکەزی و کوردان) یان ڕازی بوو بەوە **کە (خاسە) سنوور بێت لە نێوان دەسەڵاتی ناوەندو، دەسەڵاتی کوردان...!**.

٣ـ (کورد) بۆ پۆستی سەرۆک کۆمار و سەرۆک وەزیران دەبێت (جێگر بێت)، لە سنووری (٦) کوردیش پۆستی وەزاردتیان بەر کەوێت...!

٤ـ کوردیش لای هەردوولا وەکو هاووڵاتییەکی (سالیح) هەموو مافێکی (هاووڵاتی) هەیە لەسەر کاغەز و لەسەرزاردکی، گروپی کوردی لە ئەنجومەنی کاتی دەسەڵات ئەرکەکانی (هاووڵاتی سالیح)ی بە زیادەوە بەجێ هێنا، کەچی (رفیق برێمەر) وەکو (ڕەفیق سەدامی) تیاو تێ چوو، (ڤیتۆ)کەی بەکار هێنا، سەبارەت بەو دوو پۆستە سیادیانە، هەر چەندە ئەوە یەک لە مافە سروشتیەکانی (هاووڵاتییە)، نەخاسمە ئەگەر (زۆر سالیح)یش بێت..! وا دیارە هەر کات هەر پۆستێک، تە عبیر بێت لە بنەماکانی یەکسانی و شەراکەتی کورد و عەرەب لە عێراق، ئەوە خواردنی کورد نییە، کورد دیارە هەر دەبێت -(برا بچووک و..)- بێت.

* ئەم (حوبە) **یەک تەرفەی کورد لەگەڵ ئەمریکا** بووە مایەی دروست بوونی دژایەتی پانتاییەکی فراوانی جادەی عەربی عێراق بە تایبەتی و جادەی عەرەبی بە گشتی، تاکو ئەو ڕادەیە مەترسی ئەوە هەیە، کە دوور نییە ڕۆژێک بێت، نرخی ئەم (حوبە): تۆڵە سەندوە بێت لە کورد..!
* هاوپەیمانیەتی و لە یەک تێگەیشتنێکی مێژوویی لە نێوان عەرەبی شیعەی عێراق و کورد بە گشتی، بۆ ماوەی زیاتر لە هەشتا ساڵی پێشوو گەرم گوڕ و تەبا بوو، بە حوکمی سیاسەتی ڕەگەزپەرستی و شۆڤینی و تایفەگەری سەرانی

حوكمڕانی عێراق، كە بە درێژایی مێژووی ئەم عێراقە، بە دەستی كەمینەی موسڵمانی (سوننە)ی عەردبەوە بووە..!
هەرچیش بە سەر كورددا هاتووە لە عێراق، لەو ماوەیەدا، لە ڕێگاو بە هۆی سەرانی حوكمڕانی عێراق بووە، هەرچەندە كوردیش (بە ئایین ئیسلامە و بە مەزهەب (سوننە)یە.! بەڵام لەم چەند مانگانەی ڕابردوودا ئەو پەیوەندیەو ئەو دۆستایەتیەی نێوان كورد و برایانی عەردبی شیعەی عێراق تووشی كۆمەڵێك گرفت بووە و مەترسی گرژ بوونی لێ دەكرێت.

* وڵاتانی ئیقلیمی بە چاوی گومان و حەزەرەوە چاودێری بارودۆخی كوردستانی عێراق دەكەن، هەرچەندە باوەڕم بە تیوری ( المؤامرە) نییە، **لەگەڵ ئەوەش دوور نییە یەك لە ئامانجەكانی (كشف) كردنی نامەی ٢٠٠٤/٦/١، نامەیەكی دیكەی ئەمریكا بێت بۆ ئەو وڵاتانە، كە بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ كوردان دەكات، با پشت ڕاست بن...!**
* ئەمریكا دەستی بەسەر پاشماوەی ئەو بڕە پارەیە كرد كە بەشی كوردستانی ئازاد بوو لە واریداتی نەوت بەرامبەر بە خۆراك و دەرمان، كە بە پێی بڕیاری ٩٨٦ی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی تەرخان كرابوو. هەروەها دابەشكردنی بەسەر پارێزگاكانی دیكەی عێراق. كۆی گشتی ئەو بڕە پارەیە لە ١٩ ملیار دۆلار زیاترە، بەشی كوردستانی ئازاد (٣ پارێزگا) (١٣٪ )ە...!
* ئیدارەی مەدەنی داگیركەری ئەمریكی لە بەغدا دژی یەكسانی زمانی كوردیە لەگەڵ زمانی عەرەبی لە عێراق...!
*( انحیاز)ی داگیركەری ئەمریكی دژ بە كوردستان . هێشتا كوردستان بەرەسمی لای ئەمریكا ( شیمال العراق)ە، بە دەگمەنیش ناوی حكومەتی كوردستان دێنن...!
* لەگەڵ ئەوە هەمووی (٦) داخوازیش پێشكەش كراوە بە سەرۆك كۆماری ئەمریكا، هەر وەكو لە نامەكدا هاتووە:
١ـ یاسای ئیدارەی دەوڵەت لە بڕیاری (١٥٤٦)*ی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی تەسبیت بكرێت. ئەگەر نەكرێت گرووپی كوردی لە ناوەند

* بڕوانە دەقی بڕیارەكە لە پاشكۆی ژمارە «١٥» - ل٣٤٢

دەکشێنەوە. نەکراو، گروپی کوردیش لە حکومەتی ناوەندی نەکشانەوە .پاشان پاساو درایەوە گوایە بڕیارەکە ئیقراری (**فیدرالیەتی**) کردووە.. یان ئیقراری (**توافق**)ی کردووە لە بڕیاردان..هتد. بۆ ئەوەی دەقیق بین.. **لە واقعدا بڕیارەکە چی دەقی مولزەمی وەهای تێدا نییە کە (دەبێت عێراقی ئایندە عێراقێکی فیدرالی بێت) ئەوەی هاتوە ئەوەیە کە لە ( دیباجەی بڕیارەکە** هاتووەو دەڵێت «**واذ يرحب (المقصود هنا مجلس الامن) بالتزام الحكومة المؤقتة للعراق بالعمل علي اقامة عراق اتحادي ديمقراطي تعددي موحد...الخ**» ئەوەی هاتووە تەنها پێشوازی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتیە سەبارەت بەوەی کە حکومەتی کاتی عێراق ئەو ئیلتزامەی داوە کە کار بکات بۆ دامەزراندنی عێراقێکی دیموکراتی ئیتیحادی..)، جیاوازیش لە نێوان دیباجەو بڕگەی بڕیار هەروەها لە شێوەی داڕشتنەوەدا زۆرە. سەبارەت بە (**تەوافق)یش: بڕگە (٧-١-٣) دەڵێت: (تشجيع الحوار وبناء التوافق في الاراء علي الصعيد الوطني بشأن صياغة شعب العراق لدستور وطني .) . جا کوا ئەو ئیلزامەی کە باسی لێوە دەکرێت سەبارەت بە (تەوافق)..! هاندانی(گفتوگۆ...) ئیلزام نییە..**

٢ـ لە مەترسی تۆڵە سەندنەوە لە کورد.. داوای (تعهد) کراوە لە ئەمریکا لە کاتی (کشانەوەیان لە عێراق...)، تاکو ئێستا ئەمریکا هیچ (تعهد)ێکی رەسمی نەداوە بە کورد، چ لە سەرەتای هاتنی بۆ عێراق و چ ئێستا و چ ئەگەر (ناچار بوو بکشێتەوە لە عێراق)، هەروەها هیچ هەنگاو و پەیمانێکیان نەداوە وەکو ئەمریکا، جگە لە هەندێ قسەی سەر زارەکی نەبێت وەکو: چیتر کورد تووشی کارەساتی وەکو ئەنفال و هەڵەبجە نابێت. سەبارەت بە گەڕانەوەی کوردەکان بۆ ناوچە بە عەرەبکراوەکانی کوردستان، کە (داوا کراوە)، بە دەر لەوەی کە لە یاسای ئیدارەی دەوڵەتدا بۆ قۆناغی ئینتیقالی هاتووە، چی تر لە ئارادا نییە. بە پێچەوانەوە ئەگەر مروڤ هەندێ بە دیقەت تەماشای یاداشتنامەکەی گروپی کوردی لە ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک بکات لە ٢٠٠٤/٦/١٠* و پاش کشانەوەیان لە دانیشتنەکانی ئەم ئەنجومەنە سەبارەت بە رەفتاری لێپرسراوانی هێزەکانی داگیرکەری ئەمریکی دژ بە کورد لە کەرکوک ، لەگەڵ رستە

* بڕوانە دەقی یاداشتنامەکە لە پاشکۆی ژمارە «٥»- ل٢٣٣

تایبەتمەندەکانی نامەکە سەبارەت بە هەڵوێستی ئیدارەی مەدەنی داگیرکەری ئەمریکی بە گشتی، بۆی دەردەکەویت، ئەم داخوازیانەش ولاوەنراوە.

٣ـ داخوزی سێهەم: گەڕانەوی پاشماوی برە پارەی بەشی کوردستانی ئازادە لە بەرنامەی نەوت بەرامبەر بە خۆراک و دەرمان، هەر وەکو لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد. بێ رەچاو کردنی بەرژەوەندی میللەتەکەمان و ئەو کۆسپانە کە رژێمی دارماوی سەدام دەیخستە بەردەم جێبەجێ کردنی ئەو بەرنامەیە لە کوردستان لەگەڵ گەندەڵی دەزگا پەیوەندارەکانی(یو ئێن)و سازش کردنیان لەگەڵ رژێمی پێشوو لە بەغدا، ئیدارەی مەدەنی ئەمریکا لە بەغدا دەستی بە سەر ئەو برە پارەیە گردو، بە پێی بەرژەوەندی خۆیان وەکو برە پارەیەکی ناوەندی عێراق مامەڵەی لەگەڵ دەکەن و هێشتا چارەنووسی بەشی هەرێمی کوردستان نادیارە..!!.

٤ـ داواکراوە : ئەمریکا هاوکاری نەخشەو پلانەکان بکات بۆ بەڕێوبردنی سەرچاوە سروشتیەکانی کوردستان و بەتایبەتی گەشەپێدانی سەرچاوە نوێیەکانی (نەوت) لە هەرێمی کوردستان...هتد. کێشەی سەرچاوەکانی سروشتی کوردستان بە پێی یاسای بەڕێوەبردنی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی، موڵکی گشت گەلی عێراقەو لەلایەن دەسەڵاتی ناوەندی ئیتیحادیەوە بەڕێوەدەچێت، بە دەرە لە دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان. گروپی کوردی لە ئەنجومەنی دەسەڵاتی کاتی عێراق، پەسەندو ئیمزایان کردووە.! تۆ بلێیت ئەمریکا ئیجابی بێت و، بە دەر لە دەسەڵاتی ناوەندی ئیتیحادی نەوت و گاز و کانزا سروشتییەکانی دیکەی هەرێمی کوردستانمان بۆ کەشف و ئیستیسمار بکات؟، و ئەگەر بیکاتیش باوەڕ ناکەم لە چوارچێوەی نەخشەو پلان و بەرنامەی حکومەتی ئیتیحادی ناوەند دەرچێت.

٥ـ داوا کرابوو (قنصلیە)ی ئەمریکی لە هەولێر بکرێتەوە. ئەمریکا بە راشکاوی لە چەند موناسەبەتێکدا رایگەیاند: (قنصلیە)ی نە لە هەولێرو نە لە هیچ شارێکی (دیکەی هەرێمی کوردستان) ناکاتەوە، بەڵکو لە مووسڵ و لە کەرکوک دەکرێتەوە. هۆیەکەشی وەکو (برێمەر) لە رۆژی ٢٠٠٤/٦/٢٢ لە **هاوینە هەواری سەلاح الدین رایگەیاند، بێ پارەیی نییە.**

٦- دامەزراندنی ئەنجومەنی دەسەلاتی کاتی، وەزیرەکان و، پاشتر سەرۆک کۆمار و سەرۆک وەزیران و کابینەکی عەلاوی و، ئەنجومەنی پارێزگاکان.. هتد، لەسەر ئەساسی رەگەزی و ئایینی و مەزهبی بوو. لەمەیش نەردچاوی کورد کرا وەکو رەگەز و نە وەکو مەزهەب. داوا دەکرێت لەمەو دوا بەو شێوە مامەڵە نەکرێت. هەروەها نە ئیدارەی مەدەنی داگیرکەری ئەمریکا لە عێراق و نە زۆرینەی برا عەرەبەکانمان لە بەغدا، بە چاوی یەکسانی تەماشای کورد ناکەن. یاسای بەڕێوەبردنی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی، چۆنیەتی پڕ کردنەوەی ئەو پۆستانەی دیاری کردووە، گروپی کوردیش لە ئەنجومەنی دەسەلاتی کاتی پەسندی کردووەو، ئەو پڕکردنەوەش دەکەوێتە نێوان کەمینەی کورد و زۆرینەی عەرەب و، لەسەر ئەساسی دەنگدانە..! **ئەمریکاش بۆ چەسپاندنی (دیموکراتی) کار دەکات لە عێراق ..! کوردیش دیموکراتخوازە..!.**

* لە رۆژی یەکەمی داگیرکردنی عێراق تاکوو ئەمڕۆ، **(حوبە)کەی کورد، پلان و نەخشەکانی روون و ئاشکرایە دەرحەق بە کوردو کوردستان.** کوردستانی عێراق **(شیمال)**ی عێراقە، (گەلانی) عێراق = ( **گەلی**) عێراقە. کوردیش (**هاوولاتی عێراق**)و، مافەکانیش لە چوارچێوەی لامەرکەزیەتێکی ئیداری لەسەر ئەساسی (**پارێزگا** ) ، وەکو هەر هاوولاتییەکی ئەم عێراقە زامن دەکرێت لەسەر کاغەز. هەرچەندە ئەمریکاو زۆرینەی عەرەبی عێراقیش پێی ئێژن (**فیدرالیەتی مێژوویی و جوگرافی**) ، بەلام هەر هەوە...! و، مامەڵەشیان هەر لەسەر ئەساسی پارێزگایە..! (**هەرێمەکەمانیش**) کەم دەکرێتەوەو، لە ناوچە حوکمەزاتیە کارتۆنیەکەی سەدام دەچێت.....!

* ئەگەر هەندی ورد بینەوە لە هەڵسوکەوتی پێشوو و ئێستای ئیدارەی ئەمریکاو، خۆمان بە سەهودا نەبەین، دەرئەنجامەکانی زەق و روونن..!، ئەوە بوو کە بە سەری کوردیان هێنابوو و ئەوەیە کە تێدا ئەژین و، ئەوەش بە کردەوە وەلامی ئەمریکایە، کوردیش نەک تەنها بێ دەنگەو بەو سۆزەوە تەماشای ئەمریکا دەکات، بەڵکو هەوڵ ئەدرێت وا پیشان بدرێت کە کورد: **(تلذذ) بەو مامەڵەیە دەکات و هەر سوورە لەسەر (حوبە)کەی..!**

* لایەنی کوردی نێو ئەنجومەنی دەسەلاتی کاتی عێراق، هەر هەموو ئەمانەو شتی دیکەشی پەسەند کرد، کەچی دوای (**کەشف بوونی نامەکە بۆ بوش**) ، بە بۆنەی

دەرچواندنی بڕیارێکی نوێ لە ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی سەبارەت بە عێراق (١٥٤٦)*، لە راگەیاندنەکانی کوردستان بووە هات و هاوار، تاکو رادەی تەهدیدکردن بە کشانەوە لە حکومەتی ناوەندی بەغدا..! پاساوی ئەم هەڵوێستە کوتوپڕە، ئەوەیە گوایە: **داخوازییەکانی نامەکەی ٢٠٠٤/٦/١ ولاوەنراوەو، باسی کوردو کوردستان لە بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی ١٥٤٦، نەهاتووە، یان لەو بڕیارە ئاماژە نەکراوە بە (یاسای بەڕێوەبردنی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی)**..!

**پاشە:**

خۆ سەرۆک وەزیرانی عێراق **(د.ئیاد عەلاوی)**، بە پێشنیارو رەزامەندی ئیدارەی داگیرکەری ئەمریکی لە عێراق تەعین کراو، (الاخضر الابراهیمی) نوێنەری نەتەوەیەکگرتووەکان و ئەنجومەنی دەسەڵاتی کاتی عێراقیش، پەسەندیان کردو، دەڵێن گروپی کوردی نێو ئەنجومەن هەوڵێکی زۆری داوە بۆ تەسبیت کردنی ناوبراو...!

پاش پەسەند کردن و تەعین کردنی کابینەکەی، وتەیەکی بە رەسمی پێشکەش بە (گەلی) عێراق کرد**، لەوێ هێڵە سەرەکییەکانی ئەرک و فەرمانی کابینەکەی، و بەرنامەی کارکردنی خستەڕوو، **کەچی وەک سەرۆک وەزیرانی عێراقی (فیدراڵی)، نە لە دوور و نە لە نزیک باسی کورد و کوردستانی تێدا نەکرد.** سوپاس و تەمجیدی خەڵکی (مووسڵ و رەمادی و نەجف..)ی کرد کەچی ناوی یەک شاری کوردستانی نەهێنا.. یان خەڵکەکەی.. یان لایەنەکانی هاوکاری. هیچ لایەک یان کەسێکی بەرپرسی کورد، باسی ئەو پەراوێز کردنەی کوردو کێشەکەی نەکرد...!

هەر هیچ نەبێت شارەکانی کوردستان و خەڵکەکەی زۆر لە خودی ئەو شارانەو لە خەڵکی ئەو شارانەی کە سەرۆک وەزیرانی کۆماری عیلمانی و (فیدراڵی) عێراق تەمجیدیانی کرد، باشتر و گەرمتر لە پێشوازی ئەو نەخشەو پلانە بوون کە (رفیق عەلاوی)ی هێنایە سەر کورسی سەرۆک وەزیران، من باسی ئەمن و ئاسایش و خزمەت گوزاری دیکە ناکەم...!، **هەروەها وەکو سەرۆک وەزیرانی عێراق لە**

---

* بڕوانە دەقی بڕیارەکە لە پاشکۆی ژمارە «١٥» - ل٣٤٢

** بڕوانە دەقی وتەکە لە پاشکۆی ژمارە «١٦» - ل٣٥١

**نامەکەیدا بۆ ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی لە ٢٠٠٤/٦/٥دا، بە هیچ شێوەیەک ئاماژە ناکات بە عێراقیکی (ئیتیحادی) یان (فیدراڵی)، یان داوا ناکات دەبێت لە (بڕیارەکە) ئاماژە بە (یاسای بەڕێوەبردنی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی) بکرێت.**

گومان نییە ئاماژە کردنی (**سەرۆک وەزیرانی عێراق لە نامەکەیدا** بۆ ئەنجومەنی **ئاسایشی نێودەوڵەتی لە ٢٠٠٤/٦/٥**)*، بە ناوی **کوردو کوردستان و فیدرالیەت و یاسای بەڕێوەبردنی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی**، دروست و ڕەواو بە هێزتر دەبوو، لەوەی کە پێشتر لایەنی کوردی داوایان لە سەرۆکی ئەمریکا کردبوو (نامەی ٢٠٠٤/٦/١)**، چونکە:

١ـ داخوازی وەها بە شێوەی (رسمی)و، بە ناوی حکومەتی عێراقەوە دەبوو.

٢ـ پرنسیپی شەراکەتی کوردو عەرەب و مصداقیەتی سەرۆک کۆمار وسەرۆک وەزیرانی زۆرینەی برای عەرەبمان لە یەکەم کابینەی حکومەتی عێراقی و، لایەنی ئەمریکا وەکو هێزی داگیرکەری عێراق، سەبارەت بە کێشەی کورد بە گشتی و فیدرالیەت بە تایبەتی دەخستە سەر سەنگی مەحەک. **ئەگەر لایەنی کوردی لە هەیئەتی سەرۆکایەتی یان ئەنجومەنی وەزیران**، هەوڵیان دابوو بۆ ئەوەی نامەکە تەعبیر بێت لە عێراقی فیدرال و ئاماژەیش بکرێت بە یاسای بەڕێوەبردنی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی و، هەوڵەکەیان سەری نەگرتبوێت، ئەی کوا **پرەنسیپی (توافق)** لە بڕیاردان!، ئەمەش لە واقعیدا شکستێکی دیکەیە لە میانی پیادەکردنی ناوەڕۆکی ئەو یاسایە کە دەبێت حکومەتی عەلاوی و دەزگاکانی تری عێراقی ئینتیقالی لە سەری بڕۆن، لایەنی کوردی لە نامەکەیاندا بۆ بوش داکۆکیان لە سەر دەکرد. **ئەگەر ئاگادار بوون لە ناوەڕۆکی ئەو نامەیە و هەوڵیان نەدابوو بۆ ئەو ئاماژە پێ کردنە یان بە سەریاندا تێپەڕیوە وەکو زۆر شتی تر، بۆ و لە پای چی؟!.**

٣ـ هەروەها نامەی سەرۆکی حکومەتی کاتی عێراق، وەکو نامەکەی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا (کولن پاول)***، بوونە پاشکۆی بڕیاری ئەنجومەنی

* بڕوانە دەقی نامەکە لە پاشکۆی ژمارە «١٧» - ل٣٥٦

** بڕوانە دەقی نامەکە لە پاشکۆی ژمارە «٦» - ل٢٣٦

*** بڕوانە دەقی نامەکە لە پاشکۆی ژمارە «١٨» - ل٣٥٩

ئاسایشی نێودەوڵەتی ژمارەی (١٥٤٦)، کە خۆی لە خۆیدا بایەخێکی نێودەوڵەتی و سیاسی و مێژوویی خۆی هەیە.

**بە کورتی:**

**(بەیانی سەرۆک وەزیرانی عێراقی (ئیتیحادی «فیدرالی») بە بۆنەی تەعین کردنی و، ئەوەی دیکەی بە بۆنەی هەڵوەشانەوەی (میلیشیات)و، نامەکەی بۆ ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی لە کاتێکدا نووسراو گوتراو بڵاوکرایەوە:**

* جێگری سەرۆک کۆماری عێراقی عەلمانی، کوردە...!
* و جێگری سەرۆک وەزیران بۆ کاروباری ئاسایشی نەتەوایەتی (کە نییە) کوردە..!
* و بە ناو (٦) وەزیری کوردمان هەیە...!
* با باسی بەرزە لێپرسراونی دیکە نەکەین.
* و هێشتاش ئەنجومەنی دەسەڵاتی کاتیش لە کاردایە..!

جا بۆ ئەو کات لە دەزگا رەسمیەکانی عێراق هەڵوێست وەرنەگیرا؟. **بۆ لە کاتی خۆیدا میدیاکانی عێراق یان بێگانە یان هەر چی نەبێت لە میدیاکانی کوردستان کەس ورتەی لێوە نەهات...؟!**

بە پێچەوانەوە، هەندێ لەوانە، لە بەرامبەر کامیراکانی راگەیاندنی جیهان، ئەوەندە خەریکی پاڵاپەستۆ بوون بۆ ئەوەی لە تەنشتی سەرۆک وەزیران یان سەرۆک کۆماری عێراق راوەستن، هەوڵی ئەوەیان بدایەت ناوی کوردو کوردستان بۆ یەک جاریش بێت، لە راگەیاندە رەسمیەکەی سەرۆک وەزیران بهاتایەت، زۆر سوود بەخش و باشتر بوو لەوەی، وەکو حەیتە لە تەنشتی عەلاوی و غەیرە عەلاوی و بەرامبەر کامیراکان خۆیان قیتکەنەوە..!

**ئەوە:**

بڕیارەکە دەرچوو لە ژێر ژمارەی ١٥٤٦ لە ٢٠٠٤/٦/٩*و، بە تێکرای دەنگی ئەندامانی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی و، ئاماژەشی نە بەکورد و کوردستان و نە بە(یاسای بەڕێوەبردنی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی) کردووە ..!

---

* بڕوانە دەقی بڕیارەکە لە پاشکۆی ژمارە «١٥»- ل٣٤٢

**دەبێت هەڵوێستی کورد چ بێت..!؟**
بەش بە حاڵی خۆم پڕ بە دڵ حەزم دەکرد لەو بڕیارە ناوی کوردو کوردستان بە ڕاشکاوی بهاتایەت، چی وەکو پێکهاتەی عێراق و چی وەکو گەلێکی بەش خوراو و زوڵم لێکراو و، فاکتەرێکی گرنگی پاساوی داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئەمریکاو، پاشانیش کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، لەلایەکی ترەوەو بە پێچەوانەی زۆر کەس و لایەن، **بەباشم زانی کە ئاماژە نەکرا بە(یاسای بەڕێوەبردنی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی)، لە مەقام و هەیئەتێکی وەها بڵند و کاریگەری نێودەوڵەتی، لەبەر زۆر هۆ و، دوویان بەکارە:**

١ـ ئەم بڕیارە یەک لە دەرئەنجامەکانی ئەو یاسایەیە. ئەگینا ئەو یاسایە پیادە ناکرێت، واتە (تحصیل حاصل)ـە.
٢ـ ئەو یاسایە بە شاهیدی پسپۆڕان و خەڵکی هۆشمەندی کوردستان و دۆستانی ڕاستەقینەی میللەتەکەمان و شەریحەیەکی زۆری لایەنە سیاسییەکان (بگرە هەر هەموویان ئەگەر هەندێ خۆیان گێل نەکەن)، **شتی زۆری تێدایە کە فەرز کراوە بە سەر لایەنی کوردی و هەندێکیشی تێپەڕ بووە.** -دواتر باسی دەکەین- **قەت لە قازانجی کورددا نییە. دوور نییە دوارۆژ دەبووە قەیدێکی دیکە لە ئەستۆی کورد..!**

خۆزگە ئەم هەڵچوونە و داوچوونەی هەندێ لایەنی نێو ئەنجومەنی کاتی دەسەڵات، دواتریش (پەرلەمانی کوردستان):

*** پێش دەرچوونی یاساکە بایەت..**

*** پێش ئەوە کە سەرۆک کۆمار و سەرۆک وەزیران پێشنیار بکرابا..**

*** پێش تەعین و ڕاگەیاندنی کابینەی د.علاوی بایەت..!**

*** پێش ڕاگەیاندنەکەی سەرۆک وەزیران بایەت...!**

*** پاش ڕاگەیاندنەکەی آیة الله سیستانی بایەت..!**

*** پاش راپۆرتەکەی (الاخضر الابراهیمی) بایەت، کە باسی هارو ماری کردووە لە عێراق، کورد نەبێت..!، لەگەڵ ئەو هەموو پێشوازی و لەئامێز گرتن و...هتد..!**

*** پێش دەرچوونی بریاری ١٥٤٦ی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بایەت.**

**جا ئیدی ئەم خۆ ئاڵۆز کردنە و ئەم ژڵەژاندنەی جادەی کوردی دوای ئەو هەموو قەبوڵ کردن و رازی بوون و (کزدەنگیە) لە پای چی..؟!**

ئەم ژڵەژاندنە و دواتر ئەو(هەڵوێستـە)ی کـە لێی کـەوتەوە، سـەبارەت بە بڕیاری ١٥٤٦ **پەندێکی (تورکی)م و بیر دێنێتەوە کە دەڵێت : (خۆزگە بە عەقڵی کوردی دوای رووداو..!).**
جارێکی دیکەش دەیڵێمەوە بەش بە حاڵی خۆم **بە باشم زانی لەو بڕیارە ئاماژە بە یاساکە نەکراوە**، چونکە هیچی وەهای تێدا نییە کە مرۆڤ (متأسف بێت) بۆی، وەکو دەڵێن ( رُبَّ ضارةٍ نافعة).

**باشتریش بوو زوو پینە کرا.**
**لەوەش باشتر کورد لە حکومەتی ناوەندی نەکشایەوە.**
چونکە کشانەوەیەکی وەها کوتوپڕ و بێ ئامادەباشی و بەدائیلی عەمەلی و لە واقعی ئەمڕۆی هەردوولا (پارتی و یەکێتی)، دوور نەبوو زیانبەخش بێت..!

**لە هەموویشی باشتر** ـ لەم حاڵەتە ـ کە ئەمریکا نە بەرنامەی هەیە بۆ کوردو نە هەڵوێستی ئیجابیە:

*** کورد ناوەندی بڕیاری خۆی باشتر یەکخات.**

*** گرانی رۆڵ و حەجمی خۆی باش بنرخێنێت.**

*** هێشتا چارسەری کێشەکە لای ئەمریکایە. ئەوەش ئەمریکایە. بێ دەنگی و پاڕانەوە و (حوبی) یەک تەرەفە ئەوەی لێ کەوتەوە کە لە مەیدانە. ئەوەش لە مەیدانە بەرهەمی ئەوەیە کە تاکو ئێستا چاندراوە. کورد بێ ئیمکانیات نییە. بۆ ئەمەش کاتی ئەوە هاتووە، ئەگەر هەندێ درەنگیش نەبێت، ئەو ئیمکانیاتە**

**تاکـو بکرێت و بڕوات ئاشـتـیـانە بە کـار بهـێنرێت، لەو باوەڕەدام کـوردیش ئەتوانێت ئەمریکا شپرزە کات.**

یاسـای بەڕێوەبردنی عـێراق بۆ قـۆناغی ئینتیـقالـی ئەوەندە ناهێنێت، خۆمـانی پێ نیگەران بکەین، هەم لایەنەکانی نێو ئەنجومەنی دەسەلاتی کاتی پەسەندیان کردووە بە ناوی کوردەوەو، هەم (هیـچی وەهای) زۆر گرنگی تێدا نییە کە ببێتە مایەی ئەم خۆ ژڵەژاندنە، بە دەر لە هەندێ پرنسیپی گشتی و شیعارات..!

ئەمجارەیان با کارەکان باشترو توکمەتر بکرێت، نەگاتە ڕووداو و هەڵوێستی وەها ئەگەر خوا نەخواستە قەوما، بیرکردنەوەو پیاچوونەوە وەکو جاران سوودی نەبێت...! هەر بۆ ئەوەی هەڵوێستـمان سـەبارەت بە (یاسـای بەڕێوەبردنی عـێراق بۆ قـۆناغی ئینتیـقالی) خراپ تەفسیر نەکرێت، بە باشی ئەزانم هەندێ بە وردی و بە چاوی رەخنەوە تەماشـایەکی دیکەی ئەو یاسـایە بکەین، کـە لەم رۆژانە دەبێـتـە مـەیدانی ململانێ و تەفـسـیـر و ئیـجـتـیـهـادات، بەڵام ئەم جـارەیان لـە روانگەی مـاف و بەرژەوەندی کوردەوە. ئەمەش بەشی دووهەمی ئەم بابەتمانە دەبێت.

**حوزەیرانی/٢٠٠٤**

# پێشەکی

لە ٢٠٠٤/٣/٨ یاسـای **بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێـراق بۆ قـۆناغی ئینتیـقـالی***. لە بەغدا بە فـەرمی ڕاگـەیەندرا . مادده و بڕگە پەیوەندارەکان بە مافەکانی گەلی کوردمان لە ئاستی داخوازیەکانیدا نەبوون ، ئەمەش بووە مایەی نیگەرانی و تاکو ڕادەیەکیش بێ ئومێدی خەڵکی کوردستان ودۆستە بە سۆزەکانی.
هەر ئەو کـات یاساکـە کـەوتە بەر شـەن و کـەوی توێژێکی بەرچاو لە پسـپۆڕان و یاساناسان و ڕووناکبیرانی هۆشیاری گەلەکەمان لە ناوەوە و لە دەرەوەی وڵات . بە وردی و بە مەوزوعـیـیـەت تیـشکیـان خسـتـە سـەر لایەنە لاوازەکانی ئەو یاسایە و پەراوێزکردنی کێشە و مافەکانی گەلەکەمان.

جاروبار هەندێ بەرپرس و ئەندامانی سەرکردایەتی ئەم لایەن یان ئەوی تر ،لە بۆنە جیـاجیـاکـاندا، کـەم یان زۆر ، ئاماژەیان بەوە کـرد کـە: (**ئەم یاسـایە هەمـوو داخوازییەکانی خەڵکی کوردستانی مسۆگەر نەکردووە** .. و **کەموکوڕی** هەیە .. هەر **ئەوەندە کـراو... ئەم یاسایە کـاتییـە** لە کاتی داڕشتنی دەستووری هەمیشەیی **کەلێنەکانی پڕ دەکەینەوە** ..هتد). لە کاتی خۆیدا چاوێکمان بە یاساکەدا خشاند و چەند سەرەقـەڵەمێکمان ئامادە کردو نیـازمان وابوو بڵاویکەینەوە وەکو تێبینی و ڕایەک، بەڵام پاش پاساودانەوەی هەندێ لە ئەندامانی سەرکـردایەتیی سـیـاسی کـورد، هەر وەکـو لە سـەروە باسـمـان کـرد، لەو باوەڕەدا بووین کە هەروەها دەبێت و کـەموکوڕیەکـان چارەسـەر دەکـرێن و بە باشـمـان **نـەزانـی** ئەو سـەرەقـەڵەمـانە بڵاوبکەینەوە، بەڵام ڕەوتی ڕووداوەکان دیدو بۆچوونی ناو بەرپرسانی کورد و جەخت کردنیان لەسەر ئەوەی **کە سوورن لەسەر ئەوەی کە دەبێت ئەم یاسایە لە دەستووری ئایندەی هەمـیشـەیی عێراق بچەسپێت** .. یـان **کورد ئامادە نییە لەو مافە کەمتر قەبووڵ بکات کە لەم یاسەیەدا هاتووە**، (وەکـو بڵێیت ئەم یاسایە زۆری هێناوە بۆ کورد) ، وای کـرد هەڵوەستەیەک بکـەین و بگەڕێینەوە بۆ تێبینییەکانمان سەبارەت بە یاساکە..

* بڕوانە دەقی کوردی و عەرەبی یاساکە لە پاشکۆی ژمارە «٧» - ل٢٤٠و، پاشکۆی ژمارە «٨» -ل٢٧٥

ئەم گۆڕانکاریە، واتە : سۆزی سەرکردایەتیی سیاسی کورد بۆ **چارسەرکردنی** کەموکوڕییەکانی یاساکەو نەهێشتنی خاڵە لاوازەکانی، **بۆ جەخت کردن** لە سەر تەسپیت کردنی ئەو مادده و بڕگانەی کە لەم یاسایەدا هاتوون و پەیوەندییان هەیە بە کوردەوە لە دەستووری هەمیشەیی، پەندێکی کۆنی عەرەبی وەبیر هێنامەوە کە دەڵێت ( **راوینا الموت حتى يرضى بالسخونة**) ..!

هەر ئەم گۆڕانکارییە وای لە بەندە و بگرە لە توێژێکی زۆر لە خەڵکی کوردستانیش کرد، کە جارێکی دیکەش بیربکەنەوە لە ناوەڕۆکی ئەم یاسایەو بە مادده پەیوەندارەکانیدا بچنەوەو، بخرێنەڕوو، تاکو بزانین مادده و بڕگە پەیوەندارەکان بە کێشەو مافی کوردەوە ئەوەندە دێن کە سەرکردایەتی سیاسیی کورد وا پڕوپاگەندەی بۆ بکات و پێی لەسەر داگرێت ....؟!*

**یاسای ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی**، کەوتە بەردەست و بڵاوکرایەوە، پاش زیاتر لە چوار مانگی گفتوگۆ و پێشکەش کردنی چەند پرۆژەیەک، چ ئەوەی لەلایەن گروپی کوردی خرایە روو، کە لە ئەسڵدا پرۆژەی (پەرلەمانی کوردستان بوو)**، یان ئەوەی لە لایەن کەسایەتی عێراقی و لایەنەکانی دیکەی نێو (ئەنجوومەنی دەسەڵاتی کاتیی عێراق) ئامادەکرابوو بەتایبەتی ئەوەی حزبی شیوعی عێراقی یان ئەوەی (تەجەمووعی دیموکراتی سەربەخۆ) کە بە پرۆژەی (د.عەدنان پاچەچی) ناوزەد کرا، بەپێی سەرچاوەو کەناڵەکانی راگەیاندن، دیارە هەر ئەم پرۆژەیە، پاش هەندێ دەستکاری بووە وەرەقەی بنەڕەتی وتوێژی ئەم یاسایە. چاودێرانی سیاسی ئاگادار، پرۆژەکەی (پاچەچی)، بە پرۆژەی دەسەڵاتی مەدەنی هاوپەیمان لە قەڵەم دەدەن، گوایە لە بنەڕەتدا ناوەڕۆکی پرۆژەیەکی دەزگا پەیوەندارەکانی ئەمریکا بووە، کە پێش رزگار کردنی عێراق کۆمەڵێک لە پسپۆڕانی بواری یاسا، چ ئەمریکی و ئەورووپی و چ عێراقی، سەرقاڵی دانانی بنەمای یاسایەکی وەها بوون بۆ عێراقی ئایندەو، ناوەڕۆکی ئەوەی لێی دەرچوو کە بەڕێز (پاچەچی) بڵاوی کردەوە، وەکو لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد.

* لێرەدا بە پێویستی دەزانم سەرنجی خوێنەرانی ئازیز راکێشم جارێکی دیکەش کە: رەچاوی ئەوە بکەن ئەم بابەتە پێش دامەزراندنی حکومەتی کاتی عێراق نووسراوە.
** بڕوانە دەقی پرۆژەی یاساکە لە پاشکۆی ژمارە «١٩» - ل٣٦٢ و «٢٠» - ل٣٨١

چی وچۆن بێت، خەلفیەتی پرۆژە، یان، پرۆژەکان، لە پایتەختی عێراق (بەغدا)و لەرێورەسمێکی تایبەتی و بە ئامادەبوونی سەرۆکی ئیدارەی مەدەنی هێزەکانی هاوپەیمان بەرێز (پۆل بریمەر) و یاوەرانی، وەزیرەکانی حکومەتی کاتی و ژمارەیەکی زۆر لە نوێنەرانی میدیای جیهانی، وپاش دوو رۆژ لە میعادی ئیعلان کردنی، رۆژی ٢٠٠٤/٣/٨ مەراسیمی ئیمزا کردنی ئەم یاسایە واتە: (دەستوری کاتیی عێراقی) راگەیەندرا. ئەگەر چی ئەم (**دەستوورە**) **کاتییە** بە (**توافق**) جاڕ درا، بەڵام برایانی عەرەبی شیعەی نێو ئەنجوومەنی کاتیی دەسەڵات کە ژمارەیان (١٣) ئەندامە، (١٢)یان هەڵوێستی خۆیان سەبارەت بە کەموکورپیەکانی ئەو دەستوورە، پێش جاڕدانی بەرەسمی و لە کۆڕێکی رۆژنامەگەریدا راگەیاند. ئەم هەڵوێستە بوو کە دوو رۆژ مەراسیمی ئیمزاکردن و راگەیاندنی ئەم (دەستوورە) کاتیەی دواخست. ژمارەیەکی دیکەی ئەندامانی ئەنجوومەنی دەسەڵاتی کاتیی عێراق، لێرەو لەوێ گلەیی و گازندەیان هەبوو، بەڵام کار نەگەیشتە ئاستی هەڵوێستی (رەسمی)، هەندێکیشیان هەر رووکەشی و لەژێر لێوەوە بوو.

یاساکە بریتییە لە دیباجەیەک و (٦٢) مادده. دیباجەکەی کە بەشێکە لەم (دەستوورە)، داکۆکی لە سەر دەستکەوتەکانی ئازادی گەلی عێراق دەکات، کە رژێمی گۆڕ بە گۆڕی سەدام لێی زەوت کردبوو و، رەددانەوەی هەموو جۆرە توندوتیژییەکە، بە تایبەتی ئەوەی کە وەکو شێوەو شێوازی حوکمڕانی بە کاردەهێنرێت و، یاسا لە عێراقی ئایندە باڵادەست دەبێت و، لە چوارچێوەی میکانیزمێکی حوکمڕانی ئەوتۆ کە یەک لە ئامانجە سەرەکییەکانی : **سڕینەوەی ئاسەواری سیاسەت و کردەوە رەگەزپەرستی و تایفەگەرییەکان بێت**، هەروەها چارەسەرکردنی کێشە هەنووکەییەکان و رێزگرتن لە یاساکانی نێودەوڵەتی و گەڕانەوەی عێراق بۆ پلەو پایگەی سروشتی خۆی، وەکو یەکێک لە وڵاتانی دامەزرێنەری نەتەوە یەکگرتووەکان.

ئەو (٦٢) ماددەیەی ئەم (دەستوورە کاتییە)ی عێراق، دابەش کراوە بە سەر (٩) بەشدا بەم شێوەی خوارەوە :

١- بەشی یەکەم : پێکهاتووە لە (٩) مادده(١-٩) لە ژێر ناونیشانی پرنسیپە بنەڕەتییەکان.

٢- بەشی دووەم: (١٤) ماددەیە (١٠-٢٣) و باسی مافە بنەڕەتییەکان دەکات.
٣- بەشی سێیەم: (٦) ماددەیە (٢٤-٢٩) و تایبەتە بە دەسەڵاتی حکومەتی ئینتیقالی (حکومەتی ئیتیحادی ئینتیقالی).
٤- بەشی چوارەم: (٥) ماددەیە (٣٠-٣٤) و تایبەتە بە دەسەڵاتی یاسادانانی ئینتیقالی(کۆمەڵەی نیشتیمانی).
٥- بەشی پێنجەم: (٨) ماددەیە (٣٥-٤٢) تایبەتە بە دەسەڵاتی راپەڕاندن بەهەردوو باڵەکەیەوە (ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی و ئەنجوومەنی وەزیران و سەرۆکەکەی).
٦- بەشی شەشەم: (٥) ماددەیە (٤٣-٤٧) باسی دەسەڵاتی دادوەری (ئیتیحادی) دەکات.
٧- بەشی حەوتەم: (٤) ماددەیە (٤٨-٥١) تایبەتە بە پێکهاتە و دەسەڵاتی دادگای تایبەتمەند وهەیئاتی نیشتیمانی.
٨- بەشی هەشتەم:(٧) ماددەیە (٥٢-٥٨) و پەیوەندارە بە هەرێمەکان و پارێزگاکان و شارەوانیەکان و هەیئەتە خوجێییەکان.
٩- بەشی نۆیەم: (٤) ماددەیە لە(٥٩-٦٢) تایبەتە بە قۆناغی دوای قۆناغی ئینتیقالی.

پێش ئەوەی بێینە سەر ناوەڕۆک و باس کردنی بەندە پەیوەندارەکانی ئەم یاسایە بە کێشەی کورد و مافەکانی، پێویستە سەرنجی خوێنەرانی ئازیز راکێشین بۆ چەند خاڵێک:
١- ئەم (دەستوورە) کاتیە، لە کاتێکدا پێشنیار کراوە و باسی لەسەر کراوە و بەم شێوەیە دارشتراوە ودواتریش پەسند وئیمزا کرا وجار درا، وەکو ئەوەی لە بەردەستدایە، عێراق داگیر کرابوو و، وەکو دەوڵەت وحکومەت بە (قەوارە و بە ناوەڕۆک) نەمابوو، داگیرکەریش کە ئەمریکایە بە هاوپەیمانیەتی بەریتانیا، گەورەترین و بە هێزترین دەوڵەتە لەم سەر زەمینە، بە دەر لە خواست و بڕیاری کۆمەڵگای نێودەوڵەتی و **لە بن دروشمی رزگارکەر هاتە ژوورەوەو، بە داگیرکەر خۆی ساغ کردەوە** و بە بڕیاری ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی (١٤٨٣) لە ٢٠٠٣/٥/٢٢ وەکو و داگیرکەر حوکمی ئەم عێراقە دەکات.

٢- بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی ژمارە (١٤٨٣) لە٢٢/٥/٢٠٠٣، **بە غیابی نوێنەری گەلانی عێراق بوو**، واتە بێ ئاگاداری و خواست و ئیرادەی خەڵکی عێراق بووەو، لەسەر پێشنیاری ئیسپانیا و بەریتانیاو ئیرلەندەی باکوور و ئەمریکا بوو. جگە لە سوریا کە بە ئارەزووی خۆی لەو کۆبوونەوەیەدا ئامادە نەبوو، وەکوو هەڵوێستێک، هەموو ئەندامانی دیکەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی لەسەری موافق بوون.

٣- ئەم (دەستووورە) ئەو کات ئیمزا کرا لە لایەن (ئەندامانی ئەنجوومەنی دەسەڵاتی کاتی عێراق)، **کە بەڕێز (پۆل بریمەر)، بەڕێوەبەری ئیداری مەدەنی دەسەڵاتی داگیرکەری ئەمریکا لە عێراق، پەسندی کرد.** بەڕێز (بریمەر) مافی **(ڤیتۆ)ی** هەیە لەسەر هەر وشەو زاراوەو دەقی بڕگە و ماددەکانی ئەم یاسایە. بێ سەلماندن و ڕەزامەندی ناوبراو ئەم دەستوورە لە دایک نەدەبوو.

٤- ئەم (دەستووورە) کاتییە، پاش ڕەزامەندی (ئیدارەی داگیرکەر) لەلایەن ئەندامانی (ئەنجوومەنی کاتی) ئیمزا کرا، ئەم (ئەنجوومەنە)ش دەستکردی، ئیرادە و ئیدارەی داگیرکەری ئەمریکایە، لە ڕووی ڕەوایەتی و نوێنەرایەتیان بۆ خەڵکی عێراق، لە زۆر لاوە و بۆ زۆربەیان، چی لە ڕووی یاسایی و چی لە ڕووی سیاسیەوە، جێگای مشتوومڕ و گومانەو، لەگەڵ بنەماکانی دیموکراسی ناگونجێ. بەتایبەتی بۆ (یاسایەکی وەها کە لە پلەی دەستوور) دایە.

مەبەست لەم خاڵە (خوانە خواستە)، کەم کردنەوە نییە لە پلە و پایەی زۆر لەو کەسایەتیانەی نێو (ئەنجوومەن)، بەڵکو جگە لەوەی کە ئەو بەڕێزانە بە بڕیاری ئیدارەی ئەمریکا لە بەغدا پەسند و دامەزران، ئەوەی ئێمە دەیخوێنینەوە و دەیبینین و گوێبیستین لە خودی هەندێ لەو بەڕێزانە: **دەسەڵاتی داگیرکەری ئەمریکی زۆر گوێ نادات بەڕا و پێشنیارو بڕیارەکانیان.** بۆ نموونە دوای (قەباحەتی) بەندیخانەی (ئەبو غرێب) نە (ئەنجوومەن) و نە وەزیری ناوخۆ و نە وەزیری داد، بۆیان نەبوو بزانن چەند وکێ گیراوە و دەگیرێن. (هەر لەسەر زاری خۆیان لە چەند دیمانەیەکی ڕاگەیاندندا) چەند جار هەردوو وەزیری ئاماژە پێکراو، داوایان لە دەسەڵاتی داگیرکەر کرد بوو، تەنها سەردانی (ئەبوغرێب) بکەن، بەڵام ڕێگەیان نەدابوون..!.

ئەنجـوومـەنی دەسـەڵات بە دەیان بڕیاریان دابوو، (بریمەر) زۆری لێ پەسند نەکردبوو. تاکو ئێستا نە ئەنجوومەنی دەسەڵات و نە وەزیرە پەیوەندارەکان، ئاگایان لە سەروەت و سامانی عێراق، بەتایبەتی **(نەوت)و، مەلەفی ئەمنی نییەو**، بۆیانیش **نییە تەدەخل بکەن**. تاکو ئێستا، **موستەشارە ئەمریکی و ئینگلیزەکان راستەوخۆ وەزارەتەکان بەڕێوە دەبەن**، وەزیرەکان زیاتر واجیهەن. ئەوە ماوەیەکە، ئیدارەی داگیرکەری ئەمریکی لە بەغدا، زانیاریەکی وەها بڵاودەکاتەوە، کە پێش کۆتایی حوزەیرانی/ ٢٠٠٤، هەندێ لە وەزارەتەکان تەسلیم بە عێراقیەکان دەکەنەوەو، تاکو ئێستا هەندێکیان لە رێورەسمێکی فەرمی تەسلیم کردوونەتەوە..!

٥- ئەم (دەستوورە) لە سەرەتاوە پرۆژەیەکی ئەمریکی بوو، بە هاندانی ئەوان، هەر وەکو لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ کردووە، بەڕێز (دکتور عەدنان پاچەچی)، پاش هەندێ دەستکاری رووکەشیی و لەبەرکردنی کراسێکی زبانەوانی عەرەبی، پێشکەشی کرد. نەفەس وزاراوە و پرنسیپی ئەمریکی، ولاوازی دەقەکانی لە رووی زبانەوانیەوە، هەندێ لایەنی ئەم خاڵەمان بۆ دەسەلمێنێت، زیاتر لەمەش چەسپاندنی ئەم دەستوورە کاتییە بەو شێوەیەی کە هاتووە، بە **دەر نەبوو لە رۆڵ و فشاری دەسەڵاتی داگیرکەری ئەمریکی**.

٦- **چەند لایەنەکانی عێراقی** لە (ئەنجوومەنی دەسەڵاتی کاتی عێراق)، مەبەستیان یاسایەکی وەها بوو، **زیاتر و بەلەزتر**، لایەنی داگیرکەری ئەمریکی بوو. بۆ ئیدارەی ئەمریکی دەبوایە بە هەر جۆرێک و نرخێک، لە کۆتایی مانگی حوزەیرانی ئەم ساڵ، بۆ میللەت وناوەندەکانی بڕیاری ئەمریکی و، لە پێش چاوی هەموو جیهان، بە رەسمی، دەسەڵاتی ئیدارەی عێراق تەسلیم بە عێراقیەکان بکات. چونکە لە کۆتایی مانگی حوزەیران و سەرەتای مانگی گەلاوێژی ئەم ساڵ، هەڵمەتی هەڵبژاردنی سەرۆک کۆمار لە ئەمریکا دەست پێ دەکرێت، بۆ بوش وئیدارەکەی و گشت پرۆسەی هەڵبژاردنی سەرۆک کۆماری ئەمریکا، داگیرکردنی عێراق و ئەمن و ئاسایش ورەوتی رووداوەکان و، شەڕ و پێکدادان لە نێوان هێزەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانانی لە لایەکەوە و بەرهەڵستکارانیان: چ ئیرهابیەکانی (القاعیدە) و کۆنە سەدامیەکان، چ ئەوانی دیکە، لە توێژە جیاجیاکانی خەڵکی عێراق و، تلانەوەی هێزەکانی

ئەمـریکا و هاوپەیمانانی لەو زەلکاوە، (هەر وەکـو چاودێرانی سـیـاسی و توێژێکی زۆری پایە بەرزی کـاربەدەسـتـانی ئەمـریکی، لەنێـو و لە دەرەوەی ئیـدارەی بوش وحزبی کـۆمـاری، ئامـاژەی بۆ دەکـەن)، **تەوەرێکی گـرنـگ و خالێکی گەرم و چارەنووسـساز دەبێت** لەم هەڵبـژاردنە، بەتایبـەتی بۆ بوش. تەسلیم کردنی دەسـەڵاتیش بۆ مـەرام و لەبەر پرۆسـەیەکی وەها، دەبێت لەسەر نەخشەو پیلان وخواستی ئیدارەی بوش بێت، نەخشەو خواستەکەشیان لە زۆر بەش ومـاددە و بڕگـەکـانی ئەم (یاسـایە) بە زەقی بەدی دەکـرێت. بۆیە مـۆرکی پەلە کردنی ئیدارەی ئەمریکی لە دەرچواندنی ئەم (دەستووره) کاتییە، بە سەر و سـیـمـاو ناوەرۆکی زۆر لە دەقـەکـانیـەوە بە دی دەکـرێت، چی لە شـێـوەی وەرگـێـڕانەوە بۆ سـەر زبانی عـەرەبی، یان لاوازی تێکسـتـەکـان وتیکرار و تێخزانی هەندێ بەند و پرنسیپی بەسەرداچوو و، دوور لە کەلتووری عێراق و ناوچەکەمان، وزەقتریش دەقەکانی (**راگـرتنی تەوازن**)ـە، لە لایەن دەسـەڵاتی خـاوەن (ڤـیـتـۆ)ی ئەمـریکاوە، بە ئومـێـدی ئەوەی لایەنە پەیوەندارەکـانی (ئەنجـوومـەنی کاتی دەسـەڵات)، **هەر یەک و شـتـێکیـان هەبێت بۆ خـەڵکی خـۆیان، با تەنهـا دروشـمـیش بێت**، بێ ئەوەی مەودا بدات هیچ لایەک وەکـو پێـویست بگات بە مـەبەستی خۆی. تەنهـا سـەرکـەوتوو (**کـاکـە بریمەر**) و ئیـدارەکـەی بێت. بە واتەیەکی دیکە : بو ئەوەی بەڕێز (بریمەر) و تاقـمـەکـەی بگەن بە مـەرامی خۆیان، **هەرچی کەموکوڕی و کێشەی بنەڕەتی هەیە خرایە بن بەڕەوەو، دوا خـرا بۆ دوا ڕۆژ وەکـو مـاکی ملمـلانێ و دووبەرەکی لە نێـوان هێـزەکـانی پەیوەندار**، ئەمـەش یەک لە خـەسلّـەتە (نەجـیب) و راست و دروستـەکـانی هەر هێـزێکی داگـیرکـەر و خـاوەن ئیـمکانیـات و دەسـەڵاتە!، بەرامـبەر ئەوانەی ژێردەسـتی خۆیان.. **بۆیە دەکـرێت بڵـێین ئەم (دەسـتـووره) مـافی هەمـوو لایەنەکـانی عێـراقی، بە (نەتەوایەتی و ئایینی و مـەزهەبی)وە، زامن نەکردووە، بەڵام کەسیشی بێ بەش نەکردووە.**

٧- جاری یەکەمە لە مێژووی ئەم عێـراقە داتاشراوە، کورد حزوورێک و ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبێت لە دانانی یاسـای بنەڕەتی وڵاتێک، کـە بێ حـەز و ئیـرادەی خۆی، بەگەل و نیشتیمـانیـەوە، ببێت بە پارچەیەکی. لەوەش گرنگتر، **ئـەو حزوور و ڕۆڵە مێژووییە، لە مەوقیعی بێ هێزی و بێ سەنگی نەبوو**، بەڵکو لە

ئەنجامی خەبات و بەرخودانێکی دوور درێژو خوێناوی و پڕ لە کارەسات و نەهامەتی و سەروەری و سەربەرزی تاکو رزگاری ئەم عێراقە لە سەدامی خوێنرێژو، بەشداری لە پاراستن و چەسپاندنی ئەو دەستکەوتانە بوو. بە واتەیەکی تر: **حزوورو رۆڵی کورد لەم هاوکێشە، منەتێک نییە لایەنەکانی عێراقی غەیرە کورد و هاوپەیمانان لە ئیدارەی مەدەنی عێراق پێی ببەخشن.**
بەڵام ئەوەی تەسبیت کراوە وەکو ماف، بەرەچاو کردنی هەموو کەموکوڕی و فرتوفێڵی دارشتنەوەی مادده و برگەکانی پەیوەندار، گشت خواست و بریار وئامانجەکانی کورد نییە لە چوارچێوەی ئەو (فیدراڵیەتەی) کە زۆربەی زۆری خەڵک و گشت هێزە سیاسیەکانی و، پەرلەمانی کوردستان بریاریان لە سەر دابوو، هەروەها لە ئاستی خواستی ئەو ١.٨ ملیۆن ئیمزایە نەبوو کە لە رێگای لیژنەی (ریفراندۆمەوە) کۆ کرایەوەو درا بە ئیدارەی مەدەنی داگیرکەری ئەمریکا لە بەغدا و ئەنجوومەنی دەسەڵاتی کاتی عێراقیش.

٨- پێش ئیمزا کردنی ئەم (دەستووره) کاتییە و جاردانی، دەرفەت نەدرا بە خەڵکی عێراق و موئەسەساتی مەدەنی (ئەوەی مابوو یان دروست ببوون)و، رۆشنبیران و پسپۆرانی بوارە جیاجیاکانی زانست، بۆ لێکوڵینەوە و تاوتوکردن و باسکردنی وەکو پێویست دەرفەتیان نەدرابێ، ئەوەی زیاتر لێرەدا مەبەستە لایەنی کوردیە، کە تاکو دەرچواندنی ئەم دەستوورە و بلاوکردنەوەی پێش چەند رۆژێک لە ئیمزا کردنی بە رەسمی، لە رێگای چەند کەناڵێکی عەرەبی راگەیاندنەوە، نە پەرلەمانی کوردستان کە بە (رەسمی) بەرپرسیارە لە بریاردان لەسەر کێشە چارەنووسسازەکانی کوردستان، بە پێی (برگە (٢)ی مادده (٥٦) یاسای ژمارە(١) ی ساڵی ١٩٩٢ یاسای هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی نیشتیمانی کوردستان «پەرلەمان»)، نە سەرکردایەتی و کادیرانی پێشکەوتووی زۆر لە لایەنە سیاسیەکانی کوردستانیش، وەکو دەزگاو بزوێنەری سەنتەری بریار، ئاگایان نەبوو لە تەفاسیل و دەقە رەسمییەکانی ئەو پرۆژەیە لە دوا دارشتنەوەیدا، هەر وەکو ئاگادارین. ئەگەر ئاگاداریش کرابن ئەوە تەنها سەرە قەڵەم و پوختەو خاڵە سەرەکییەکانی قۆناغی دوا دارشتنەوەی یاساکە بووە، هەر وەکو ئیمزاو جار درا. **چونکە ئەگەر پێش ئیمزاو جاردانی یاساکە پرۆژەکە بخرابایە بەردەمی پەرلەمانی کوردستان و سەرکردایەتی و**

**کادیرانی لایەنە سیاسییەکان و پسپۆڕان و رۆشنبیرانی کوردستان و، دەرفەت برەخسایە، بە شێوەیەکی وەها کە هەموو لایەک بەو پرۆژەیەدا بچنەوە، ئەوە دوور نەبوو زۆر لەو کەموکورییانەی یاساکە هەر لەو کاتەدا چارەسەر بکرایە و، ئاستەنگ و کۆسپەکان روون و ئاشکراتر دەبوون بۆ خەڵکی کوردستان و، پشت ئەستوور بەو فشارە، لایەنی کوردیش لە ئەنجوومەنی دەسەڵات دەیتوانی زیاتر پێ داگرێت و باشتریش مووناوەرە بکات...!**

رۆژی ٢٠٠٤/٣/١٠ لە رێگای رۆژنامەی (خەبات)ی زمان حاڵی پارتییەوە، دەقی ئەم یاسایە بە عەرەبی و کوردی بەرچاو کەوت. واتە پاش دوو رۆژ لە ئیمزاو جاڕدانی..!

ئەم جۆرە مامەڵە کردنە بۆ کێشەیەکی وەها چارەنووسساز تەجاوزە لەسەر دەزگا شەرعییەکانی کوردستان، کە هەمیشە لێپرسراوانی کورد جەختی لەسەر دەکەن و بە شان و باڵیدا لە کاتی پێویستدا هەڵدەدەن، هەروەها لاواز کردنی متمانەیە بە خودی ئەو دەزگایانە و لە دەستدانی مصداقیەتی ئەو لایەنانەیە لە نێو خودی ئەو دەزگا (رەسمی) و (حزبی)یانەو، بەرامبەر بە خەڵکی کوردستانیش، هەروەها لای دام و دەزگای داگیرکەری ئەمریکی و دۆستانی کوردو برایانی عەرەبی باڵادەستمانیش لە عێراق، **هەر بۆیە نیگەرانی و رەخنە یەکجار زۆرەو رێژەیەکی بەرچاوی جادەی کوردی تاکو رادەیەک تووشی نائومێدی و (احباط) بووە..!.**

٩- لە هەندێ مادده و بڕگەی پەیوەندار بە کێشەی کورد وا دەردەکەوێت کە شاندی کورد لە لیژنەی بڕیاردان و داڕشتنەوەی یاساکەدا ئاگایان لە پرۆسەی داڕشتن و تۆمارکردنی یاساکە نەبووە **وەکو یەک (پاکێت)** و لە رووی یاسایی و زمانەوانییەوە زۆر شتیان بەسەردا تێپەڕ بووە. جا چ فەرز کرابێت یان لە بێ ئاگایی و دڵپاکی، لە خەتی سووریان داوە. ئەگەر چی ئەمە جاری یەکەم نییە شاندی کورد لەسەر ماسەی گفتوگۆ هەلی لە دەست دەچێت، یان بە باشی سوودی لێ وەرناگرێت، بەڵام هیچ کات وەکو ئەمجارەیان نەبووە..!

(بە تایبەتی ئەگەر هاتوو تەرازووی هێز ورادەی هۆشیاری خەڵکی کوردستان و ئەو توێژە زۆرەی کورد لە زاناو پسپۆڕانی و ئەو هەموو دامودەزگا زانستیانەی کە هەمانە و بارودۆخی جیهانی و پێگەو پایەی کورد لە هاوکێشەی عێراق و

هاوپەیمانەکان)، بەراورد بکرێتەوە لەگەڵ هەڵەکانی پێشوو، با ئەم لاسەنگییە لە ژێر فشاریش بێت و، با فشارەکەش لایەنی ئەمریکی بێت، یان سەختیی و ئاڵۆزیی بارودۆخەکە بێت.

١٠- گەر چی بە پێی خودی ( ئەم یاسایە) (بالاترین یاسایە) لە عێراق و دەکرێت پێناسە بکرێت وەکو (دەستووری کاتی)، بەڵام بەدەر لە بەشی یەکەم و دووهەمی، لە واقیعدا زیاتر لە بەڵگەنامەیەکی لێک تێگەیشتن)=(**وثیقة التفاهم**) دەچێت. هەر وەکو یاساناسێک لە دەرفەتێکدا باسی کرد. لەو روانگەیەوە کە نە لایەنی ئەمریکی و نە ئەنجومەنی حوکم بۆیان نییە یاسای بالا (دەستوور) دەرچوێنن، چونکە بەدەر لە ویست و ئیرادەی خەڵکی عێراق حوکمرانی دەکەن ،وەکو یاساناسەکانیش دەڵێن (**مابني على الباطل باطل**). با ئەوەی ئامادەی کردووە و فشاری بە کار هێناوە ئەمریکاو هاوپەیمانانیشی بن.

بۆ ساغ کردنەوەی ئەو راستییانەی سەرەوە لێرەدا پێویستە ئەم پرسیارە بکەین: چین ناوەڕۆکی ئەو ماددەو بڕگانەی (**پەیوەندار بە کورد**)ەوە کە (مایەی مەترسی و نیگەرانین) لە یاسای (ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی)؟

لە سەرەتا ئاماژەمان بە دیباجەو بەشەکانی یاساکە کرد، هەر یەک لەو بەشانە کەم یان زۆر بە گشتی و بەتایبەتی، پەیوەندی بە تاک و بە کۆمەڵی کوردەواری و هەرێمەکەی و دامودەزگاکانیەوە هەیە. جگە لەمەش، ئەم (دەستوورە کاتییە) لە سەرەوەی یاسەکانی عێراق و هەرێمی کوردستانە وملزمە بۆ هەموو و، بنەمای دەستووری هەمیشەیی دوای قۆناغی ئینتیقالیشە. بۆیە مافێکی رەوای هەموو دامودەزگاو تاکێکی کوردە بە وردی و بە دیقەت ماددە بە ماددە وبڕگە بە بڕگە و بگرە زاراوەکانیش باش لە یەکبداتەوە و هەڵیسەنگێنێت، **چونکە ئەم (دەستوورە) بۆ تاک و بۆ کۆمەڵی کوردەواریمان چارەنووسسازە، نەک هەر بۆ ئەمڕۆ، بەڵکو بۆ ئایندەشی، چ وەکو (عێراقییەک) یان وەکو کوردێک، یان هەر چی نەبێت دیکۆمێنتێکە بۆ دوا رۆژ!**.

ئەمەی لێرەدا باسی لێوە دەکەین خوێندنەوەی دەقەکانی ئەم یاسایەیە وەکو هاتووەو، رایەک سەبارەت بە ناوەڕۆکی هەندێ لەو دەقانە و چی ئیجتهاد و پێشبینی ئەوتۆی

تێدا نییە ئەگەر بە دەگمەن شتی وەهاش بە دی کرا، ئەوە ئەو قاعیدەیەی بە سەردا پیادە دەکرێت کە دەڵێت: ئەگەر باش و دروست بوو، ئەوە دوو ئەجرە، ئەگەر واش نەبوو ئەوە یەک! و (سبحان من لا ینسی ولا **یخطئ**).
لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین تیشک بخەینە سەر:
* پێگەو مافی کورد لە دەسەڵاتی (یاسادانان)و، (کارگێڕی- بە هەردوو باڵەکەیەوە) ئەنجومەنی سەرۆکایەتی و ئەنجوومەنی وەزیران.
* راگوێزان و تەعریب وگەڕانەوەی قەوارەی ئیداری شارو شارۆچکەکانی کوردستان بۆ سنووری جوگرافی و نەتەوایەتی و ئیداری هەرێمی کوردستان.
* چارەنووسی کەرکوک.
* بەرەسمی ناسینی زبانی کوردی لە تەک زبانی عەرەبی لە عێراق.
* دەسەڵاتی ناوەندی ئیتیحادی و هەرێمی کوردستان.
* سەروەت وساماتی کوردستان.
وەکو پسپۆڕان و یاساناسان پێناسەی دەکەن، بە کورتی و بە کوردی دەستوور باڵاترین یاسایە بۆ هەر وڵاتێک، بۆیە زۆر جار بە یاسای: (بنەڕەتی)، (دایک)، یان (یاسای یاسایان) دەژمێردرێت. واتە لە هەر وڵاتێک نابێت ناوەڕۆکی هیچ یاسایەک یان بڕیارو دەقێکی یاسایی دیکە لە ناوەڕۆکی (دەستوور) دەرچێت .هەر لەم روانگەیەوە (یاسای ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی) ئەهمیەت و پایەبەرزی و گرنگی خۆی هەیە، جگە لە ناوەڕۆک. بڕوانە مادە (٣)ی ئەم یاسایە (**ان هذا القانون یعد القانون الأعلی للبلاد** ویکون ملزما في انحاء العراق کافة **وبدون استثناء.... الی اخر المادة**).
بۆ گەلی کورد، بە تایبەتی: **عیبرەت لە پرەنسیپەکانی نێو دەقی ماددە و بڕگەکان نییە، بەقەد چۆنیەتی داڕشتنی ماف و پرەنسیپەکان و میکانیزمی جێبەجێ کردنی و لە هەمووشی گرنگتر لە نێو دستووردا، بۆ ئێمەی کورد جگە لەوانە: دەسەڵات لە کوێ کۆ دەبێتەوە؟ کاریگەریمان لەسەر چارەنووسی بڕیار دان و زەمانات چیە..؟!**
ئەم دەستوورە کاتییە، (جگە لە پرەنسیپ و مافە بنەڕەتییەکان، کە کەم یان زۆر ناوەڕۆکی لە دەستوورەکانی وڵاتانی دیکەی سەر ئەم زەمینە و بگرە لە دەستوورەکانی عێراقی پێشوش دەچێت) و، بەدەر لە پرەنسیپە ئەساسیەکان و هەندێ لایەنی ماف و دەزگاکان بە گشتی، ئەوەی ماوەتەوە وەکو بڵێیت (چێشتی

مجێوره) و دووره له هەیکەلییەت و ناوەڕۆک ودارشتنەوەی (دەستوور)، له گەڵ ئەوەشدا وا پێناسه کراوه وەکو باڵاترین یاسا هەر چۆن باسمان کرد، بۆ قۆناغی ئینتیقالی و، بەو شێوەیەش کاری پێدەکرێت.
به پێی ئەم (دەستووره)، دەسەڵات (ترکیز) کراوه له (کۆمەڵەی نیشتیمانی) ئینتیقالی. وەکو دەزگای یاسادانان. هەندێکیش له (ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی) + (ئەنجوومەنی وەزیران) واته (دەسەڵاتی کارگێڕی به هەردوو باڵەکەیەوه). دەسەڵاتی دادوەریش جیا کراوەتەوه و، بایەخێکی زۆریشی پێدراوه ئەمەش له دەقی مادده پەیوەندارەکاندا بەدی دەکرێت جیا لەوەش، له چەند بوارێکدا (دەسەڵات) دراوه به دەزگاکانی هەرێمی کوردستان و پارێزگاو شارەوانیەکانیش.
ئەم ( دەستووره) کاتیه له رووی زبانەوانی و دارشتنی دەقی یاسایی و تیکرار، شارەزایانی ئەو بوارانه دەڵێن لاوازی و کەموکوڕی زۆری پێوه دیاره، ئەمەش پسپۆڕانی ئەو مەیانانه کاراما وشارەزاترن، دەکرێت ئەوان پتر لێکۆڵینەوه و باسی بکەن، ئەوەی بۆ ئێمه گرنگه، لێرەداو لەم دەرفەتەدا ماف و رۆڵی کوردو سنووری دەسەڵاتیەتی...هتد.

## یەکەم:
## دەسەڵاتی یاسادانانی (ئیتیحادی)

١-بە پێی مادده (٣٠) برگە (أ) :(دەوڵەتی عێراق لە قۆناغی ئینتیقالیدا دەسەڵاتێکی یاسادانانی دەبێت بە ناوی **کۆمەڵەی نیشتیمانی** کە وەزیفە سەرەکییەکەی دانانی یاساو چاودێری دەسەڵاتی تەنفیزییە.) دەقە عەرەبیەکەی:(يكون لدولة العراق خلال المرحلة الأنتقالية **سلطة تشريعية** تعرف بأسم **الجمعية الوطنية** ومهمتها الرئيسية هي تشريع القوانين والرقابة على عمل السلطة التنفيذية.)

٢-لەمادده (٣١) برگە (أ) دا هاتووە (کۆمەڵەی نیشتیمانی لە (٢٧٥) ئەندام پێکدێت). دەقە عەرەبیەکەی: (تتألف الجمعية الوطنية من ٢٧٥ عضوا"..).

٣-بە پێی مادە (٣٢) برگە (ب) **کۆمەڵەی نیشتیمانی** سەرۆک و دوو جێگر هەڵدەبژێرێ.

٤- بەپێی مادده (٣٣) برگە (أ) :(... هەموو بریارەکانی کۆمەڵەی نیشتمانیی بە **زۆرینەی سادە وەردەگیرێن** مەگەر دەقی ئەم یاسایە بەم شێوە نەبێ.) عەرەبیەکەی (... وتتخذ القرارات في الجمعية الوطنية **بالاغلبية البسيطة** الا اذا نص هذا القانون على غير ذلك.)

٥- لە مادەی (٣٦) برگە (أ)دا هاتووە:

(أ- **کۆمەڵەی نیشتیمانی سەرۆکی دەوڵەت و دوو جێگر** کە ئەنجومەنی سەرۆکایەتی **پێک دێنن، هەڵدەبژێرێ**، کە وەزیفەکەی نوێنەرایەتی سەروەری عێراق و سەرپەرشتی کاروباری گشتی وڵاتە، ئەنجومەنی سەرۆکایەتی بە یەک لیست و بە زۆربەی دوو لەسەر سێی دەنگەکان هەڵدەبژێردرێ.

ئەنجومەنی نیشتیمانی بۆی هەیە هەر ئەندامێک لە ئەندامەکانی سەرۆکایەتی دەوڵەت ناچار بکات بە زۆرینەی سێ لەسەر چواری دەنگەکان دەست لەکار بکێشێتەوە لەبەر بێ توانایی یا چەوت و چەوێڵی.

لە حاڵەتی پەیدابوونی (شاغر) لە دەستەی سەرۆکایەتیدا ئەندامانی کۆمەڵەی نیشتیمانی بە رێژەی دوو لەسەر سێی ئەندامەکان جێگرەوەیەک هەڵدەبژێرن بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە.)

**دەقە عەرەبییەکەی**: تنتخب الجمعية الوطنية رئيسا للدولة ونائبين له يشكلون مجلس الرئاسة التي تكون وظيفتها تمثيل سيادة العراق والاشراف على شؤون البلاد العليا. يتم انتخاب مجلس الرئاسة بقائمة واحدة وبأغلبية ثلثي اصوات الاعضاء. وللجمعية الوطنية صلاحية اقالة أي عضو من اعضاء مجلس الرئاسة باغلبية ثلاثة ارباع اصوات اعضائها لعدم الكفاءة او النزاهة. وفي حالة وجود شاغر في الرئاسة تنتخب الجمعية الوطنية بثلثي اعضائها بديلا له لملئ هذا الشاغر.)

٦- بە پێی مادە (٣٧):

( ٣٧- ئەنجومەنی سەرۆکایەتی دەتوانێت هەر بڕیارێک کە کۆمەڵەی نیشتیمانی دەریدەکات رابگرێت، ئەمەش **لە ماوەی پازدە رۆژ**، لەو مێژووەی کە سەرۆکی کۆمەڵەی نیشتیمانی ئەو بڕیارە بە ئەنجومەنی سەرۆکایەتی رادەگەیەنێ،لە کاتی راگرتنەکەدا، بڕیارەکە بۆ کۆمەڵەی نیشتیمانی دەگەڕێتەوەو کۆمەڵە دەتوانێ **لە ماوەی (٣٠) سی رۆژدا** جارێکی دیکە بڕیارەکە بە دوو لەسەر سێی دەنگەکان پەسند بکات، **کە ئەمجارەیان قابیلی راگرتن نییە**.)

**دەقە عەرەبییەکە**: يمكن لمجلس الرئاسة نقض أي تشريع تصدره الجمعية الوطنية. على ان يتم ذلك خلال خمسة عشر يوما من تاريخ ابلاغ مجلس الرئاسة من قبل رئيس الجمعية باقرار ذلك التشريع. وفي حالة النقض يعاد التشريع الى الجمعية الوطنية التي لها ان تقر التشريع **مجددا بأغلبية الثلثين غير قابلة للنقض خلال مدة لا تتجاوز ثلاثين يوما.**

واتە:

ئەنجومەنی سەرۆکایەتی دەتوانێت هەر یاساو بڕیارێک کە کۆمەڵەی نیشتیمانی دەریدەکات رابگرێت. بە مەرجێک:

* لە ماوەی ١٥ رۆژدا لە رۆژی راگەیاندنی بە (سەرۆکایەتی) و هەر لە کاتی راگرتنەکەدا ئەو یاسایە، یان ئەو بڕیارە بۆ کۆمەڵەی نیشتیمانی دەگەڕێنێتەوە. کۆمەڵەی نیشتمانی ئەم جارەیان ،لە ماوەی (٣٠) رۆژدا

دەتوانێ (جارێکی دیکە بە دوو لەسەر سێی دەنگەکان بڕیاری لە سەر بدات، کە ئەم جارەیان قابیلی **(ڕاگرتن نییە)** لەلایەن ئەنجومەنی سەرۆکایەتییەوە. واتە (مافی ڤیتۆ)ی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی نامێنێت واتە: **دەسەلاتی کۆتایی و یەکلاکەرەوە(حاسم) لای (کۆمەڵەی نیشتیمانی)یە.**

* بۆ دەستنیشان کردنی سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران ئەگەر ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی پێک بێن، یان نەیەن بە تێکڕای دەنگ لە سەر کەسایەتییەک **،ئەوە بڕیاری کۆتایی لای (کۆمەڵەی نیشتیمانی)یە**. ئەگەر (ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی) پێک هاتن ئەو کات (کۆمەڵەی نیشتیمانی) بە زۆرینەی رەها (الاکثریة المطلقة= نیوەی ئەندامانی کۆمەڵە+١) بڕیاری خۆی ئەدات بە پەسندکردنی پێشنیارەکەی (ئەنجوومەن) یان رەتکردنەوەی. ئەگەر ئەنجومەنی سەرۆکایەتی پێک نەیەن لەسەر شەخسی سەرۆک وەزیران، یان ژمارەی کابینەکەی یان لەسەر شەخسی وەزیرەکان بۆ نموونە، ئەوە دیسان **بڕیاری کۆتایی لای (کۆمەڵەی نیشتمانی)یە، تەنها جیاوازی ئەمجارەیان وەلاوەنانی هەڵوێست و دەسەلاتی (ئەنجومەنی سەرۆکایەتی) و، هەروەها رێژەی دەنگەکانی (کۆمەڵە)یە، کە ئەو کات دەبێت (٣/٢)ی کۆی گشتی ئەندامانی بێت کە = بە (١٨٣) دەنگ.**

* دیارە لە خودی ناوەڕۆکی ئەم ماددە و دەق و ماددەکانی دیکەی ئەم (دەستووره کاتییە) **هەموو دەسەلاتەکان کۆ کراوەتەوە لای (کۆمەڵەی نیشتیمانی)** ئیتر چی بە قۆناغێک بێت، یان بە دوو قۆناغ، واتە (حەسم) **لای ئەم کۆمەڵەیە، (حەسم)یش** بە دەنگدانە و، دەنگدانیش بریتییە لە **زۆرینە و کەمینە** و، بە هیچ شێوەیەک لە شێوەکانیش دەنگدان (رێژەی دەنگەکانی) گروپی کوردی رۆڵی (حاسم)ی نییە...! و کێشەکەش لێرەدایە ..!

**چۆن حاسم نییه؟**

وەکوو باسمان کرد ژمارەی ئەندامانی (کۆمەڵەی نیشتیمانی (٢٧٥) کەسە. ژمارەی کورد لەم کۆمەڵەیە لە چوارچێوەی ئەم (٣) ئەگەرە دەبێت:

**ئەگەری یەکەم:** ئەگەر هاتوو ڕێژەی کورد وەکو ژمارەیان لە ئەنجومەنی دەسەڵاتی کاتیدا کە(٥ ) کەسن لە کۆی گشتی(٢٥) کەس واتە ٢٠٪. بەم پێیە ژمارەی کورد لە (٥٥) ئەندام تێناپەڕێت.

**ئەگەری دووهەم:** وەکو کورد پێش ئێستا داوای کردووە واتە ڕێژەکەی (٢٥٪) بێ، ئەوە (٦٩) ئەندام دەبێت.

**ئەگەری سێهەم:** لەسەر ئەساسی پارێزگا بێت ئەوە دوور نییە ژمارەی کورد هەر لە چوارچێوەی ئەو دوو ژمارەیە بخولێتەوە، ئەگەر کەمتریش نەبێت.

لە هەر سێ حاڵەتدا بەرامبەر بە زۆرینەی برای عەرەبی باڵادەستمان و نوێنەرانی دیکەی غەیرە کورد گروپی کوردی کاریگەریەکی ئەوتۆی نابێت لە پرۆسەی دەنگدان. بە هەموو ڕێژە یاساییەکانی دەنگدان، لە کۆمەڵەی نیشتیمانی، چونکە هەر یاسایەک یان بڕیارێک ئەگەر ڕێژەی دەنگی بۆ تەحدید نەکرابێت بە دەق، ئەوە بە زۆرینەی سادە دەبێت. (الاكثرية البسيطة)، لە حاڵەتی وەهاشدا بۆ بڕیاردان لەسەر هەر یاسایەک لە دانیشتنێکی یاساییدا گروپی کورد بە لای کەمەوە پێویستی بە (٦٩) دەنگی دیکە هەیە، لە کۆی گشتی نیوەی ئەندامانی (کۆمەڵە+١). واتە دەنگی گروپی کوردی هیچ مەوقعێکی چارەنوسسازی تێدا ڕەچاو ناکرێت (خۆی بە خۆی)، چونکە بۆ ڕێژەی زۆرینەی ڕەها (الاكثرية المطلقة) لای کەمەوە **١٣٨** و، بۆ ڕێژەی (٣/٢)ی کۆی گشتی ئەندامان(**١٨٣**) و بۆ (٤/٣)ی کۆی گشتی ئەندامان **٢٠٦** دەنگ پێویستن .لێرەدا دەردەکەوێت لە هەر ئەگەرێک لەم ئەگەرانە گروپی کوردی ناتوانێت هیچ یاسا، یان بڕیارێک دەربکات، یان ڕاگرێت، ئەگەر ئەو جۆرە زۆرینەی لە پشت نەبێت. بە واتەیەکی دیکە ژمارەی ئەندامانی بلۆکی کوردی لە کۆمەڵەی نیشتیمانی ڕۆڵێکی ئەوتۆی کاریگەریان نابێت لەسەر چارەنوسی یاساو بڕیارەکانی کۆمەڵە، بێ پشتیوانی لایەنی زۆرینەی عەرەب و ئەندامانی دیکەی غەیرە کورد، یان لە هەر پرۆسەیەکی دەنگدان ئەگەر هاتوو (بە گشتی) زۆرینەی بلۆکی عەرەبی باڵادەست سووربێت لەسەری.

٧- ئەنجومەنی سەرۆکایەتی (کۆمەڵە) لە (٣) کەس پێک دێت وەکو لە سەرەوە باسمان کرد. یاساکە شێوەی هەڵبژاردنی و دەسەڵاتەکانی دیاری کردووە.. لەم یاسادا بە هیچ جۆرێک باسی نوێنەر، یان ڕێژەی (کورد)ی تێدا نەکراوە. واتە لە رووی یاسایی و دەستوورییەوە کۆمەڵەی نیشتیمانی کە لە نێوان خۆیاندا ئەو (٣) کەسە بە یەک لیست هەڵدەبژێرن مەرج نییە (کوردی) تێدا هەبێت، (ئەگەر لە دەرەوەی ئەم دەستوورە یان لە پاشکۆکەی ئاماژەی بۆ نەکرێت)، ئەگەر هەبێتیش ئەوە ئەو (کوردە) لەم دەزگایە مۆرکی نەتەوایەتی پێوە نییەو لەبەر ئەوە هەڵنابژێردرێ، چونکە (کوردە)، چونکە دەقە یاساییەکەی مولزەم و رەها نییە کە دەبێت نوێنەری گەلی کورد لەوێ هەبێت، دەکرێت نەبێتیش، **لێرەدا مەبەست لە پشت راستی و رەهایی** پێگەو رۆڵی گرووپی کوردییە بۆ زامن کردنی مافەکانی کورد، کە خۆی بە تەنها هیچی پێ ناکرێت وەکو نوێنەرایەتی میللەتی کورد لە نێو زۆرینەیەکی وەها (رەها)دا، کە مۆرکی نەتەوایەتی پێوە نییە هەر هەمان شت سەبارەت بە (ئەنجومەنی سەرۆکایەتی= مجلس رئاسة الدولة)یش لەوێشدا پۆستێکی نەتەوایەتی بۆ (کورد) تەرخان نەکراوە بە دەق.

٨- دامەزراندن و دەسەڵات و لابردنی(ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی) بەدەستی کۆمەڵەی نیشتیمانییە. بڕیارەکانی (ئەنجوومەن) بە کۆی دەنگە واتە بە(تەوافق)ـە، بەڵام هەر کات پێک نەهاتن کێشەکە دەگەڕێتەوە بۆ (**کۆمەڵەی نیشتمانی**)، لەوێش وەکو باسمان کرد کورد دەسەڵاتی سنووردار کراوە بە ژمارە و، چی دەقێکیش نییە وەکو (گەرەنتی- ضمان) مافی کورد، یان هەڵوێستی کورد بپارێزێت لە پرۆسەی (دەنگدان)، جگە لەو پرنسیپ و مافانەی کە لە خودی (دەستورەکە)دا ئاماژەی بۆ کراوە، بۆیە ئیعتراز و راگرتنی هەر یاسا و بڕیارێک لەلایەن نوێنەری کوردەوە لە (**ئەنجومەنی سەرۆکایەتی**)، ئەگەر هەبێت، زیاتر (شکلیە)و، لە واقعدا **ناتوانێت هیچی وەها بگۆڕێت**. هەبوونی کورد لەم ئەنجومەنە جگە لەلایەنی **مەعنەوی** بەشداربوون، **لە واقعی عەمەلیدا گەرەنتی نییە وەکو زۆر کەس بەو شێوەیە باسی دەکات یان لێی تێگەیشتووە** و، هەوڵیش دەدرێت لە ناو خەڵکی کوردستاندا بۆچوونی وەها بچەسپێت..!، ئەمەش راست و ڕەوا نییە.

## پوختەکەی

لەپوختـەی ناوەڕۆکی دەقی هەندێ لەو مـاددە و بڕگـانە کـە پەیوەندیان بە خـاڵی سـەرەوە هەیە سـەبارەت بە کـورد و بەشی دەزگـای یاسـادانان و هەردوو بـاڵەکـەی (کارگێڕی)، دەردەکەوێت :

١- بـۆ **کۆمەڵەی نیشتمانی**: یاساکە بە هیچ شێوەیەک باسی ژمارە، یان ڕێژەی نەتەوایەتی کـوردی تێـدا نیـیـە. بە واتەیەکی دیکە لەو (٢٧٥) ئەندامـەی کـۆمـەڵەی نیـشـتـیـمـانی ئاماژە نەکـراوە دەبێت چەندی کـورد بن، یان باسی چۆنیەتی پێکهاتەی **سەرۆکایەتی** ئەم دەزگایە نەکراوە، کە ژمارە و پلەی کورد چەند و چۆن دەبێت. وەکو پرنسیپ دەقەکان بە (ڕەها)یی هاتووە. **واتە کـورد وەکو هەر هاوولاتیەکی دیکەی عێراق حزووری دەبێت لەو دەزگایە نەک لـەسەر بنەمـــای نەتەوایەتی**، (تەنانەت ئاماژەش نەکـراوە بە زاراوە داتاشـراوەکـەی (جوگـرافی مێژووی وەکو پەردە پۆشێکی فـیدراڵیـەتی پارێزگاکـان). واتە لە کۆمەڵەی نیشـتـیمـانی وەکو تەنها دەزگای یاسادانانی عێراقی (ئیتـیحادی)، **حزووری کورد چ مۆرکێکی نەتەوایەتی پێوە دیار نییە**، ئەمەش دوورە لە واقع وداخوازی ئەو فیدراڵیەتەی کە کورد داوای کردو لەپێناویدا خوێن وفرمێسکی ڕشت.

٢- لەم دەزگـایەدا ژمـارەی کـورد کـەمـینە دەبێت و هیچ (گـەرنتی- ضـمـان)ێکی یاسایی نییە، مافەکـانی کورد لە هەڵوێست و بڕیاری زۆرینە بپارێزێت، بۆیە کـێشـەکـانمان دەکـەونە ژێر ڕەحـمـەتی زۆرینەی غـەیرە کـوردی نێـو کـۆمـەڵەی نیشتمانی.

٣- لە دەسەڵاتی کارگێڕی بە هەردوو باڵەکەیەوە (ئەنجوومەنی سەرۆکـایەتی) و (سەرۆک وەزیران و ئەنجوومەنی وەزیران) کە ئەمەی دووهەمیـان دەسەڵاتێکی یەکجار فراوان و گرنگی هەیە،(بڕوانە ماددە ٢٥ی ئەم دەستووورە)، **هەمـــان شت دووپات دەبێتەوە کە لە خاڵی (١)ی سەرەوەدا باسمان کرد.**

باشە ئەگەر ئەو (فیدراڵییەت)ـە کە لەسەر ئەساسی (جوگرافی و مێژووی)ی دیاری کراوە لەم (دەستـووره کـاتییـە)دا، ماناکەی (فـیـدراڵیـیـەتی جوگرافی نەتەوایەتییـە)، هەر وەکو هەندێ لە بەرپرسـانی کورد باسی لێوە دەکـەن، یان

روونتر بەپێچەوانەی ماددە چواری (ئەم دەستوورە) وەکو پێناسەی رژێمی دەسەڵاتی ئایندەی عێراق:

المادة الرابعة: النظام في العراق جمهوري اتحادي (فيدرالي)*، ديمقراطي، تعددي ويجري تقاسم السلطات فيه بين الحكومة الاتحادية والحكومات الاقليمية والمحافظات والبلديات والادارات المحلية. ويقوم النظام الاتحادي على أساس الحقائق الجغرافية والتاريخية والفصل بين السلطات **وليس على أساس الاصل او العرق او الاثنية او القومية او المذهب.**

دەڵێین باشە ئەگەر یەکەیەکی (جوگرافی مێژوویی) لە نەژاد و رەگەز و رەسەنی و **نەتەوایەتی و مەزهەب رووتکەیتەوە تۆ بڵێیت چی تری تێدا بمێنێتەوە..؟!**، لە غەیری یەکەیەکی فەردی (هاووڵاتی) ئیداری! واتە پارێزگا!. ئەی کوا **مۆرکی نەتەوایەتیمان و بەش وریژەو زمانانی کورد..!** دەقەکانی ئەم بابەتە کە لەم (دەستووره) دا چەسپ کراوەو، **حزووری کورد لەم دەزگایانە، جگە لە مافی هاووڵاتی و لەسەر ئەساسی (پارێزگا) چی تر نییە**. ئەوەی سەرنج رادەکێشێت ئەو یەکە فیدراڵییەتە، یان فیدراڵییەتەکان کە بڕیارە دروست بکرێن، لەسەر ئەساسی (..الحقائق الجغرافية والتاريخية والفصل بين السلطات **وليس على أساس الاصل او العرق او الاثنية او القومية او المذهب...الغ. ماددە «٤»)**، باسی **ئاینی تێدا نییە لە یاساکە** لەو ماددەیە بۆ دامەزراندنی **یەکەیەکی فیدراڵی جیاوازی (ئایین)ی نیستیسنا نەکردووە**، کەچی **رەگەز و نەتەوە**..هتد، **ئیستیسنا کراوە** و نابێت یەکەیەکی فیدراڵی لەسەر ئەو بنەما، یان ئەو بنەمایانە دامەزرێت...! واتە دەکرێت فیدراڵییەت **لەسەر بنەمای (ئایین) دابمەزرێت**.. بۆ نموونە وەکو تیۆری برا مەسیحیەکانی عێراق یان کەسانێکی دیکەی غەیرە (ئیسلام) لە عێراق بۆیان هەیە داخوازی فیدراڵییەت بکەن بەپێی جیاوازی (ئایین)، بەڵام کورد بۆی نییە فیدراڵییەتەکەی لەسەر بنەمای رەگەز، یان نەتەوە دامەزرێنێت، یان فیدراڵییەت نابێت لەسەر ئەساسی (مەزهەب) دروست بکرێت..!

* لە کاتێکدا یاساکە لەم ماددەیە بەو شێوەیە پێناسەی (رژێمی عێراق) دەکات، کەچی خودی ناوی یاساکە بە (یاسای بەڕێوەبردنی ئیداردی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی) تەسبیت کراوە، نەک [دەوڵەتی (ئیتیحادی) یان (فیدراڵی) عێراق]، هەروەها تاکو ئێستاش بە رەسمی عێراق بە (جمهوريه العراق) ماوەتەوە لە ناوەوەو لە دەرەوەیش، نووسراو دروشمە رەسمییەکان بەو شێوەیە، ئەمەش دژی خودی پێناسەی عێراقە، کە لەم دەستوورە کاتییە هاتووە!

جارێکی دیکەش دەڵێین ئێمە لێرەدا دەقەکان دەخوێنینەوە. دەقەکانیش (رەها)نە، کەسیش دڵ ودەروونی موشەریع ناخوێنێتەوە. و سیاسەت بەنیەت نییە. ململانێکە و پیادەکردنی ئەنجامەکانی هەر لەسەر ئەو دەقانە دەبێت. وەکو دەڵێن: (شەیتان لە تەفاصیل دایە). **تەهمیش ولاواز کردنی دەسەلاتی کورد، یان ئیحتوا کردنی کێشەکەی وەکو خاک و، وەکو گەل هەر یەکە**، چ بە زۆر و زەبری چەکی کیمیاوی و کۆمەڵکوژی و، چ لە گەمەیەکی دیموکراسیدا، کە تێدا کورد کەمینەیە و هەر لە سەرەتاوەش دەزانێت دەیدۆڕێنێت، جگە لە دەقی گومان لێکراو وبۆسە ئاسا..!

دەقەکانی ماددە و بڕگە پەیوەندارەکان روونن، هەر وەکو لە سەرەوە ئاماژەمان پێکردووە، لەگەڵ ئەوەش لە راگەیاندنی زۆربەی لایەنە کوردیەکان و لە زۆربەی کۆڕو کۆبوونەوە رەسمییەکاندا، راستییەکان وەکو هەیە ناخرێنە روو، یان بە رستەیەکی وەکو: **(ئەگەر چی هەندێ کەموکوری زەچاو دەکرێت لەم یاسایە)... (هەموو شت بە دڵی کورد نەبوو)... (ئەم دەستوورە بۆ قۆناغی ئینتیقالییە)... (هەر ئەوەندەمان پێ کرا)**... هتد. کێشەکە پەردە پۆش دەکرێت.

**پاشە :**

کێ ئیجباری کورد دەکات یاسایەک پەسند کات، کە هەر لە سەرەتاوە باش دەزانێت لە کێشە چارەنووسسازەکان و دروست کردنی **بڕیار پاشکۆیە و هیچی پێ حەسم ناکرێت و، وەکو کەمینە لە پرۆسەیەکی (دیموکراسی)دا دەیدۆڕێنێت**..؟! ئەمە وەکو بڵێیت فێڵ کردنە لە خۆ...!

ئەگەر پیاوەتیە ئەم (پیاوەتیە) هیچی وەهای پێوە نایەت، جگە لەسەرئێشە بۆ بڕیاردەری کورد و دوور خستنەوەی جەماوەری کوردستان لە پێچ وپەنای کێشەکەی و، تەهمیش کردنی رۆڵی ئەم جەماوەرە لە دوا بڕیاری چارەنووسی خۆی..؟!

ئەگەر مروونەت وشەفافیەتە بۆ دەبێ کورد هەمیشە کێشەی خۆی بکاتە قۆچی قوربانی بۆ خەڵکی دیکە..؟!

ئەگەر فەرز کراوە بۆ قەبووڵ بکرێت؟! کە قەبووڵ نەکردنیش مەرج نییە بە شەڕو دوژمنایەتی کردنی ئەمریکا بێت...!

## دووهەم:
## تەعریب و راگوێزان و گەڕانەوەی تەواوی ئیدارەی شارو شارۆچکەکانی کوردستان بۆ دۆخی جارانی کۆنی خۆی و، چارەنووسیان بەپێی بەندەکانی ئەم یاسایە.

بەپێی ئەم دەستوورە کاتییە دەکرێت بڵێین:
ئەم کێشەیە بە (٣) قۆناغی سەرەکی ئەنجام دەدرێت هەر وەکو لە مادە (٥٨) دا هاتووە:

٥٨-أ- : (حکومەتی ئینتیقالی عێراق و بەتایبەت دەستەی باڵای چارەسەرکردنی کێشەکانی موڵکایەتی زەویوزار و هەر لایەنێکی دیکەی پەیوەندیدار **بە پەلە** ئیجرائی پێویست دەکەن بۆ هەڵگرتنی ئەو زوڵمەی بەهۆی کردەوەکانی **رژێمی پێشوو** روویداوەو بۆتە هۆی گۆڕینی دیمۆگرافیای چەند ناوچەیەکی دیاری کراو (لەنێویاندا کەرکوک) لە رێی گواستنەوە و نەفی کردنی خەڵکانێک لە شوێنی نیشتەجێ بوونیان و، لە رێی راگواستنی زۆرە ملێ لە ناوچەکە و دەرەوەیدا و نیشتەجێ کردنی خەڵکانی غەریب وغەوارە بە ناوچەکەو، بێبەش کردنی دانیشتوان لە کار کردن و هەروەها لە رێی (تصحیح القومیة)وە.

**بۆ چارسەری ئەم زوڵمە پێویستە حکومەتی ئینتیقالی ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بنێ:**

**هەنگاوی یەکەم:**

١- سەبارەت **بەهاوردە ونەفی کراو و راگوێزراوەکان وکۆچ پێکراو و کۆچبەرەکان،** بە گونجاندن لەگەڵ یاسای هەیئەتی باڵای چارەسەریی کێشەکانی موڵکایەتی زەوی وزار و ئیجرائاتە یاساییەکانی دیکە، ئەرکی حکومەتە کەلە **ماوەیەکی ماقوولدا** ئەو هاوردانە بگەڕێنێتەوە سەر ماڵ و موڵکی خۆیان، **ئەگەر ئەوەش نەتواندرا**، پێویستە **حکومەت قەرەبوویەکی عادیلانەیان بکاتەوە.**

٢- سەبارەت بەو کەسانەی بۆ ناوچە وجێگەی دیاری کراو گوێزراونەتەوە دەبێ حکومەت بەپێی مادەی (١٠)ی یاسای هەیئەتی باڵای چارەسەریی کێشەکانی موڵکایەتی زەوی و زار مامەڵەیان لەگەڵ بکات لەپێناو زامنکردنی **دووبارە نیشتەجێ کردنەوەیان، یاخود بۆ زامن کردنی ئیمکانیەتی قەرەبووکردنەوەیان**

**لەلایەن دەوڵەتەوە، یاخود ئیمکانیەتی بەخشینی زەویی دیکە پێیان لەلایەن دەوڵەتەوە و لە جێیەکی نزیک شوێنی نیشتەجێ بوونیان لەو پارێزگایەی کە لێوەی هێندراون، یاخود ئیمکانیەتی قەرەبوو کردنەوەیان** لە جیاتی ئەو تێچوونەی لە گواستنەوەیاندا بۆ ئەو ناوچانە کەوتۆتە سەریان.

٣- سەبارەت بەو کەسانەی لە دامەزراندن یاخود لە دەرفەتی دیکەی خۆ ژیاندن مەحروم کراون بە مەبەستی ئەوەی ناچاریان بکەن هیجرەت بکەن و هەرێم و زەوییەکانیان بە جێ بهێڵن، **پێویستە حکومەت هانی ئەوە بدات** دەرفەتی نوێی کاریان لەو ناوچەو زەوییانەدا دەست بخات.

٤- سەبارەت بە (تصحیح القومیة)ش، پێویستە حکومەت هەموو ئەو بڕیارانەی پەیوەندیدارن بەو مەسەلەیەوە ئیلغایان بکاتەوەو ڕێگە بدات ئەو خەڵکە زیان لێ کەوتووانە بە بێ زەبرو زۆر و فشار مافی خۆیان لە دیاری کردنی ناسنامەی نەتەوەیی و ئینتیمای نەژادیی خۆیان پیادە بکەن). جێبەجێ کردنی ئەم ئیجرائاتە هەنگاو بە هەنگاو دەبێت:

**هەنگاوی یەکەم:** بەپێی یاسای هەیئەتی باڵای چارەسەری کێشەکانی موڵکایەتی زەوی و زار و ئیجرائاتە یاساییەکانی دیکە، حکومەتی ئینتیقالی لە ماوەیەکی **ماقووڵدا** ئەوکەسانەی کە ماددەکە دەیان گرێتەوە چارەسەری کێشەکانیان بکرێت. لێرەدا چەند تێبینییەک زەق دەبێتەوە:

**تێبینی یەکەم:** لەم دەقە ئەوەی ڕەچاو دەکرێت: ئەم ئیجرائاتانە کە لە بڕگە وخاڵەکانیدا هاتووە، **تەنها تاوانەکانی تەعریبی ڕژێمی سەدام دەگرێتەوە**، بڕوانە ڕستەی (هەڵگرتنی ئەو زوڵمەی بەهۆی کردەوەکانی **ڕژێمی پێشوو** ڕوویداوەو بۆتە هۆی گۆڕینی دیمۆگرافیای چەند ناوچەیەکی دیاری کراو (**لەنێویاندا کەرکوک**). بە واتایەکی تر تەعریبی سەردەمی ڕژێمی پێش قاسم و قاسم یان بەعسی ساڵی ١٩٦٣ یان سەردەمی هەردوو عارفی برا ناگرێتەوە. (ئەم تەحدیدە لە چەند جێگایەکی دیکەی یاساکە دووپات دەبێتەوە، بۆ نموونە: بڕوانە ماددە (٦).

له کاتێکدا رووبەرێکی زۆر لە کوردستانی عێراق (پێش رژێمی پێشوو)و لەسەر دەستی حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق تەعریب کراوە.

**تێبینی دووەهەم:** رستەی (**ئەگەر ئەوش نەکرا**،پێویستە حکومەت قەرەبوویەکی عادیلانەیان بکاتەوە.)، دوو لایەنەیە:

**یەکەمیان:** کێشەکە پەیوەندی بە هەزارەها (مقیم)ی ئەو دەڤەرانەوە هەیە، کە نزیکەی نیو سەدەیە دوور خراونەتەوە لە شارو شارۆچکە وگوندی خۆیان. بەتایبەتی زۆر لە مانە کارمەند و کرێکارو خاوەن وەزیفەی رەسمی بوونە، یان کەسوکارو منداڵیان گەورەو خاوەن ماڵ و خێزان وکارو وەزیفەن.

**دووهەمیان:** نەگەڕاندنەوەی چ (خۆیان) یان (خێزانیان) بۆ سەر کاروبارو وەزیفە و جێگای خۆیان، مولزەم نییە، بڕوانە بڕگە (٣) رستەی (**پێویستە حکومەت هانی ئەوە بدات**...) دارشتنی ئەم لایەنە (**بەپێی دەقێکی وا کراوە و مژاویی**)، کاریگەرییەکی راستەوخۆی دەبێت لەسەر خودی ئەو خەڵکە لە رووی چۆنیەتی و شێوەی گەڕانەوەیان، هەروەها رێژەی کورد لەو دەڤەرانە بەتایبەتی ئەگەر هاتوو لایەنی جێبەجێکەر (تەنفیزی) نیازی دانانی کۆسپ و تەگەرەی هەبێت سەبارەت بە گەڕانەوەی ئەوانەی مەبەستن، بە هەردوو لایەنەکەوە: کوردەکان بۆ ناوچەکانی خۆیان و، تەعریبچییەکان بۆ جێگای کۆنی خۆیان. یان ئایا چارەنووسی ئەو یەک دوو (نەوەیەی) کوردە دەربەدەرەکان و تەعریبچییەکان کە لەو دەڤەرانە لە دایکبوون چی لێ دێت؟ تۆ بڵێیت ئەمانە کە لەو ناوچانە لە دایک بوونە بە (هاوردە) لە قەڵەم بدرێن، یان بە دانیشتوانی..هتد..؟!

**تێبینی سێیەم :** لە بڕگەکانی ئەم ماددەیەدا ژمارەیەک دەستەواژەی جیاجیا بەکار هێنراوە، دوور نیە لە کاتی پیادە کردنی ببێتە مایەی دروست کردنی کۆسپ و لەمپەر. دەستەواژەکانیش لە رووی یاسایەوە دەکرێت بە چەند شێوەیەک پێناسە بکرێن، واتە هەر لایەنێک بەپێی سوود و بەرژەوەندی خۆی، لەو دەستەواژانە تێدەگات و تەفسیر و ئیجتهادی بۆ دەکات و، دەیخوێنێتەوە: (مقیم) (غریب) (غەوارە)، (هاوردە)، (نەفی کراو) (راگوێزان)، (کۆچ پێکراو)، (کۆچبەر)، (**ماوەیەکی ماقوول**)، (عادیلانە) (هانی ئەوە بدات لەو جێگایانە.. هتد).

کێشەی تەعریب زیاتر پەیوەندی بە (لای کەمەوە)بە دوو لایەنەوە هەیە و **لە کێشەیەکی سیاسیەوە کراوە بە کێشەیەکی یاسایی**. دەقی یاساییش ئیجرائاتی یاسایی لێ دەبێتەوە، واتە هەر یەک لەم زاراوانە **قابیلی پێناسە و تەفسیرات وئیجتهادی جیاجیایە و(مدعي) و (مدعي علیە)** لێ راست دەبێتەوەو، چەند زاراوە زۆر بن وچەند دەق درێژو نادیارین، ئەوەندە گرفت و کێشەی لێ دەبێتەوە. بۆیە یەک لە پرەنسیپە گرنگەکانی دارشتنی هەر دەقێکی یاسایی: (**دیقەت و کورت و روون**)یە. ئەگەر پرۆسەکە لە هەموو ئەو لەمپەرانەش ساغکرایەوە، **ئەوە:**

**هەنگاوی دووهەم:**

بەوە دەستپێدەکات، ئەوەش قۆناغی جێبەجێکردنە، کە ئەرکی حکومەتی ئینتیقالی* دەبێت، بە هەموو ئەو زاراوانە و یان

* (قۆناغی ئینتیقالی) بە پێی یاساکە کراوە بە دوو بەش (بڕوانە مادە«٢»ی یاساکە).
بەشی یەکەم: لە (٢٠٠٤/٦/٣١) تا (٢٠٠٥/١/٣١)، کە بە ماوەی (حکومەتی کاتی) پێناسە دەکرێت.
بەشی دووەمیان: لە (٢٠٠٥/١/٣١)تا (٢٠٠٥/١٢/٣١)، کە بە ماوەی (حکومەتی ئینتیقالی) پێناسە دەکرێت.
قۆناغی ئینتیقالی ئەگەرچی کراوە بە دوو بەش، بەڵام هەر یەک قۆناغە! دوور نییە ئەمەش ببێتە تەگەرەیەک لە کاتی پیادەکردنی ماددەکانی پەیوەندیدار بە تەعریب.

(ئەگەرانە)وە، سەرەڕای تەدەخولاتی هێزەکانی ناوخۆ ودەرەکی و ئەوەی بە دیقــەت وردبێـــتــەوە لە ناوەڕۆکی دەقــەکــانی ئەم دەستــووورە، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بەم خاڵانەوە هەیە، هەر لەســەرەتاوە هەست **بە گومـان دەکات، کەچی کێشـەی کورد لە عێراق لە چواچێوەی گومان دەرچووە**، بگرە خوێن و مـاڵوێرانی و کـارەسـاتی جـینۆسـایدی لێ بووەتەوە. ناوچەی ئارامی بۆ دیار کــرابـوو بەپێی بڕیاری نێـــودەوڵەتی، ئەوە (١١) ســـاڵە لەناوچەکـانی ئارام و ئازاد حـوکـمـڕانی خـۆی دەکـات بە پێی پرۆســەیەکی هەڵبــژاردنی ئازاد و دیموکـراسی و، ئێـســتــا بە ڕەزامەندی خۆی وازی لەو هەموو دەسکەوت و ئازادییە هێناوەو بووەتە بەشـێک لە پرۆسەی ڕزگـاریی عـێـراق لە ڕژێمی سـەدام و داگیرکردن و ئیدارە کردنی ئەم عێراقە لەگەڵ هێزەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانانی و لایەنەکـانی دیکەی عـێراقی. سـەرەڕای ئەوەش لایەنی عـەرەبی بالادەست کـە ڕووبەڕووی کـوردیان کـردۆتەوە بە پێی دەقی ئەم یاسایە گومانی هەیە لە هەڵوێستی کورد. ئەگەر ئەو گومـانەش نەبوایە ئەوە دەقەکان وداڕشتنەوەی ئەم یاسـایە بەو شێـوە نەدەبوو کە لە بەردەسـتدایە. ڕوونتـر ئەگەر ئەو گـومـانەش نەبوایە کـار نەدەگەیشـتـە باری ئێـسـتـا. دەبێـتـیش ئەوە لە بیـر نەکەین، هەر بە پێی بەندەکـانی ئەم (دەسـتـووورە) تەرازووی هێز بەلای زۆرینەی عـەرەبی (برامـان) دا دەشکێـتـەوە. چونکە کـورد لەم بارەیەوە، چی مـافـێکی وەها (ڕەها) ی ڕوونی نییـە بۆ زامن کـردنی ئەو کـێـشـانەی کـە مـایەی دووبەرەکێ و خـیـلافـە.واتە حەسمی کۆتایی لای زۆرینەی عـەرەبی بالا دەسـتـە، هەر وەکـو لە خاڵەکانی دیکە باسی دەکەین.

**هەنگاوی سێیەم:**

هەتـاکـو ئەگـەر هـاتوو هەمــوو ئەو کـێـشـانـە کـە لـە بڕگـە (أ) بە هەر(٤) خـاڵەکـەیەوە هاتووە ئەنجـام بدرێت وبە دڵـی کـوردیش بێت (کـە لە زۆر ڕووەوە لە حـوکـمی مـەحـاڵە : چونکە ئەسـڵی

پرۆسەکە خیلافی لەسەرەو وردەکاری زۆری دەوێت و زۆر لە زاراوە و رستە یاساییەکانی پێناسە و بۆچوونی جیاجیا بەخۆوە دەگرن..هتد)، **ئەوە حەسم کردنی تەعریب و گۆڕینی قەوارەی نەتەوایەتیمان وبە تەحدید سنووری کوردستان دەکەوێتە حوکمی برگە (ب)ی مادە (٥٨):**

٥٨-ب، کە دەڵێ:

(رژێمی پێشوو بە مەبەستی سیاسی سنوورە ئیدارییەکانی دەستکاری کردووەو گۆڕیونی، بۆیە پێویستە لەسەر سەرۆکایەتی و حکومەتی ئینتیقالی عێراق **راسپاردە پێشکەش** ئەنجوومەنی نیشتیمانی بکات لە پێناو چارەسەر کردنی ئەو گۆڕین و دەسکارییە ناعادیلانەیە، لە حاڵەتێکیشدا ئەگەر سەرۆکایەتی نەیتوانی **بە کۆی دەنگ** لەسەر **چەند راسپاردەیەک** رێککەوێت، ئەوا پێویستە ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی **بە کۆی دەنگ ناوبژیوانێک دامەزرێنێ** بۆ دیراسەت کردنی کێشەکەو پێشکەش کردنی راسپاردە، خۆ ئەگەر ئەنجومەنی سەرۆکایەتیش نەیتوانی لەسەر ناوبژیوانێک رێککەوێ، ئەوا پێویستە لەسەر ئەنجومەنی سەرۆکایەتی **داوا لە ئەمینداری گشتی نەتەوەیەککرتووەکان** بکات، کە کەسایەتییەکی نێودەوڵەتی ناسراو و بەرێز بۆ ئەو **دادوەرییە** دامەزرێنێ.)

(المادة ٥٨- ب- : - لقد تلاعب النظام السابق ايضاً بالحدود الادارية وغيرها بغية تحقيق اهداف سياسية، على الرئاسة والحكومة العراقية الانتقالية تقديم **التوصيات الى الجمعية الوطنية وذلك لمعالجة تلك التغييرات غير العادلة**. وفي حالة عدم تمكن الرئاسة الموافقة **بالاجماع** على مجموعة من **التوصيات**، فعلى مجلس الرئاسة القيام **بتعيين محكم محايد** وبالاجماع لغرض دراسة الموضوع **وتقديم التوصيات**. وفي حالة عدم قدرة مجلس الرئاسة على الموافقة على محكم، فعلى مجلس الرئاسة **ان تطلب من الامين العام للامم المتحدة** تعيين شخصية دولية مرموقة للقيام بالتحكيم المطلوب.)

به کـورتی وبه کـوردیەکی سـادە : **کێشـەی گێڕانەوەی یەکـە ئیدارییەکـانی کـە لە کـوردسـتـان دابڕێنراون و هەڵوەشـانەوەی گـۆڕینی قـەوارەی نەتەوایەتی ناوچە کوردستـانیـە پەیوەندارەکـان و بنبڕ کـردنی سیـاسـەتی تەعریب بە یەک جـاری، لەم قۆناغـە دەگەڕێتـەوە بۆ بڕیاری کۆتایی (کۆمەڵەی نیشتیـمانی)، هەر ئەمـەش خاڵ و هەنگاوی حاسیمە**. جا بابزانین یاریەکە لە کوێیە وپرۆسەکە کە هەنگاو بە هەنگاو بە یەکەوە گرێ دەدرێت دەگات بە کوێ...؟

ناوەڕۆکی جێبەجێ کردنی ئەم بڕگەیە ئەوە دەگەیەنێت کە نەخشەی پارێزگاکان، کە لەلای ئێـمـەی کـورد مـەبەسـتن: (کـەرکـوک، تکریت، دیالە ،مـووسڵ، سلێـمـانی، هەولێـر، دهۆک) دەبێت دەسکاری بکرێن. بە واتـەیەکی دیکە: گـەڕانەوەی ناوچەی (دووزخورماتوو) کە ئێسـتـا لەسەر (پارێزگای (تکریت)ە و، (کـفری) کە ئێسـتـا لەسـەر پارێزگـای (دیالە)یە و، (کـەلار) و (چەمـچـەمـاڵ) کـە لەسـەر پارێزگـای (سلێمانی)ن بۆ پارێزگای کەرکوک و (خانەقین ومەندەلی..هتد کە لەسەر پارێزگای (دیالی)ن و، سنجارو تەلەعفەرو زمار و شێخان ومەخموور..هتد، کە ئێستا سەر بە پارێزگـای (مـووسڵ)ن، بۆ باوشی هەرێمی کـوردسـتـان، **بە بڕیاری (کـۆمـەڵەی نیشتیمانی) دەبێت** و، بەم شێوەیە:

١- **(ئەنجومەنی سەرۆکایەتی)و حکومەتی عێراقی ئینتیقالی لە حاڵەتێکدا ئەگەر رایان یەک بێت وچ گـرفت لە نێـوانیـاندا روو نەدات و مـوتەفـیق بن لەسـەر گێڕانەوەی یەکـە ئیدارییـەکـانی کـوردسـتـان، کـە ئێسـتـا دابڕاون لە هەرێمی کـوردسـتـان**، واتە (سنووری کوردستان) و، (با هەندێ پۆزەتیڤانەش یاساکە بخـوێنینەوە) و، بڵـێین یەک لەو (٣) ئەندامـەی (ئەنجـومـەنی سـەرۆکـایەتی) کـوردە، کـوردەکـەش سـوورە لەسـەر ئەوەی: هەمـوو ناوچە دابڕاوەکـانمان لەو (هەرێمـەی کـە یاسـاکـە دیاری کـردووە) دەبێت بگەڕێتـەوە بۆ سـەر هەرێمی کـوردسـتـان، دوو ئەندامـەکـەی دیکەی (سـەرۆکـایەتی)ش ئەگـەر لەگـەڵ ئەو بۆچوونە بن، هەروەها حکومـەتی ئینتـیـقـالی عـێراقـیش، ئەوە (**ئەنجـومـەنی سەرۆکایەتی)، بەکۆی دەنگ** (راسپاردەکانیان= توصیات) بەرز دەکاتەوە بۆ (کۆمەڵەی نیشتمانی) کۆمەڵەی نیشتمانیش راسپاردەکان وەردەگرێت، **بـەڵام مەرج نییـە لەسـەری بڕوات، چونکە (راسپاردەیە = توصیـە)یە** . راسپاردەش

**مولزمم نییه** بۆ (کۆمەڵە). واتە **(یاریەکە) دەکەوێتە نێو گۆڕەپانی کۆمەڵە** .
کۆی ئەندامانی (کۆمەڵەی نیشتمانی) **٢٧٥** کەسن . هەروەکو لە سەرەوە ئاماژەمان پێ کرد لە باشترین حاڵەتدا ڕێژەی کورد ٢٥ ٪ یش بێت، ئەوە ژمارەی گرووپی کوردی لە سنووری **٦٩** ئەندام دەبن، لەبەر ئەوەی لە یاساکەدا ئەم بڕگەیە، چی ڕێژەیەکی دەنگدانی بۆ دیاری نەکردووە وەکو مەرجێک بۆ ئەم حاڵەتە، **ئەوە بڕیاری (کۆمەڵەی نیشتمانی) بە زۆرینەی (سادە = بسیطة) دەبێت** (نیوەی ئامادەبوانی دانیشتنێکی یاسایی کۆمەڵە + ١) بە تەحدید (حەدی ئەدنا)، کە دەکا (٦٩) دەنگ . لێردا دەبینین گرووپی کوردی لە(کۆمەڵە) چ کاریگەری وەهای نابێت لەسەر چارەنووسی بڕیارێکی وەها هەتاکو ئەگەر هاتوو هەر هەموویان موتەفقیش بن. چونکە (کۆی گشتی ئەندامانی کۆمەڵەی نیشتیمانی ٢٧٥- کۆی گشتی گرووپی کوردی ٦٩ = ٢٠٦) کە جیاوازی دەنگەکانە. ئەگەر هەموو ئەندامانی (کۆمەڵە)ش ئامادەبن، ئەوە بۆ بڕیارێکی وەها (**١٣٨**) دەنگی پێویستە..! کە ڕاسپاردەکانی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتیش دەگاتە کۆمەڵەی نیشتمانی (کۆمەڵەی نیشتمانی ) بڕیار دەدات و بڕیاری کۆمەڵەیش یاساییە...!
لە واقعی قۆناغی ئەمڕۆی کوردستان و ڕێبازی ڕووداوەکان و هەڵوێستی جادەی عەرەبی عێراق و ڕەوتی گفتوگۆ، چ لە نێوان لایەنی کوردی و دەسەڵاتی لایەنی ئەمریکی (بریمەر) و تاقمەکەی، یان لە نێوان کورد و لایەنی غەیرە کورد لە ئەنجومەنی دەسەڵاتی کاتی، دەرئەنجامەکانی (خودی ئەم دەستوورە کاتی)یە و، ئەو تەنگەژەیە کە ئێستا عێراق بەگشتی تێیدا دەتلێتەوە و، هەڵوێستی زۆر لە لایەنی عەرەبی و جادەی عێراقی (عەرەبی) سەبارەت بە کورد، لە تەک هەندێ فاکتەری دیکە، ئەوە دەگەیەنێت، **کە دوور نەبێت ئەندامانی کۆمەڵەی نیشتمانی ئاییندە، لایەنگیری گۆڕینی قەوارەی پارێزگاکان نەبن، یا هەر هیچ نەبێت ڕەنگە بەو شێوەیە نەبێت کە کورد دەیەوێت**. بۆیە دەکرێت هەر لە ئێستاوە مەزەنەی ئەوە بکەین کە پرۆسەی دەنگدان بە خواستی کورد نابێت. یان واقعی تر: لە واقعی عێراقی ڕابردوو و ڕووداوەکانی ئەم پرۆسەیەی ئەمڕۆ، هەر تەنها **گرەوێکە** و بەس، **ئەگەری گرەویش بۆ چارەنووسی کێشەی میللەتان دوورە لە حیکمەت**..!

له حاڵەتی وەهادا، واتە ئەگەر ( کۆمەڵە ) بڕیاری دا، بەپێی مادده (٣٧) دەبێت (سەرۆکی کۆمەڵەی نیشتمانی بڕیار و یاساکانی (کۆمەڵە) کە ئیقرار دەکرێت (ئەنجومەنی سەرۆکایەتی) پێ رابگەیەنێت. (ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی) دەتوانێت لە ماوەی ١٥ رۆژدا، بە کۆی دەنگ هەر یاسا و بڕیارێکی کۆمەڵە رەتکاتەوە و بینێرێتەوە بۆ (کۆمەڵەی نیشتمانی). **ئەم جارەیان بڕیاری کۆمەڵەی نیشتمانی قاتیعانە و بە زۆرینەی دوو لەسەر سێی کۆی گشتی دەنگی ئەندامانی دەبێت، واتە (١٨٣).**

لەم حاڵەتەی ئێمەدا کە جێگای باسە، واتە ئەگەر بڕیاری (کۆمەڵە) بە دڵی لایەنی کوردی نەبێت و هەردوو ئەندامانی دیکەی (ئەنجومەنی سەرۆکایەتی)ش پشتگیری لە رای ئەوەی کورد بکەن(ئەگەر یەکێکیان کورد بێت)، ئەوە ئەو یاسایە یان ئەو بڕیارە دەگەڕێتەوە بۆ (کۆمەڵەی نیشتمانی)، (کۆمەڵە)ش لە ماوەی ٣٠ رۆژدا بڕیاری کۆتایی خۆی دەدات. کە **ئەم جارەیان** بە دوو لەسەر سێی کۆی گشتی دەنگی ئەندامانی دەبێت، واتە (**١٨٣**)دەنگ. **روونتر ئەگەر هاتوو هەموو ئەندامانی کۆمەڵە (٢٧٥) ئامادەبن، ئەوە چارەنووسی ئەو ناوچانە بە (١٣٨) دەنگ حەسم دەکرێت، کە زۆرینەی سادە پێکدێنن، یان بە (١٨٣)دەنگ لە قۆناغی رەتکردنەوە کە دەکاتە دوو لەسەر سێی ئەندامەکانی وەکو باسمان کرد.** لە باشترین حاڵەتیشدا ژمارەی ئەندامانی گرووپی کوردی ناگاتە (٦٩) ئەندام. لەم حاڵەتەدا دەبینین : هەم(**ڤیتۆ)ی** ئەو کوردەی (ئەنجومەنی سەرۆکایەتی) **مەعنەوی و (شکلی)یە** و، **هەم رێژەی گرووپی کوردی لە (کۆمەڵەی نیشتمانی) لە پرۆسەی دەنگداندا، چی کاریگەرییەکی ئەوتۆی نییە لەسەر چارەنووسی کێشەیەکی چارەنووسسازی وەهادا.**

٢- **لە حاڵەتی پێک نەهاتنی ئەندامانی (ئەنجومەنی سەرۆکایەتی) لەسەر (راسپاردەکان)**: ئەوە دەدرێت بەناوبژیوانێک، جا چ خۆماڵی بێت یان نێودەوڵەتی، بڕوانە بڕگە(ب)ی مادده (٥٨)ی ئەم ( دەستووورە کاتی)یە، دیسان جارێکی تر، پرۆسەکە بە هەمان شێوە مووعالەجە دەکرێت واتە لە (کۆمەڵەی نیشتمانی)، هەروەکو لە خاڵی (١)ی سەرەوەدا باسمان کرد.

سەرەڕای ئەو هەموو ئەگەر و کۆسپانەی کە چاوەڕوانی ناوچە بە عەرەبکراوەکان دەکەن و پرۆسەی **گۆڕینی سنووری ئیداری پارێزگاکان**، ئەم (دەستوورە) لە مادەیەکی دیکەی خۆیدا تەگەرەیەکی تری خستوەتە سەر ڕێگای ئەم چارەسەرکردنە، ئەوەش بڕگە (ج) ی مادە (٥٨)ی (ئەم دەستوورە کاتیە)یە:

(٥٨-ج-

تەسویەی یەکجارەکی ئەو زەوییانەی کێشەیان لەسەر هەیە بە کەرکوکیشەوە، دوادەخرێت بۆ پاش جێبەجێ کردنی ئیجرائاتەکانی سەرەوە، تا ئەنجامدانی ئامارێکی عادیلانەو شەفافی دانیشتووان و، تا کاتی پەسەند کردنی دەستووری هەمیشەیی دەبێ ئەم تەسویەیە بە جۆرێک لەگەڵ پرەنسیپەکانی عەدالەت بگونجێ، تەواو بوو بێت و لەو پرۆسەیەشدا ئیرادەو ویستی دانیشتووانی ئەو زەوییانە لەبەر چاو بگیرێت.)

(مادة ٥٨-ج :

**تؤجل التسوية النهائية للاراضي المتنازع عليها و من ضمنها كركوك، الى حين استكمال الاجراءات اعلاه و اجراء احصاء سكاني عادل وشفاف والى حين المصادقة على الدستور الدائم. يجب ان تتم هذه التسوية بشكل يتفق مع مباديء العدالة، آخذا بنظر الاعتبار ارادة سكان تلك الاراضي.)**

واتە هەر خیلافێک لەسەر هەر کێشەیەک لە کێشەکانی تەعریب وگۆڕانی قەوارەی نەتەوایەتیمان روو بدات، لە نێوان کوردستانییەکان و تەعریب چییەکان، لە نێوان کوردستانیەکان و ئیدارەی ئەو ناوچانە، یان مەرکەزی ئیتیحادی لە بەغدا، یان لە نێوان خودی کوردستانییەکان ( کورد و تورکمان و کلدۆ ئاشورییەکان ..هتد)، ئەوە پرۆسەکە **رادەگیردرێت تاکو کۆتایی قۆناغی ئینتیقالی و ئەنجامی ئامارێک و پەسەند کردنی دستوورە هەمیشەییەکە**.. هتد.

لێرەدا پرۆسەی هەڵبژاردنی ئایندە، گرێ نەدراوە بە حەسم کردنی کێشەی بنبڕکردنی تەعریب و دیاری کردنی سنووری ئەو هەرێمە فیدراڵییەی کە لەسەر ئەساسی (جوگرافی و مێژوویی) لە دایک دەبێت!. واتە کوردی ناوچە بە عەرەب کراوەکانمان بەشداری ناکەن لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستانی ئایندە، هەروەها کورد لە

هەرێمی کوردستان و ناوچە بە عەرەب کراوەکانمان ئەچنە هەڵبژاردنی گشتی و(کۆمەڵەی نیشتمانی)و(ریفراندۆمی دەستووری هەمیشەی)و(هەڵبژاردنی کۆمەڵەی نیشتمانی لەسەر بنەماکانی دەستووری هەمیشەیی و دامەزراندنی حکومەتی هەمیشەیی)، بۆ ئەو ناوچانەی کە خیلافیان لەسەرە. هەروەها چارەسەرکردنی ئەو کێشانە کراوەیەو **چ «سقف» سەقفێکی زەمەنی محددی بۆ دیاری نەکراوە، پاش هەڵبژاردنی** کۆمەڵەی نیشتمانی و حکومەتی هەمیشەیی!.

دەکرێت پێشبینی ئەوەش بکرێت، کە دوور نییە، بەپێی ئەزموونی کۆنی کورد ئەم لایەنی کوردی یان ئەوی تر، لە رەف و، لە ئیجماعی کوردی دەرچێت، یان هەڵوێست و بۆچوونی جودای هەبێت، چ لە(کۆمەڵەی نیشتمانی ئایندە)، یان لە دەزگای کارگێری بە هەردوو باڵەکەیەوە، هەروەها لە ئەنجوومەنی پارێزگا و شارەوانییەکان. پێش ئێستاش شتی وا روویداوە ..! و لە پرۆسەیەکی دیموکراتیدا دەکرێت چاوەڕوانی ئەوەیش بکرێت.

هەروەها حیسابی ئەوەیش بکرێت، لایەنە سیاسییەکانی عێراقی غەیرە کورد بەتایبەتی عەرەبییەکان دەتوانن لە کوردستاندا رێکخستن و چالاکی حزبی خۆیان هەبێت. یان ئیمتیدادیان و ژمارەیەکی کەم یان زۆر خەڵکی کوردستان، بەتایبەتی لە کوردەکانمان لەگەڵ ئەو حزب و لایەنە عێراقییانە راستەوخۆ، یان وەکو (ئیمتدادیان) کار بکەن و بەپێی بەرژەوەندی و بەرنامەی ئەوان هەڵسوکەوت بکەن.

**سەرباری ئەوە هەموو:**

لایەکی گرنگی بنبڕ کردنی کێشەی تەعریب، کێشەی گۆڕینی نەخشەی (پارێزگاکان)ـە. کە کار دەگاتە ئێرە: لەم( دەستوورە کاتیە)دا دوو سێ دەقی دژ بە یەکتر دەبینین لەوانە:

بە پێی برگە (ب) ی مادده ( ٥٣ ) سنووری ئیداری ( پارێزگاکان) دەستکاری ناکرێت لە قۆناغی ئینتیقالی.

(المادة ٥٣- ب : تبقى حدود المحافظات الثمانية عشر بدون تبديل خلال المرحلة الانتقالية).

کەچی برگە (ب)ی ماددە(٥٨) دەسەڵات دەدات بە (کۆمەڵەی نیشتمانی) چارەسەری ئەو گۆڕین و دەستکارییە ناعادیلانانە بکات.

(المادة ٥٨- ب- : - لقد تلاعب النظام السابق ایضا بالحدود الاداریة وغیرها بغیة تحقیق اهداف سیاسیة علی الرئاسة والحکومة العراقیة الانتقالیة تقدیم التوصیات الی **الجمعیة الوطنیة وذلك لمعالجة تلك التغییرات غیر العادلة**. وفي حالة عدم تمکن الرئاسة الموافقة بالاجماع علی مجموعة من التوصیات، فعلی مجلس الرئاسة القیام بتعیین محکم محاید وبالاجماع لغرض دراسة الموضوع وتقدیم التوصیات. وفي حالة عدم قدرة مجلس الرئاسة علی الموافقة علی محکم، فعلی مجلس الرئاسة ان تطلب من الامین العام للامم المتحدة تعیین شخصیة دولیة مرموقة للقیام بالتحکیم المطلوب.)

بۆیە هەر لایەک دەتوانێت ، بەپێی بەرژەوەندی خۆی، پەنا بەرێت بۆ یەک لەو دەقانە ، هەر چی نەبێت بۆ دواخستن وتەگەرە خستنە سەر رێی چارەسەرکردنی کێشەی تەعریب و تەعریب چییەکان و راگوێزان و گۆڕینی قەوارەی نەتەوایەتی ناوچە پەیوەندارەکان. تۆ بڵێیت شاندی کورد پێی نەکرا بێت چارەسەری ئەم دەقە دژ بە یەکترانەی بکردایە لە کاتی دارشتنی ئەم یاسایە، یان بە سەریدا تێپەربووە..؟، یان ئەمەش هەر **بۆ لە کۆڵ کردنەوەو ساغ کردنەوەی پاشە رۆژی ئەو دەقەرانەیە!** هەرچی بێت هۆ و هۆکاری ئەم تێکەڵ وپێکەڵیە دەرئەنجامەکانی لە قازانجی کورد نییە.

## سێهەم:
## چارەنووسی کەرکوک

نزیکەی نیو سەدەیە، کەرکوک سەنتەری کێشەی کوردە. مەڵبەندی سەرەتای هێرشە رەگەزپەرستەکانی رژێمە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق بووە. هێمایەکی کەم نموونەی سیاسەتی شوڤێنی و گۆڕینی قەوارەی نەتەوایەتیە. مەیدانی پیادەکردنی هەموو جۆرە نەخشە و پیلانێکی رەگەزپەرستی نەیارانی کورد و کوردستانە. کەرکوک مەڵبەندی فیداکاری و قوربانی و بەرخودان و مەردایەتی و کوردایەتیە لە دێر زەمانەوە. لەسەر جەستەی پیرۆزی تیکۆشەرانی ئەم دەڤەرە و سەروەت و سامانیان، دوژمنانی کورد و کوردستان، بەرنامەی نەمانی کوردیان دەستپێکردووە. کەرکوک سەرە رمی بەرەنگاری شەڕی مان و نەمانی کورد و کوردستانە و، بەرەی رووبەڕووبوونەوەی دوژمنانە. چ ناوچەیەک بە قەد کەرکوک، لەم کوردستانە، بەپیت و بەرەکەتە، خاوەن مێژوو سەروەت و سامانە. کام دەڤەر بە قەد کەرکوک مەیدانی شەڕ و پێکدادن بووە. کێ بە قەد کوڕانی گەرمیانی کەرکوک بە دەستی رووت و سەنگی والآ پڵنگ ئاسا، رووبەڕووی نەیارانی کورد و کوردستان بوونەتەوەو نەخشە و پلانیان پێ تێک داوەو، گڕی کوردایەتی و مەردایەتیان هەر وەکو گڕی بابەگوڕگوڕ قۆناغ بە قۆناغ بەتین و بە جۆشتر بووە، بگرە هەر بە هەمان گوڕوتینەوە چی قوشبنێکی ئەم کوردستانە نەماوە داستان و نەبەردی تێدا تۆمار نەکەن. هەر بۆیە کەرکوک قەڵخانی بەرخودانی کوردانە، ئەگەرچی لای عەرەبی باڵا دەستی عێراق و لایەنی ئەمریکی و هاوپەیمانانی، کەرکوک شارێکی کوردستانی نییە، بەڵکو شارێکی عێراقییە، بەڵام لای پارتی دیموکراتی کوردستان دڵی کوردستانە و لای یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان (قودس)ی کوردستانە. و بەبڕیاری پەرلەمانی کورستان پایتەختی کوردستانە. نازانم کێشەی کوردستانی عێراق لە کەرکوک رووت بکرێتەوە دەبێت چی تێدا بمێنێتەوە؟!.

### کەرکوک:

* وەکو خاک رووبەرەکەی لەسنووری (۲۰۰۰۰) کیلۆ مەتری چوار گۆشەیە، واتە لە سنوری ۳۰٪ رووبەری کوردستانی عێراق پێک دێنێت، کە دەکاتە دوو جار بە قەد رووبەری (لبنان).

* نزیکەی زیاتر لە (٧٪)یەدەگی نەوەتی هەموو جیهان لە خاکی کەرکوک دایە.
* ئەگەر گوند و ناحیە و قەزا دابڕاوەکانی بگەڕێتەوە بۆ کەرکوکی دایک، دەبێتە گەورەترین شاری کوردستان کە ژمارەی دانیشتوانی خۆی لە (١,٤) یەک ملیۆن و چوار سەد هەزار کەس نزیک دەکاتەوە.
* ئەگەرچی شاری برایەتی و هێمای پێکەوە ژیانە، بەڵام هەر لە کۆنەوە شاری کوردانە، و بە پێچەوانەی هەوڵەکانی رەگەز پەرستان، هەرگیز زۆرینەی کوردی و کوردستانیەتی کەرکوک جێگای پرس و گومان نەبووە.
* لە رووی کوردایەتی و تێکۆشان و قوربانی و بەرخودان و فیداکاری لە پێناو کورد و کوردستان، و بە پێی مەوقعی ئیستراتیجی، کەرکوک پرد و پەرژینی کوردستانی عێراقە لەگەڵ عێراقی عەرەبی، لە رووی شێواندنی قەوارەی نەتەوایەتی و کارەسات و غەدری مێژوو ییەوە، کەرکوک هێمایەکی دەرئەنجامەکانی سیاسەتی رەگەزپەرستی و نموونەی ئەو سیاسەتەیەو، مەڵبەندی زۆربەی هەرە زۆری (١٨٢) هەزار کەسە ئەنفالکراوەکانمانە.
* بەپێی تێکەڵی نەتەوایەتی و ئایینی، نموونەی برایەتی و فرەیی و پێکەوە ژیانە.
* وەکو سەرچاوەی داهات و ئیمکانیاتی ئابووری، بەتایبەتی (نەوت وگاز)، وەکو کاڵەیەکی ئیستراتیجی، کەرکوک زەمینە و بنەمای کیانی کوردستان و بڕیاری سەربوخۆیی کوردە. هەر بۆیە هەموو لایەنە سیاسییەکانی کوردستانی عێراق کە زیاتر لە (٢٦) حزب و رێکخراوە، کۆک بوون لەسەر ئەوەی (کەرکوک) پایتەختی کوردستان بێت، و پاشان پەرلەمانی کوردستان لە پایزی ساڵی ٢٠٠٢ ئەو رایەی تەبەنی کرد و لە پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستاندا تەسبیت کرا بە تێکڕای دەنگ و، بووە بنەمایەک بوو بۆ هەموو جۆرە گفتوگۆیەک لەسەر مافی کورد لەگەڵ لایەنی بەرامبەر، کێ بێت ئەولایەنە یان ئەو لایەنانە ،(ئەگەر دروست بێت: پەرلەمانی کوردستان تەنها دەزگایە بڕیاری چارەنووسسازی کوردستانی لایە..).

هەر ئەمانەش وای کردووە کە کێشەی کەرکووک (سەنگی مەحەک)ی کوردایەتی و نیشتمانپەروەری بێت لای کورد، هەروەها (سەنگی مەحەک) بێت بۆ هەڵوێست و مسداقیەتی لایەنی غەیرە کورد، سەبارەت بە سەلماندنی مافە رەواکانی خەڵکی کوردستان و سنوورەکەی.

**بەلام:**

پاش ئەو هەموو کارەسات و نسکۆ و خوێن و فرمێسکەو، ئەو هەموو هەلوێست و بڕیارو سووربوونە لە سەر کوردستانیەتی کەرکوک، لە سەردەمی خەبات و تێکۆشانی بێ وچانی دژ بە رژێمە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق، کەچی لە هەلی رزگاری عێراق و نەمانی رژێمی رەگەز پەرست و تەعریبچی سەدام، **کەرکوکی شیرینمان، بە بەشداری و حزووری بەرچاوی لایەنی کوردی لە ئەنجومەنی دەسەلاتی کاتی عێراق، (دەستووری کاتی) لە عێراقی نوێمان کەرکوک لە هەرێمی کوردستان جیا دەکەنەوە.**

(دەستووری کاتی) عێراقی نوێمان لە چەند مادده و بڕگەیدا، باسی تەعریب و شێوەی چارەسەرکردن و هەنگاوەکانی دیاری کردووە، لە خالی سەرەوە هەندێ بە تەفصیل باسمان کرد، **هەرچەندە کەرکوکیش ماک و هێمای تەعریب و سیاسەتی گۆڕینی قەوارەی نەتەوایەتیمان بووە**، لێرەدا و بەم چەند دێرەی خوارەوە هەندێ زیاتر تیشک دەخەینە سەر کەرکوک و داهاتووی کەرکوک بەپێی مادده و بڕگەکانی ئەم یاسایە، چونکە سەرەڕای ئەو هەموو ئەگەر و کۆسپانەی کە چاوەڕوانی شاری کەرکوک دەکەن، حالی کەرکوک وەکو حالی ناوچە بە عەرەبکراوەکانی دیکەی کوردستان، ئەم (دەستوورە) لە مادەیەکی دیکەی و **تایبەتی خۆیدا کەرکوکی(استثناء) کردووە لەگەڕانەوە بۆ باوەشی هەرێمی کوردستان.**

واتە ئەگەر هەموو ئەو هەنگاوانە کە لە لاپەڕەکانی پێشوو باس کران لەمەڕ ئیجرائاتی نەهێشتنی تەعریب، بەدلی کورد بێت و خەلکی کەرکوکیش بڕیار بدەن بگەڕێنەوە بۆ باوەشی هەرێمی کوردستان... وەکو پارچەیەک لە خاک و نیشتمان، **ئەم(دەستوورە) ئەم مافەی لە کورد و خەلکی کەرکوک و خاکی کەرکوک زەوت کردووە، بڕوانە دەقی بڕگە(ج)ی مادده ٥٣ کەچۆن بە دیقەت و بێ پێچ و پەنا بەو رووکارەدا سیاغە کراوە:**

مادده ٥٣-ج. (هەر کۆمەلە پارێزگایەک کە لە **سێ پارێزگا زیاتر نەبن** لە دەرەوەی هەرێمی کوردستان **بەغداو کەرکوکی لێ دەرچێ، بۆیان هەیە لەبەینی خۆیاندا هەرێم پێکبهێنن**، حکومەتی عێراقیش بۆی هەیە پێشنیازی میکانیزمی پێکهێنانی ئەو هەرێمانە بکات، بەو

مەرجەی بخرێتە بەردەم کۆمەڵەی نیشتمانی بۆ هەر یاسایەکی تایبەت بە پێکهێنانی هەرێمێکی نوێ، پێویستە لە راپرسییەکدا رەزامەندی دانیشتوانی پارێزگا پەیوەندارەکانیش وەربگیرێ.)

ج- يحق لمجموعة من المحافظات خارج اقليم كردستان **لا تتجاوز الثلاث، فيما عدا بغداد و كركوك**، تشكيل اقليم فيما بينها، وللحكومة العراقية المؤقتة ان تقترح اليات لتشكيل هذه الاقاليم، على ان تطرح على الجمعية الوطنية المنتخبة للنظر فيها واقرارها. يجب الحصول بالاضافة الى موافقة الجمعية الوطنية على أي تشريع خاص بتشكيل اقليم جديد على موافقة اهالي المحافظات المعنية بواسطة استفتاء.)

لێرە بەش بەحاڵی خۆم چی ئیزافەیەکم نییە بیخەمە سەر ئەو دەقە زۆر روونەی سەرەوە، چونکە دەقەکە خۆی باسی خۆی دەکات.

جێگای سەرنج و سەرسوورمانە، پاش دارشتنی ئەم یاسایە و بەوبەند و برگانەیەوە، کە پەیوەندیان بە تەعریب و چارەنووسی ناوچە بە عەرەب کراوەکانی کوردستان و، **لە پێش هەموویان ئەو دابرانەی کەرکوک لە هەرێمی کوردستان هەیە بە دەقێکی یاسایی روون و بە رەزامەندی شاندی کورد لە بەغدا، بەپێچەوانەی هەڵوێست و داکۆکی گەلی کورد، سەبارەت بە چارەنووسی کەرکوک، هەندێ سیاسەتمەداری کورد لێرەو لەوێ، هەوڵی ئەوە دەدەن، ئەو سازشکاریە (Compromise) کە لە بەغدا کرا بەرامبەر بە شاری کەرکوک بە تایبەتی و ناوچەکانی دیکەی وەکو کەرکوک بەگشتی، فەراموش بکەن.**

بۆ نیو سەدە دەچێت ماکی بزاڤی رزگاریخوازی کورد و هێزی رۆحیی بزوێنەری بەرامبەر بە داگیرکەران، کێشەی کەرکوک و تەعریبی کەرکوک و شارەکانی دیکەی بە عەرەب کراوی کوردستانە.

بۆ نیو سەدە دەچێت کوردی کوردستانی عێراق و لە پێش هەموویانەوە خەڵکی کەرکوک سەروماڵی خۆیان فیدا کردووە بۆ کوردستان و راپەرین و شۆرشەکانی.

ئەو نازو نیعمەتەی ئەمرۆی ناوچە ئازادکراوەکانمان، لایەنێکی هەرە گەورەی ئەو دەسکەوتە، ئێش و ئازار و فرمێسک و خوێنی رۆڵەکانی کەرکوک و ناوچە بە عەربکراوەکانی دیکە و ئەنفال و هەڵەبجەیە... هتد!

مێژووی کۆن و نوێمان و ئەزموونی میللەتەکەمان و میللەتانی دیکەش لەم بارەیەوە پڕ لە پەند و عیبرەتە...
خاڵی هەرەگرنگی گرفتی جوڵانەوەی رزگاریخوازی کورد لە هەموو قۆناغە جیاجیاکاندا، لەگەڵ رژێمە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق، کێشەی کەرکوک و کوردستانییەتی کەرکوک و سەروەت و سامانی کەرکوک و ناوچە بە عەرەب کراوەکانە، کە رووبەرەکەی کەمتر نییە لە ٥٠٪ی رووبەری کوردستانی عێراق، جگە لە سەروەت و سامانی سروشتی وەکو نەوت و گاز...هتد.
هەروەها مەوقیعی جوگرافی ئەو ناوچانەی کە هەمیشە پەرژین و قەڵخانی باقی کوردستانی عێراق بوون.
واتە ئەم (**ئیستسنائەی کەرکوک**) کە نەگەڕێتەوە بۆ باوەشی هەرێمی کوردستان، دیارە خاڵی مەبەست بووە لای لایەنی ئەمریکی و لایەنەکانی غەیرە کوردی نێو ئەنجومەنی کاتی دەسەڵات.
ئەوەی سەرنج رادەکێشێت ئەوەیە. لێپرسراوانی کورد کە بەشداربوون لە داڕشتنی ئەم ئیستسنائە، وەکو پێویست تیشک ناخەنە سەر ئەم ماددەیەو، بگرە تاکو رادەیەک لە راگەیاندنی کوردستان هەوڵی پەراوێز کردنی دەدرێت. بە پێچەوانەوە بەش بەحاڵی خۆم وای بۆ دەچم کە: **هۆشیار کردنەوەی خەڵکی کوردستان بەگشتی و شاری کەرکوک بە تایبەتی لە مەترسیەکانی ئەم(ئیستسنائە) پێویستەو دەرخستنی کەرکوک لە کوردستان بەچی پاساوێک بێت و دەرئەنجامی هەڵوێست و بۆچوونێکی زیان بەخشە، و پێویستە ئەم غەدرە و ئەم هەڵەیە راستبکرێتەوە.**
لەو باوەڕەشدا نیم ئەم راستکردنەوە لە چوارچێوەی ژوورە داخراوەکان و گلە و گازەندەی ژێرلێوان و سەرمێزان چارەسەربکرێت.
ئەگەر سەرەتا فشارو ترسی تورکیا رەچاوکرا، بەڵام ئەوەی بە لایەنی ئەمریکی کراو دەکرێت لە کەرکوک، بۆ زیاتر لەساڵێکە دژی کوردستانییەتی کەرکوک بە خودی تورکیا خۆی نەدەکرا و ناکرێت. گریمان تورکیاش حەماقەتێکی وەهای بکردایە، گومان نییە ئەنجامی لە بەرژەوەندی ئەودا نەدەبوو، چونکە **نە ئەمریکا وەکو هێزێکی داگیرکەر( بە پێی یاسا و رێککەوتننامەکانی نێو دەوڵەتی و بڕیاری دوایی ئەنجومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتی) قەبوولی دەکرد لە سوپای تورک، ونە کوردیش ئەوەندە بێ دەسەڵات و بێ دەنگ دەبوو لەسەر کردەوەکانی و، نەڕای گشتی عێراقی و جیهانیش فەرامۆشیان دەکرد...!**

* کێشەکە دیارە هەر لە سەرەتاوە بۆ ئەمریکا تەرک کرابوو. واتە ئەمریکا هەم(خصم)ە و هەم(حکم).!

* ئەگەر حیساب کرابوو، بۆ راگرتنی فیتنە و دووبەرەکی، وا رۆژ لە دوای رۆژ نەیارەکانی کوردستانیەتی کەرکوک و تەبایی و برایەتی لەو دەڤەرە لە پەرەسەندندایە...!

* تاکو ئێستا زۆربەی زۆری یاساکانی تەعریبی سەدام لە کەرکوک پیادە دەکرێت لە سەرکورد.

* تاکو زبانی کوردییش بەرەبەرەکانێ دەکرێت لە کەرکوک...!

* ئەوە ناچار گروپی کوردی لە **ئەنجومەنی شاری کەرکوک بڕیاری کشانەوەیان داوە**.

ئەمانەو شتی تریش رۆژانە پیادە دەکرێن لە بەرچاو و بە ئاگاداری ئەمریکا و هاوپەیمانانی و، ئیدارەی کەرکوک لە ژێر کۆنترۆڵی هێزەکانی ئەمریکایە، و بەرنامە و سیاسەتی ئەو هێزانە دیارە لەوەدایە کە بەم شێوەیە رەفتار بکرێت لەگەڵ کێشەی کەرکوک. بە ئیعتیزاری سەر زارەکی و قسەی بێ ناوەڕۆک و کات بە سەربردن، کێشەکان چارەسەر ناکرێت، و لە بەرژەوەندی کورددا نییە.

**تۆ بڵێیت کاتی ئەوە نەهاتبێت کێشەی تەعریب بەگشتی و کەرکوک بە تایبەتی بکرێت بە کێشەیەکی جەماوەری، پاش ئەوەی دەرکەوت لەم مەیانەدا سیاسەتی (کوردە نامووسە)، لە خراپەوە بەرەو خراپتر دەڕوات.** بە جەماوەری کردنی کێشەکە بەو مانایە نییە شەڕی هێزەکانی هاوپەیمان بکرێت لە رێگای چەک و تەقەمەنییەو، بەڵکو بەشێوە و شێوازی ئاشتی خوازانەی بەرخودان و بەرهەڵستکاری، ئەمەش کارو ئامادەباشی چاکی دەوێت، و بە پلەی یەکەم ئەرکی سەرەکی سەرکردایەتی سیاسی پارتی و یەکێتیە، پاشان هەموو لایەنە سیاسیەکانی کوردستان و گشت رێکخراو و بنکە جەماوەریەکان و زانا و پسپۆران و رۆشنبیرانی کوردستان.

## چوارهەم
## زبانی کوردی و عەرەبی

فـەرمـیـەتی زبانی کـوردی لە تەک زبانی عـەرەبی و سنووری بەکـار هێنانی زاراوەی(رەسمیەتی) زبانی کوردی، ماددە ٩ ی یاساکە بەراشکاوی باسی کردووە:

(٩- زبانی عـەرەبی و زبانی کـوردی دووزبانە رەسـمـیـیـەکەی عـێـراقن، مـافی عێراقـیـیـەکـانیش لە دامـەزراوە فـێرکـارییـە حکومـیـیەکـاندا لەسـەر بناغـەی رێوشوێنی پەروەردەیی دابین کراوە، کە بە زبانی زگماکی خۆیان وەک تورکمان یان سریانی یان ئەرمەنی بخوێنن، لە دامەزراوە فـێرکـارییە تاییەتەکانیشدا ئازادن کە بە هەر زبانێ بخوێنن.
سنووری دەستەواژەی(زبانی رەسمی) و چۆنیەتی جێبەجێ کردنی برگەکانی ئەم مادەیە بە یاسا دیاری دەکرێ کە **ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە**...هتد)

(٩- اللغة العربية و اللغة الكردية هما اللغتان الرسميتان للعراق. ويضمن حق العراقيين بتعليم ابنائهم بلغة الام كالتركمانية او السريانية او الارمنية في المؤسسات التعليمية الخاصة. وفق الضوابط التربوية أو بأية لغة اخرى في المؤسسات التعليمية الخاصة. يحدد نطاق المصطلح(لغةرسمية) وكيفية تطبيق احكام هذه المادة بقانون **والذي يشمل**... الخ).

فـەرمـیـەتی زبانی کـوردی لە تەک زبانی عـەربی بەپێی دەق و برگـەکـانی مـاددە ٩ (رەها) نییە. بەڵکو بە چەند دەق وزاراوەیەک تەحدید کراوە وەکو:

١- سنووری دەستەواژەی(زبانی رەسمی) و چۆنیەتی جێبەجێ کردنی برگەکانی ئەم ماددەیە بە یاسا دیاری دەکرێت هتد) واتە(فەرمی) زبانی کوردی گرێدراوە بە یاسـایەک کـە لە ئایندە دەبێت دەرچێت. هەر وەکـو لە بوارەکـانی دیکەی ئەم باسە ئاماژەمان بۆ کردووە، لە کۆمەڵەی نیشتمانی، کورد کەمینەیە(لە سنووری ٢٥٪) لە باشـتـر حـاڵەتدا واتە چارەنووسی(رەسـمی)زبانی کـوردی لەتەک

زبانی عـەرەبی لە رووی(کـەی= مـتی) و لـەرووی(چۆن= کـیف)وە زۆرینەی عـەرەبی باڵادەست و نوێنەرانی غـەیرە کـورد لەو (کـۆمـەڵە)یە بڕیاری لەسـەر دەدەن...!

٢- لە رووی هونەری و دارشـستنەوەی ئەم مـاددەیە(بە زبانی عـەرەبی) کەدەقی(معـتـمد)ـە، هەندێ دەستـەواژە تـەسبیت کراوە بەرادەیەکی وەها کە بەکارهێنانی زبانی کوردی لە تەک زبانی عەرەبی سنووردار کردووە (حصر)، وەکـو:(يحدد نطاق المصطلح-لغة رسمية) وكيفية تطبيق احكام هذه المادة بقانون والذي يشمل...الخ)

٣- بەکـارهێنانی(نکرە) و(مـعـرفـە) و(حـەرفی جـر) پێش چەند وشـەو دەستەواژەیەک، کێشەیەکی زبانەوانیە و دەکرێت تەفسیر بکرێت بە شێوەیەکی وەها کە لە خزمەتی (یەکسانی)هەردوو زبانەکە نەبێت لە عـێراق. برایانی پسپۆڕ لە زبانی عەرەبی دەتوانن لەم بارەیەوە زیاتر ئەم لایەنە روونکەنەوە...، و هەروەها خودی زاراوەی (یەکسانی= المساواة) کە لە برگە «٥»دا هاتووە بۆ نموونە. (نسبی)یەو لە کەسێک بۆ کەسێک و لە تاقمێک بۆ تاقمێکی دیکە جیاوازی هەیە. دوور نییە لەکاتی دارشتنی ئەو یاسایە کە بڕیارە لە ئایندە کۆمەڵەی نیشتمانی پەسندی بکات، ئەمانە هەر هەمووی ببێتە گرفت و خۆ دزینەوە و بگرە پاشگەزبوون، یان پوچ کـردن و بەتاڵکردنی ئەم مـافـە لە ناوەڕۆکـەکەی. ئەزمـوونمان لەگـەڵ رژێمـە یەک لە دوای یەکـەکـانی عـێراق و هێزەکانی عەربی برای باڵا دەستمان پڕ لە پەندو عیبرەتە... ئەمەی کە باسمان کرد دوورنییـە هەندێ لەو کۆسپ و لەمـپەرانە بن کـە لەم ماددەیەدا هاتووە وجێگای گومانە...!

کەم تەرخەمی کاربەدەستانی ئیدارەی مەدنی ئەمریکا لە بەغدا بۆ پیادەکردنی ئەم مـاددەیە تاکـو ئێستـا گـرفتـێکە، و هەڵوێستی ئیدارەی ئەمریکی دژ بە(فـەرمی کـردنی زبانی کـوردی کـە لە نامـەکـەی ١/٦/٢٠٠٤)ی بەڕێزان بارزانی و تاڵەبانی بۆ سـەرۆک کۆماری ئەمریکا ئاماژەی بۆ کـراوە، لایەکی دیکەی گرنگی ئەم کۆسپەیە...!

نابێت ئەوەیش لە بیرکەین کە دەق و ناوەڕۆکی مادده و بڕگەکانی ئەم (دەستوورە کاتییە)، بنەمای داڕشتنەوەی دەستووری هەمیشەیی ئایندەی عێراقە، ئەگەر لەکاتی داڕشتنی دەستووری کاتی بژارکردن و ڕاست کردنەوە و نەهێشتنی گومان و لەمپەر، هەندێ ئاسان بوو، ئەوە بۆ قۆناغی دانووستاندنی دەستووری هەمیشەیی، بە پێی ئەم دەقانە کە باسمان کرد، کارەکان زەحمەت و دژوارتر دەبن، چونکە هەر ڕاوەستان و پێ داگرتنێک لە لایەن کوردەوە دوور نییە ناحەزانی لە نێو لایەنە عەرەبییەکان و غەیرە عەرەبییەکانیش بە پاشگەز بوون لە قەڵەم بدرێت، یان گرفت و کۆسپی دیکە بێنێتە پێشەوە، جگە لە فشار و ڕۆڵی داگیرکەری ئەمریکی...هتد*.

* تاکو ئێستاش بە فەرمی دام و دەزگای ناوەندی لە بەغدا لە ئاڵوگۆڕی نووسراو ئاگاداری هەتاکو لەگەڵ هەرێمی کوردستان زبانی (عەرەبی) بە کار دێنن و، وەڵامی دام و دەزگاکانی هەرێمی کوردستان بۆ (ناوەندی بەغدا) دیسان بە زبانی (عەرەبی)یە، هەروەها وەزیرە کوردەکان و ئەو کوردانەش کە لە پۆستە سیادییەکان تەعیین کراون نووسراو و ئاگاداری و ڕێنماییەکانیان هەر بە زبانی (عەرەبی)یە!!

## پێنجەم
## دەسەڵاتی ناوەندی ئیتیحادی و هەرێمی کوردستان

کورد لە دەسەلاتی یاسادانان وەکو لەم (دەستووره کاتییه) تەسبیت کراوه، لە هیچ پرۆسەیەکی دەنگدان بە پێی زۆرینەو کەمینە، کاریگەری حاسیمانەی نییە ئەگەر هات و زۆرینەی غەیرە کورد لە(کۆمەڵەی نیشتمانی) ئاینده رای بە پێچەوانەی راوهەلوێستی گروپی کوردی بێت. هەر وەکو لە خاڵەکانی دیکەدا باسمان کرد، هەروەها لە (ئەنجومەنی سەرۆکایەتی)ش ئەگەر هات و یەک لەسێ کەسەکەش کوردێک بێت، بێ گومان لە ئەنجومەنی وەزیرانیش کورد هەر کەمینە دەبێت. بۆیە لەم ۳ دەزگایەدا وجودی کورد زیاتر بەشداری و موساهەمە کردنە لە دروست کردنی ئەو بڕیارانە کە زۆرینەی غەیرە کورد مەبەستیەتی، یان بە دڵی ئەوان بێت.

هەروەها لە پێک هێنانی(دادگای باڵای فیدراڵی) کە رۆڵێکی کاریگەری هەیە لە پاراستنی مافەکانی دەستووری کورد و چاودێری کردنی یاساو بڕیارەکانی حکومەتی فیدراڵی ناوەند، هیچ جۆرە ئاماژەیەک نییە بە ژمارە و رێژەی کورد، چی لە ئەنجومەنی سەرۆکایەتی و چی ئەندامانی. بڕوانە مادده ٤٤ی ئەم دادگایە لە ئاینده بە یاسایەک دادەمەزرێت کە (کۆمەڵەی نیشتمانی) دەریدەکات...!

**نەدەبوو شاندی کورد، لە کێشەیەکی چارەنووسسازی وەهادا سازش (Compromise) بکات و، کورد بەو شێوەیە لە مافی خۆی وەکو گەلێک رووت بکاتەوە. هەر بۆیە ئەهمیەتی نوێنەرایەتی کورد لەو ٤ دەزگایە بە دیقەت و راشکاوی و دوو(ئەنجومەنی یاسا دانانی ئیتیحادی) لەرووی مصداقیەتی(نیزامی فیدراڵیەت) ویان مسۆگەر کردنی هەر زەمانەتێکی دیکە، تا لێرەدا بە روونی دەردەکەوێت، ئەمەیش گرفتێکی گەورەو خەتەرناکە، ئەگەر هاتو لە دەستووری هەمیشەیی فەرامۆش بکرێت...!**

(یاسای بەرێوەبردنی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی) لە چەند ماددەو بڕگەیدا جەختی لەسەر دابەش کردنی دەسەڵات کردووە لە نێوان دەسەڵاتی ناوەندو

هەرێم و پارێزگاو شارەوانییەکان.. هتد. لەوانەو بە تەحدید مادده (٤)*ی ئەم یاسایەو، بە فراوان و وردتر لە بەشی (٨)تەمی یاساکەو لە برگە (أ)ی مادده (٥٣)**یدا، ئیعتراف کراوە بە حکومەتی هەرێمی کوردستان کە حکومەتی رەسمی ئەو خاکانەیە کە تا (١٩ی ئاداری ٢٠٠٣) بەرێوەدەبرا، بە پێی برگە (أ)ی مادده (٥٤)*** ئەم حکومەتە بە درێژایی قۆناغی ئینتیقالی کاروباری خۆی بەرێوە دەبات، تەنها ئەو دەسەلاتە نەبێت کە بەپێی ئەم یاسایە دەکەوێتە چوارچێوەی (اختصاص)ی دیاری کراوی حکومەتی ناوەندی (فیدرالەوە)، واتە برگەکانی مادده (٢٥) و (٤٣)ی ئەم یاسایە.

سەرەرای ئەمانە، ئەو دەسەلاتەیش کە ماوە یان پێویستە پیادە بکرێت بە هۆی چۆنیەتی دامەزراندنی ئەنجومەنی پارێزگاکان و دەسەلات و جۆری پەیوەندییان بە دەسەلاتی ناوەندەوە، دەسەلاتی حکومەت و پەرلەمانی کوردستان گەمارۆ و وەلاوە نراون.

مادده (٥٥، ٥٦، ٥٧) بە وردی و فراوانی زۆر لایەنی ئەم کێشەیەی روون کردوەتەوە، بە پێی ناوەرۆکی برگەکانی ئەم ماددانەو مادده (٤)ی ئاماژە پێکراو، ئەنجومەنی پارێزگاکان لە زۆر رووەوە گرێدراون بە حکومەتی ناوەندەوە، لەوانە:

* دارایی: بودجەی ئەنجومەنەکان لە ناوەندەوە تەحدید و بریاری لەسەر ئەدرێت و هەر لەوێشەوە ئەنێردرێت.

---

* مادەی چوارەم: سیستمی حوکم لەعێراق کۆماری، ئیتیحادی (فیدرالی)، دیموکراتی فرەییە، دەسەلاتەکان لە نێوان حکومەتی فیدرالی و حکومەتە هەرێمیەکان و پارێزگاکان و شارەوانی و ئیدارە خۆجێییەکاندا دابەش دەکرێت، ئەم سیستمە فیدرالییەش لەسەر بناغەی فاکتە جوگرافی و مێژوویەکان و جیاکردنەوەی دەسەلاتەکان دادەمەزرێ نەک بە پێی رەچەلەک، نەژاد، یان ئیتنی یان نەتەوە یان مەزهەب.

** مادەی پەنجاو سێ: أ. ئیعتراف بە حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکرێ کە حکومەتی رەسمی ئەو خاکانەیە کە تا (١٩ی ئاداری ٢٠٠٣) پارێزگاکانی دهۆک و هەولێرو سلێمانی و کەرکوک و دیالەو نەینەوا لەلایەن ئەو حکومەتەوە بەرێوە دەبرا. دەستەواژەی حکومەتی هەرێمی کوردستان کە لەم یاسایەدا هاتووە واتە ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان و ئەنجومەنی وەزیرانی کوردستان و دەسەلاتی قەزایی هەرێمی لە هەرێمی کوردستان.

*** مادەی پەنجاو چوار: أ. حکومەتی هەرێمی کوردستان بە درێژایی قۆناغی ئینتیقالی کاروبارەکانی خۆی بەرێوە دەبات، تەنها ئەو مەسەلانە نەبێت کە بە پێی ئەم یاسایە دەکەونە چوارچێوەی ئیختیساسی دیاریکراوی حکومەتی فیدرالییەوە، خەرجی ئەم وەزیفانەش لەلایەن حکومەتی فیدرالییەوە دابین دەکرێ بە گوێرەی ئەو رێوشوێنەی تا ئێستا کاری پێ کراوەو بە پێی مادە (٢٥-هـ)ی ئەم یاسایە.

* پلان و نەخشەکانیان راستەوخۆ گرێدراوە بە پلان و دەسەلاتی ناوەندی سالانەو، لە رێگای وەزارەتە پەیوەندارەکانی ناوەندو، بە تەنسیق لەگەل ئەوان جێبەجێ و موتابعە دەکرێت.
* بەدەر لەمانەو، ئەوەی بمێنێتەوە لە دەسەلات ئەوە بۆ ئەم ئەنجومەنانەیە بە مەرجێک نابێت دژ بێت لەگەل ناوەڕۆکی ئەو ماددانەی کە ئاماژەمان بۆ کردووە.

بە کورتی ئەنجومەنی پارێزگاکان راستەوخۆ دەکەوێتە ژێر دەسەلاتی ئەنجومەن و حکومەتی ئینتیقالی عێراق بە هەردوو قۆناغیدا. ئەم واقیعە بە رەهایی هاتووەو، دوور نییە ئەم جۆرە دارشتنە و ئەم (رەها)ییە ببێتە مایەی راکێش و بکێش و تەفسیراتی جیاجیا لە نێوان هەردوو ئیدارەکەی کوردستان بە تایبەتی پاش هەلبژاردن، بە هۆی کۆمەلێک فاکتەری جیاجیا، لەوانە شێوەو رێژەی لایەنە سیاسییەکان و ململانێی ناوخۆیی لەسەر دەسەلات لە هەموو ئاستەکانداو، رۆلی دەسەلاتی ناوەندو چۆنیەتی تەعاملی لەگەل ئەنجومەنی پارێزگاکان، هەروەها دوور نییە هەر ئەم جۆرە دیدو بۆچوون و نەبوونی دەقی روون و ورد سەبارەت بە دەسەلاتی ئەم ئەنجومەنانە و دەسەلاتی ناوەند ببێتە گرفتێکی دیکە لە نێوان هەردوولا..

زۆر کەس برگە(ج) ی مادده ٦١ یان بە(ضمان) داناوە. دەقی ماددەکە دەلێت:
(المادة٦١ - الفقرة ج" يكون الاستفتاء العام ناجحا، **ومسودة الدستور** مصادقا عليها، **عند موافقة أكثرية الناخبين في العراق**، واذا لا يرفضها **ثلثي الناخبين** في **ثلاث محافظات او أكثر**.)
(مادده ٦١-ج: (راپرسییەکە بە سەرکەوتوو لە قەلەم دەدرێ و **رەشنوسی دستوورەکە** بە پەسەندکراو دادەنرێت ئەگەر زۆربەی دەنگدەرانی عێراق رازی بوون لە سەری و ئەگەر **دوولە سەرسێی دەنگدەرانی سێ پارێزگا یازیاتر رەفزیان نەکرد**).

ئەمەی کە بە گەرەنتی و(**ضمان**) لە قەلەم دەدرێت:
١- ئەگەر پێویست بوو **یەک** جار بەکاردێت. **ئەویش بۆ پەسندکردنی رەشنووسەکەی دستووری هەمیشەیی کە راپرسینی لە سەر دەکرێت لەسەرتاسەری عێراق.**

٢- ئەم گەرەنتیە(**ضمان**) پەیوەندی نییە بە **یاسا و بڕیارەکانی ناوەندی ئیتحیادیەوە** هەروەکو بە هەڵە باسی لێوە دەکرێت، بەڵکو بە پەسند کردنی ڕەشنووسەکەی دەستووری هەمیشەیی تەواو دەبێت و **بۆ یەک جاریشە**.

٣-ئەم گەرەنتیە(ضمان)ـە، **کە تەنها بۆ ڕەشنووسەکەی دەستووری هەمیشەییە**، تیغی دوو دەمە. هەرچۆن ٣ پارێزگاکەی هەرێمی کوردستان دەتوانێت بە کاری بێنێت، ١٥ پارێزگای عێراقی دیکەش هەمان مافیان هەیە. هەر ٣ پارێزگا لەو ١٥ پارێزگایە بۆی هەیە هەمان هەڵوێست وەربگرێت. **واتە کورد یەک ئیحتیمال و زۆرینەی عەرەبی عێراق ٥ ئیحتیمال**.

٤-پاشان: کێ دەڵێت لایەنی کوردی پەیوەندار، دەتوانێت لەو ٣ پارێزگایە، دوو لە سەرسێی دەنگەکان مسۆگەر بکات لە کاتی پێویستدا...!

٥- مەرجی وەها هەر وەکو زۆر لە یاساناسەکان باسی دەکەن، دوورە لە پرەنسیپی دیموکراسی و نەدەبوو کورد بکەوێتە ژێر باری وەهاوە، چونکە دەکرا(گەرەنتی=ضمان)ی کورد، یان ڤیتۆی کورد بە شێوەیەکی دیکە تەسبیت بکرایە کە تایبەت بێت بە خودی کوردەوە. هەر بۆیە ئەم بڕگەیە لەگەڵ لاوازی بنەماکەی و ئەگەری(**یەک**) بە(**پێنج**)، زۆر لە سەرکورد کەوت و، گوایە لە سەرەتا مەبەست لە دانانی ئەم بڕگەیە کورد نەبوو، بەڵکو بۆ زۆرینەی عەرەبی شیعە بووە، بەڵام کورد خۆی کرد بە خاوەنی ئەم بڕگەیە و نیگەرانی و هەڵوێستێکی نیگەتیڤانەش دروست بوو بەرامبەر کێشەکەی لە عێراق لەلایەن توێژێکی فراوان و زۆری عەرەبەوەو، کرا بە مەهانە بۆ هێرش کردنە سەر کورد و دۆزەکەی...! دوور نییە لە داڕشتنی دەستوری هەمیشەیی ئەم بەندە ببێت بە خاڵێکی خیلاف.

دەسەڵاتی ناوەندی ئیتحادی یەکجار زۆرە، و لە (مادده ٢٥)ی ئەم (دەستوورە)دا تەسبیت کراوە. لە ڕووی عەمەلیەوە هیچی وەها بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان نەهێلاوەتەوە.

تەنها دەسەڵاتی دانانی (ڕەسم و باج) و (کۆنترۆڵ کردنی ئاسایش و پۆلیسی ناوخۆ) نەبێت، هەرچەندە لەواقیعدا ئەو دوو (دەسەڵاتەش) سنووردار کراوە بەپێی بڕگە (ب)و بڕگە (ج)ی مادده (٢٥) بەتایبەتی.

(المـادة ٢٥-ب: **وضع وتنفيذ سياسة الامن الوطني**. بما في ذلك انشاء قوات مسلحة و ادامتها لتأمين و حماية وضمان أمن حدود البلاد و الدفاع عن العراق).

(مـادده ٢٥-ب: **دانان و جێبەجێکردنی سیاسەتی ئاسایشی نیشتمانی**، هەروەها دامەزراندنی هێزی چەکدارو... هتد).

(المادة ٢٥-ج:**رسم السياسة المالية**، و اصدار العملة، **وتنظيم الكمارك**، وتنظيم السياسة التجارية عبر حدود الاقاليم و المحافظات في العراق، و **وضع الميزانية العامة للدولة** ورسم السياسة النقدية و انشاء بنك و اداراته).

(مادده ٢٥-ج: **دارشتنی سیاسەتی دارایی**، دەرکردنی دراو، هەروەها **رێکخستنی گومرگەکان**... هتد).

واتە **هەردوو دەسەڵاتەکە رەها نییە**، دەسەڵاتی **پەرلەمانی کوردستانیش** چ لە مەیانی یاسادانان و چ لە بواری رەتکردنەوەی یاساو بریارەکانی ناوەندی ئیتیحادی، سنووردار کراوە، تاکو رادەیەک **دەکرێت بگوترێت (قفل)کراوە**، چونکە برگەکانی مادده (٢٥) هیچی وەهای بۆ پەرلەمانی کوردستانیش نەهێشتۆتەوە، ئەگەر پاساو **نەدرێتەوە کە هەر هەموو ئەو دانپێنان و (مافانەش) کاتییە**، واتە بۆ قۆناغی (ئینتیقالییە)!، و هەڵهاتنە لەواقیع، ئەمە دیکۆمێنتێکە، کورد خۆی بەشداربووە لەدارشتن و پەسەندو ئیمزاو پیادەکردنی. لەگەڵ ئەوەش:

* ئەگەر ئەو دەقانە کە پەیوەندییان بەکوردەوە هەیە، بەتایبەتی یان ئەوانەی دیکە کە ناراستەوخۆ عیلاقەمەندن بەکێشەی کورد لەکوردستانی عێراق، هەروا لەدەستوری هەمیشەیی عێراق بمێننەوە، ئەوە دەقێکی یان مافێکی رواڵەتیی بێ گیان دەبێت، و کەم کردنەوەیە لەدەسەڵاتی هەرێمی فیدراڵ: چ ئەوەی کورد خۆی داوای کردووەو چ وەکو بنەمای سیستەمی فیدراڵییەت.
* هەرچەندە (کاتیی)ش بێت، ئەم یاسایە لەکۆتایی حوزەیرانی داهاتوو پیادە دەکرێت، کە پیادەش کرا، حقوق و ئیتلیزاماتی لێ دەکەوێتەوە، و دەبێتە سابیقەیەکی یاسایی.
* **چی بێت و چەند بخایەنێت ئێمە بەچاوی رەخنەوە تەماشای ئەم یاسایە دەکەین با بۆ یەک رۆژیش بێت، و لە پاشەرۆژ دەبێتە(دیکۆمێنتێک)، کە گشت لایەنە پەیوەندارەکانی عێراق کە بەشدارن لە ئەنجومەنی دەسەڵاتی کاتی بە کوردەوە موتەفیق بوونە لەسەری، و ئەمریکا وەک هێزی داگیرکەر پەسەندی کردووە.**

## شەشەم
## سەروەت و سامانی کوردستان

ئەم (دەستوورە کاتییە) هەر وەکو لە خاڵی سەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد، هیچ دەسەڵاتێکی وەهای نەهێڵاوە بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان، سەبارەت بە خاوەنداری سەروەت و سامانی کوردستان، یان ئەگەر روون و دروست تر بڵێین بۆ خەڵکی کوردستان هیچی نەهێشتوەتەوە:

١- بەپێی برگە (ه)ی ماددەی (٢٥)، هەرچی سەروەت و سامانی سروشتی هەیە لەعێراق موڵکی گەلی عێراقە.

٢- برگە (ج)ی هەمان مادده مافی نەخشەکێشانی **سیاسەتی مالی** عێراقی داوە بە حکومەتی ئیتیحادی ئینتیقالی، واتە سیاسەتی (واریدات و نەفەقاتی گشتی دەوڵەت).

ئەوەی لەپێناسەی (**المالیة العامة**) بەباشی وردبێتەوە، دەگات بەو راستیەی کە: هەرێمی کوردستان و پارێزگاکان و شارەوانییەکانی چی وەهایان بەدەستەوە نییەو ناتوانن لەو نەخشەو بریارانە لادەن کە دەکەوێتە نێو (سیاسەتی مالی) ناوەندی ئیتیحادییەوە. ئەوەی گرنگ بێت بۆ ئێمەی کورد وەکو دەسەڵاتی هەرێمی کوردستان، و خەڵکی کوردستان (کانزا سروشتییەکانی وەکو نەوت و گاز... هتد)، هەروەها (رسومات و باج) کە دوو ستوونی بنەرەتی واریداتی عێراقە. یەکەمیان **موڵکایەتی (گەلی) عێراقە**، و راستەوخۆ گرێدراوە بە ناوەندی ئیتیحادییەوە، و دووەمیان **پێشەکی** بەستراوەتەوە بە سیاسەتی گشتی **مالی عێراق** و هەم بە **نەخشەی گشتی** رسوم و باجی ناوەندی، واتە لە واقیعی عەمەلیدا هەردوو گرێدراون بەناوەندی ئیتیحادەوەو دەکەونە چوارچێوەی (**المالیة العامة**)و بە نەخشەو شێوەی پیادەکردن و دابەشکردنیان، بۆ سەلماندنی ئەوەی سەرەوە:

١- بودجەی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە لایەن حکومەتی ئینتیقالی ناوەندی ئیتیحادییەوە دیارو تەمویل دەکرێت، هەر وەکو برگە (أ)ی مادده ٢٥ی ئەم دەستورە دیاری کردووە.

٢- ئەو دەسەڵاتانەی کە لەماددەی (٥٦)ی یاساکەدا هاتووە، لەتەمویل کردنی پارێزگاکان و شارەوانییەکان.

**جـێگای سـەرنجـە شـاندی کـورد پێی دانەگـرتووە (ئەگـەر هەوڵیـشی دابێت سەرنەکەوتووە)، لە دابەش کردنی واریداتی کوردستان لەنێوان هەرێمی کوردستان و دەسەڵاتی ناوەند، چ وەکو بەش و چ وەکو رێژە، بە تایبەتی (نەوت وگاز...هتد) هەر وەکـو لە زۆر لە دەقـەرەکـانی فـیـدراڵی وڵاتـانی دیکە پیـادە کـراوە، هەر بۆ نموونە و هاوزەمـان لەگەڵ دارشتنی دەقەکانی ئەم دەسـتـورە، سەرکـردایەتی سـیاسی خـواروی سودان لەگـەڵ حکومـەتی ناوەندی سودان مشـتـومـڕیان نەبوو لە سەر دابەش کردنی واریداتی نەوتی خـوارووی سـودان لەنێـوان ئیـدارەی خـواروو و دەسـەڵاتی نـاوەند، چونکە ئەمـە حـسـم کـرابـوو، بەڵـکو سـوور بوون و پێ داگـرتنی نـوێنەرانی خـوارووی سودان لەسەر بەش و رێژەکەی بوو کە لە سەرەوەی(٥٠ ٪)یان مەتڵەب بوو...!**

جا ئیتر ئەوە چی فیدراڵیەتێکە کە:

* بەو شێوەیە سەرو گوێی هەرێمەکەی کرابێت (کە کەم ترە لە ٣ پارێزگا).
* بەو هەمـوو ئەگـەر و لەمـپـەرانەی تەعـریب و گـۆڕینی قـەوارەی ناوچەو یەکـە ئیدارییەکانی.
* کەرکوک بە دەربێت لە هەرێمی کوردستان.
* یان بەو بێ دەسەڵاتیەی سەبارەت بە واریدات و سامانە سروشتیەکانی دارێژراو، جگە لە (پرسە خەسوانەیەک)، سەبارەت بە بودجەکەی، کە بە مەرکەزیەت بۆی دادەنرێت و تەئمین دەکرێت.
* یا هیـچ رۆڵێـکی کـــاریـگەری وەهای نەبێت لە چارەنووسی یاســـاو بڕیاری دەسەڵاتەکانی یاسادانان و کارگێڕی ئیتیحادی و دادگای ئیتیحادی باڵا.

لە واقـیـعـێکی وەها ئاڵۆز و پڕ لە گرفت و تەوژمی بیروبۆچونی رەگەز پەرەستی و دژایەتی ناوخۆ و ئیقلیمی، و مـامەڵە کردنی زیاتر لە یەک ساڵی لایەنی ئەمریکی و هاوپەیمانانی، کە تەسبیت کراوە لەم یاسایە، ئەمەیش وەکو هەیە مشتومڕی زۆری لەسەرەو سـەرەڕای ئەمانە هەمـووی چ گەرەنتی وەهایش تەئمین نەکراوە، مەبەسـتیش گوایە دیموکراتیەتە...!

ئەگـەر(ضـمـان) دیموکـراتیـەت بێت، کێ دەڵێت دیموکـراتیـەت هەمـیـشـە (گـەرەنتی- ضـمـان)ـە بۆ سەلماندنی مـاف و دەسەڵاتی گەلانـی دیکە، بە تایبەتی لە بارودۆخی ئێـمـەی کـورد و کلتـووری وڵاتەکـەمـان و مـامـەڵەی داگـیـرکـەرانی و ئەزمـوونی رابردوومان...! لەگەڵ ئەوەش:

**بەریتانیا** گەورەترین و کۆنترین وڵاتی دیموکراتی بوو لە دونیا ، کەچی بە دەیان ساڵ وڵاتانی دیکەی داگیرکردبوو ، و سەروەت و سامانیانی زەوت کردبوو. چیان بەسەر (ئێرلەندییەکان) هێنا... دواتریش(فۆلکلاند) ، هەر بۆ نموونە. مەگەر پاش ساڵی ١٩١٤ بە ناوی رزگاری عێراق و شارستانیەت و دیموکراسیەوە ناوچەکەی داگیر نەکرد؟ وەعدی دەوڵەتی بە کوردیش نەدا؟ هاوکاری هێزەکانی نەبوین...؟! کەچی کوردستانیان پارچە پارچە کرد.
(سیڤەر)ی گۆڕیەوە بە(لۆزان) ، کە داکۆکیمان لە مافی خۆمان کرد بە فڕۆکە و تۆپ و لەشکرکێشی وەڵامی داینەوە کە تاکو ئێستایش نرخەکەی دەدەین...! ئێستاش هەر ئەو بەریتانیایەی جاران و هاوپەیمانی ئەمریکایەو کوردیش هینی هەردوولا...!
ئەی **دیموکراتیەتی فەرەنسا** نەبووە هۆی زیاتر لە سەد ساڵی داگیرکردنی الجزائر کە نرخی رزگارییان یەک ملیۆن شەهید بوو. و تاکو ئێستایش ئاسەواری ئەو داگیرکردنە لەجەستەی میللەت ونیشتمانی(الجزائر) کاریگەری خۆی هەیە، نرخەکەشی دەدەن...!
**ئەمریکا**(وەک پێناسە دەکرێت) : مەڵبەندی دیموکراتی و رۆشنبیری و پێشکەوتنە، کەچی زیاتر لە دووسەد ساڵ جیاوازی رەگەزی و کۆیلەیەتی تێدا زەق و روون بوو، بگرە تاکو ئێستاش کێشەی یەکسانی گرفتی زۆری ماوە...!
چی نەهێنا بە سەر ڤێتنامییەکان و هیندی چینیدا...! مەگەر هەر ئەمریکا و هاوپەیمانانی نەبوون (سەدام حوسەین)یان هێنا و کردیانە مێردەزمە بە سەر عێراقیەکان و ناوچەکە و هاوکارو پشتیوانی بوون...!
**ئیسپانیا** وڵاتێکی دیموکراتییە، بڕوانە چییان بەسەر باسکەکان و کەتەلۆنییەکان هێنا ، و تاکو ئێستاش زۆریان ماوە بگەن بەمافی خۆیان...!
مەگەر دیموکراتیەتی **ئەڵمانیا و ئیتالیا** نەبوو، هیتلەر و نازیەکان و مۆسۆلینی و فاشییەکانی هێنایە سەر حوکمی هەردوو وڵات و کارەساتی شەڕی کەونی دووهەمیان بەرپا کرد...؟
هیندوستانیش زۆرجار بە نموونەی وڵاتێکی دیموکراتی باس دەکرێت، لەگەڵ ئەوەش دژی هەست و خواستی کشمیریەکانە... هتد.
**دیموکراتیەت** ئەو کات بەرێوە دەچێت و(ضمان)ـە بۆ نموونە لە حاڵەتی ئێمەدا:

١ . ئەگەر مافەکان و ئەرکەکان بە بەند و بە دەقی دەستووری روون و حاسیم زامن کرابن.
٢ . ئەگەر دابەش کردنی دەسەلاٌت و یەکسانی، چ لە نێوان دەزگاکانی ئیتحادی و، چ لە نێوان ناوەندی ئیتیحادی و هەرێمەکان ناوەڕۆک و سنووری دیار بێت.
٣ . لایەنەکان و کۆمەڵگاکەش، لە رووی سیاسی و کۆمەلاٌیەتی و فەرهەنگی و ئابووری... هتد، ئەوەندە پێگەیشتوو بن کە بتوانن ئەو بنەمایانە لەیەکتر قەبوڵ بکەن. هەر هەمان شت سەبارەت بە مافی هاوولاٌتی، و مافی گەلان و بنەماکانی مافی مرۆڤیش... هتد.

کورد بۆ مافی خۆی، جگە لە زەمانەتی دەستووری (کە بەداخەوە لەم دەستوورە کاتیە بەدی ناکرێت وەکو پێویست)، دەبێت بە قورسایی خۆی و کێشەکەی و **قوربانیەکانی، سووربێت لە سەر زەماناتی نێو دەوڵەتیش**، جا چ ئەو زەمانەتە هی خودی هاوپەیمانی ئەمریکی بێ (وەکو هێزی داگیر کەری عێراق)، یان هاوکارمان بن (بە دەقێکی فەرمی)، بۆ وەرگرتنی بڕیارێکی وەها لە نێوەندەکانی بڕیاری نێودەوڵەتی... یان هەر چ نەبێت پشتیوانمان بن لەوەی کە کورد خۆی لە کوردستانی عێراقدا بڕیار بدات لەسەر چارەنووسی خۆی، **لە رێگای ریفراندۆمێک، و ئەنجامیشی لە دەستووری هەمیشەیی عێراق تەسبیت بکرێت..!**

ئەمە نە خەونە نە خەیاڵ و نە توندڕەوی و زیادرۆییە و نە مەحاڵ، بەڵکو لای کەمەوە ئەزموونی پوختەی نزیکەی یەک سەدەی ململانێ و دەستبڕین و یاری کردنی زل هێزەکانە (بە ئەمریکاو ولاٌتانی ئیقیلمی و بەگشتی و حکومەتە یەک لە دواییەکەکانی عێراقیشەوە)، بە کێشەو مافی چارەنووسی خەڵکی کوردستانەوە.

وا دەبینین چۆن (ئەمریکاو نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەورووپا) راستەوخۆ سەرقاڵی چارەسەرکردنی مافی خەڵکی خوارووی سودانن لە چوارچێوەی ولاٌتێکی فیدراڵدا. یان پشتگیرو، هاوکاری خەڵکی بیابانی رۆژئاوان (الصحراء الغربیە)، بۆ ئەوەی خۆیان بڕیاری چارەنووسی خۆیان بدەن، چ وەکو دەوڵەتێکی سەربەخۆ یان پێکەوە ژیان لەگەڵ ولاٌتی مەغریب... خۆ دانیشتوانی ئەم بیابانە بە رەگەز عەرەبن و بە ئایین ئیسلام، و ئەلجزائیر و مەغریبیش هەم عەرەبن و هەم ئیسلام، هەردوو میللەتیش (خوارووی سودان و بیابانی رۆژئاوا) نە بە قەد کورد رۆژئاوا و ئەمریکاو ولاٌتانی دراوسێ غەدریان لێ کردووە و نە قوربانی و کارەساتەکانیان دەگەنە ئاستی

ئەوانەی کـورد و نە لە رادەی پێشکەوتنی کۆمـەڵایەتی و فـەرهەنگی و ئیـداری و ئیمکانیاتی ئابووریش لەگەڵ کورد بەراورد دەکرێن...هتد.
**زۆر لایەن کوردی بە کارهێناوە بۆ مەرامی تایبەتی خۆیان و پاشان دەستیان بڕیوە و ئەنجامی تەنها مـاڵوێرانی و قڕکردن وکیـمابـاران و ئەنفـال و راگـوێزان و تەعریب و تێکدانی ژێرخـانی ئابووری و کـۆمـەڵایەتی و شێـواندنی قـەوارەی نەتەوایەتی و دووبەرەکێی نێو خۆ بووە.**
بەشداری کورد لە دامودەزگاکانی ناوەندی عێراق، بێ پشتیوانی و زامن کردنی ئەو مافانەو پاراستنی بە شێوەیەکی وەها چیتر پێشێل نەکرێ و پشت گوێ نەخرێت یان لە (گەمەیەکی دیموکراتی)دا مافـەکانی کـورد وەکـو کەمـینەیەک لە بڕیاری زۆرینە نەپارێزرێت، ئەوە (وەکو دەڵێن کرینی ماسیە لە دەریا و تەنها مەرەکەبی سەر کاغەز دەبێـت). **بۆیە ئێـستا ئەو قۆناغ و ئەو هەلە مێژوویە و ئەو کاتەیە، کە نابێت کورد بەهیچ شێـوەیەک سـازش لە سـەر (گـەرەنتی= ضـمـان)ی دەسـتـووری و نێـو دەوڵەتی بکات...**
ئەزموونی دەقی(٥) دەستـووری پێشـووتر و بەشـداری کورد لە چوار- پێنج قـوناغی حوکمڕانی و چەندین کابینەی عێراق ئەوەی سەلماندووە، بەشداری بێ (زەمانەت) لە واقـعی ئێـمـەی کـورد، **لە عـێـراق مـوغـامـەرەیەکی بێ حـیـسـابە**، یـان وەکـو کـورد ئەڵێت(کوێخایەتی بن سێبەر)ـە...!
لەم (دەستووره کاتیەی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی)، جارێکی دیکەش دووپاتی دەکـەینەوە، بە داخـەوە هیچ جـۆرە(گـەرەنتی- زەمـان)ێکی بە فـیـعلی و روون تیـدا نییە بۆ کورد، ئەوەش هەیە رووکەش و شکلیە و بە پێچەوانەی ئەو راو بۆچوونانە، کە پروپاگەندەی بۆ دەکرێت. سەرەڕای ئەو ماددە و بڕگانەی کە باسمان کرد، و ئەو هەمـوو کـۆسـپ و تەگـەرە و(ئیـسـتـسنائانە)هەندێ رۆژنامـە و گـۆڤـارە کـوردیەکـان لاپەڕەکانیان دەڕازانەوە و بە مـانشێتی گەورە دەیاننووسی، (**فـیدراڵیزم وەک کورد دەیویست جێگیر کرا...!**) یـان **بۆ یەکەم جار ئیعتراف بە(هەرێمی کوردستان) کرا**، یـــان (**کورد بووە خاوەنی سەروەت و سامانی کوردستـان..هتد**)، تـوێـژێـک لـە سیاسەتمەدارانی کورد جەختیان لەسەر نەمانی تەعریب و گەڕانەوەی ناوچە بەعەرەب کراوەکـانمان بۆ نێو هەرێمی کوردستان یان سنووری کوردستان یان تەسبیت کردنی کوردستانییەتی کەرکوک و گەڕانەوەی بۆ باوەشی هەرێمی کوردستان، لەو دەستووره

کاتییه دەکردو، ڕەسمیەتی زمانی کوردی و مافی ڤیتۆی (کورد) لەسەر دەستووری ئاینده، یان یاساکانی کۆمەڵەی نیشتمانی... یان... یان... هتد دەنرخاند.

لە کاتێکدا دەبوایە لایەنی کوردی لە بەغداو، ئەو سیاسەتمدار و ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردیانە هەر لە سەرەتاوە لە نیازی خراپی لایەنی ئەمریکی، یان لایەنەکانی غەیرە کورد لە ئەنجومەنی دەسەڵاتی کاتیی عێراق بگەیشتایەن کاتێک:

**١ - شەراکەتی کورد و عەرەبی لە عێراق سڕییەوە. عێراق پێناسە کرا بە یەک وڵات و یەک گەل، ئەویش گەلی عێراقە.**

**٢- هەرێمێکی فیدراڵ بە ٣ پارێزگا تەحدید کرا. باشە بۆ بە ٤ یان ٥ پارێزگا تەحدید نەکرا..؟!**

٣- **ئیستسنا ء کردنی بەغدا و کەرکوک** لە پێکهاتەی هەرێمێک... دەکرێت ئەوەی بەغدا قووت بدرێت، چونکە لە لایەکەوە پایتەختی عێراقە و نموونەش زۆرە چونکە پایتەخت لە دەوڵەتێکی(ئیتیحادی) تایبەتمەندی خۆی هەیە، هەروەها ژمارەی دانیشتووانی لە سنووری ٢٠٪ی دانیشتووانی گشت خەڵکی عێراقە، بەڵام **ئیستیسنا کردنی کەرکوک** جێگای گومانەو، نەدەبوایە لایەنی کوردی چارەنووسی کەرکوکیان بەو شێوەیە قەبووڵ بکردایە. **بەش بەحاڵی خۆم دڵنیام** بەپێی مادده و بڕگەکانی ئەم **(دەستووره کاتیه) کورد(کەرکوک) لە باوەشی هەرێمی کوردستان نابینێتەوە**، ئەو هەرێمەی کە پەسەند کراوەو پیادە دەکرێت لە قۆناغی ئینتیقالی بەپێی بڕگە(أ)ی مادده ٥٣ تەحدید کراوە بەو ناوچانەی تاکو ڕۆژی ٢٠٠٣/٣/١٩ لەژێر کۆنترۆڵی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا بووە... هەروەها زۆربەی ناوچە بەعەرەب کراوەکانی دیکەی کوردستانیش چارەنووسیان لە چارەنووسی کەرکوک زۆر باشتر نابێت.

جارێکی دیکەش هەرچی بێت هۆ و هۆکاری پشت پەردەی دانووستاندنی شاندی کورد لە (لیژنەی داڕشتنی یاسای ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی)، زۆر لە مادده و بڕگەکانی ئەم یاسایە کە پەیوەندی بە دۆزی ڕەوای کوردەوە هەیە، لە قازانجی کورد و لە ئاستی قوربانیەکانیدا نییە، بە تایبەتی بەڕەچاوکردنی مەوقیع و ڕۆڵی کورد لە ڕزگاری و ئیدارەی عێراق. جگە لەو زەرەر و زیانە کە کورد و

کێشەکەی تووشی بوونە پاش رزگارکردن و داگیر کردنی عێراق، چی لە دەستدانی هەندێ لەو نیمچە سەربەخۆییەی کە هەمان بوو، وچی لە دژایەتی کردنی کورد لە لایەن جادەی عەرەبی عێراقی زۆرینەوەو، هەڵوێستی ولاتە ئیقلیمیەکان، و مامەڵەی هاوپەیمانی ئەمریکی دەسەڵاتدار.
ناوەرۆکی چارەسەرکردنی کێشەی کورد و بن بڕکردنی سیاسەت و دەرئەنجامەکانی تەعریب و گۆڕینی قەوارەی نەتەوایەتی و حەسم کردنی کێشەی سنووری کوردستان و پەیوەندی هەرێمی کوردستان لەگەڵ ناوەندی عێراق لەسەربنەمای فیدالیەتە. ئەو فیدرالیەتە کە(گشت لایەنە سیاسیەکانی کوردستان یەکبوون لە سەری و پەرلەمانی کوردستان بڕیاری لە سەردابوو و دەسەلات و سنووری دیارکرابوو، و (کەرکوک)پایتەختەکەی بوو...).
**زۆر لە مافەکانی گەلی کوردستان لە دەرگای ئەم یاسایەوە هاتوونەتە ژوورەوە، بەڵام لە پەنجەرەو کەلێنەکانی خودی ئەم یاسایەوە دەرهێنراون، یان تەلغیم کراون.** ئەمەش جگە لە لاسەنگ کردنی تەرازووی دەسەلات، خاڵێکی لاوازە بۆ شاندی کورد و جارێکی دیکە هەلێکی باشمان لە دەستدا.
**بۆ نموونە:**

١- هەموو دونیا دەزانێت عێراق کیانێکی فرە نەتەوەیی وفرەئاین و فرەمەزهەبە. بۆ ئێمەی کورد ئەم فرە لایەنیەو پاراستنی ئەهمیەتی خۆی هەیە(یاساکە بە نیوەچڵی دگان بەم جیاوازیە دادەنێ (بڕگە(ب) مادده ٧)...

هەر لە سەرەتای دامەزراندنی ئەم(عێراق)ـەوە شەراکەتی عەرەب و کورد سەلمێندراوە و بەڵگەنامەش زۆرە، چی لە سەرەتای دامەزراندنی ئەم ولاتە، یان پاش نەمانی نیزامی پادشایی و لە دایک بوونی نیزامی کۆماری ساڵی ١٩٥٨، کە بەپێی مادده ٣ ی دەستووری کاتی ساڵی ١٩٥٨، واتە بە دەقێکی دەستووری.
کورد و عەرەب وەکو دووگەل شەریکن لە عێراق. کەم یان زۆر لە دەستوور و بەڵگەنامەکانی پاش رژێمی قاسمیش ئەم شەراکەتە رەنگی دابووەوە، ئەگەر چی تەوژمی رەگەزپەرستی و شۆڤێنی ئەو رژێمانە، نەک هەر ئەو شەراکەتەیان لە ناوەڕۆک دامالی، بەلکو جینۆساید

کراین، هەر ئەم قرکردنەش فاکتەرێکی گرنگ بوو بۆ رزگاری عێراق و پاشان داگیر کردنی، کەچی لەم قۆناغە، (قۆناغی) رزگاری و ئازادیی عێراق و داگیر کردنی لە لایەن گەورەترین هێزی ئەم سەرزەمینە و ، خاوەن بەرنامەی رزگاری و ئازادی و مافی مرۆڤ، وەکو ئەمریکای(هاوپەیمانی) کورد، لەدیباجە ولە چەند ماددەیەکی دیکەی ئەم(دەستوورە)، لەجیاتی (چەسپاندنی واقعی فرە نەتەوایەتی عێراق، واتە لە جیاتی گەلانی عێراق)، (گەلی عێراق) تەسبیت دەکەن. ئەمەش لە واقعدا بازدانە بەسەر خسوسیەتی گەلی کورد و گەلانی دیکەی ئەم کیانە کە پێی دەڵێن عێراق. هەر وەکو لە جێگایەکی دیکەی ئەم باسە ئاماژەمان بۆ کردووە.

٢-زاراوەی (فیدراڵیەت) لەسەر ئەساسی جوگرافی و مێژوویی، نە پێشینەیەکی زانستی هەیە لە رووی پێناسەوەو، نە ئەزموونێکی پیادەکراوی هەیە لە واقعدا، بۆ ئەوەی بتواندرێت لە بەراورد کردندا سوودی لێ وەرگرین. هەروەها بە پێچەوانەی خواست و بڕیاری گەلی کوردستان بووە. ئەم جۆرە(فیدراڵیەتە) لە جەوهەردا فیدراڵیەتی (پارێزگاکان)ە کە لە رێککەوتنامەی رۆژی ١٥/١١/٢٠٠٣ لە نێوان ئەنجومەنی دەسەڵاتی کاتیی عێراق و بەرێز(پۆل بریمەر)دا ئیمزا کرا. سەرەڕای ئەوەش خودی(فیدراڵیەت) لە سەر ئەساسی جوگرافی و مێژوویی پێناسەو ئیجتهادی زۆر بە خۆوە دەگرێت، نەدەبوو لایەنی کوردی کێشەکەی کورد توشی زەلکاوی وەها بکەن. ئەگەر لایەنی کوردی پشت گەرم بێت بە لایەنی ئەمریکی کە ئەمڕۆ حاکمی موتڵەقی عێراقن، ئەوە زاراوەی(جوگرافی و مێژوویی)لای ئەوان چی ئەهمیەتێکی نییە، بگرە قەڵسیش دەبن، چونکە خۆیان وەکو (ئەمریکی)، کە کێشە دەگاتە بنج و بنەوانەی مێژوویی و جوگرافی کۆڵن...! ئەگەر بکەوێتە نێوان کورد و عەرەبیشەوە، دوور نییە ئەم هەویرە ئاو زۆر بکێشێت.

٣- پەسەندکردنی لایەنی کوردی بە قەتیس(حصر) کردنی کێشەی تەعریب تەنها(بە رژێمی پێشوو)و پرەنسیپی راپرسین و دەنگدان سەبارەت بە

خاکی کوردستان: پاشگەزبوونەوەی شاندی کوردە سەبارەت بە تەعریبی ئەو ناوچانەی کە لە سەردەمی رژێمەکانی دیکەی پێش رژێمی پێشوو ئەنجام درابوو، هەروەها گومان خستنە سەر کوردستانیەتی ناوچە تەعریبکراوەکانمانە، بەمە دوورنییە چارەنووسی هەندێ ناوچەی کوردستان بکەوێتە گێژاوەی ئەگەرەوە.

هەر بۆ نموونە حەویجە پارچەیەکە لە کەرکوک و کەرکوک خاکی کوردستانە. بە هۆی تەعریبی ئەم شارە، هەر لە سەرەتای دامەزراندنی عێراقەوە، قۆناغ لە دوای قۆناغ، زۆرینەیەکی بەرچاوی عەرەبیان بۆ هێناوە.

سڕینەوەی شوێنەواری تەعریب بە پێی ئەم(دەستوورە) لە هەر هەوڵێکی گەڕانەوەی عەرەبی حەویجە بۆ جێگای کۆنی خۆیان دوورنییە لە حوکمی موحاڵدا بێت.

هەروەها خودی **نێو شاری کەرکوک**، بە پێی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧(تورکمان و مەسیحییەکان و عەرەب)*، کەمتر نین لە رێژەی کورد و پاش نزیکی نیو سەدە لە تەعریب و راگوێزان و گۆڕینی قەوارەی نەتەوایەتی، تۆ بڵێیت راپرسینی چارەنووسی ناو شاری کەرکوک لە قازانجی کورد دا بێت.

لێرەدا ئێمە باسی شاری مووسڵ هەر ناکەین...!

٤- دوور نییە (رەهن) کردنی چارەنووس و دوارۆژی هەر بستێک لە خاکی کوردستان بە پرۆسەیەکی دەنگدان و راپرسی هەنگاوێکی کەم وێنە بێت بۆ کێشەی میللەتان و بڕیارێکی حەکیمانە نەبێت هەتاکو ئەگەر ناچاریش بێت، لە هەمووشی زیاتر جێگای پرسیارو سەرسوڕمانە رەهن کردن و گرێدانی چارە نووسی سنووری کوردستان بە بڕیاری **(کۆمەڵەی نیشتیمانی ئایندەی عێراق کە پێکدێت لەزۆرینەیەکی عەرەبی رەها).**
**یەک لە دووربینی بارزانیی ئەمەر لەسەر چارەنووسی ناوچە بەعەرەبکراوەکانی کوردستان** و، بەتایبەتی شاری کەرکوک لە کاتی

---

* بە پێی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ رێژەی کوردو عەرەب و تورکمان لە ناو شاری کەرکوک بەم شێوەیە بوو: (کورد-٤٨٫٣٪ ، عەرەب -٢٨٫٢٪ و، تورکمان ٢١٫٤٪ ).

**سەرچاوە:** د. نوري طالباني، منطقة كركوك و محاولات تغيير واقعها القومي - ص٦٤- دار ئاراس للطباعة والنشر- الطبعة الثالثة- اربيل٢٠٠٤.

مۆرکردنی ڕێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ساڵی ١٩٧٠، ئەوەبوو کە ڕازی بوو بە **سەرژمێری نەک ڕاپرسین**، ئەوەش پاش سڕینەوەی ئاسەواری **تەعریب و لە سەر ئەساسی سەرژمێری گشتی ساڵی ١٩٥٧.** واتە بۆ بڕیاری کورد (ئەنجامی سەرژمێری)، **نەک دەسەڵاتی ناوەند**(ئەنجومەنی بە ناو شۆڕشی ئەوسا...هتد) یان(بڕیاری کۆمەڵەی نیشتمانی عێراقی داهاتوو)...

٥- مافە بنەڕەتییەکانی ئەم دەستوورە لە ڕوانگەی مرۆڤایەتی و زۆرینەوە زۆر گرنگن، بۆ نموونە: بە پێی برگە(ج)ی ماددە١٦ هەموو هاوولاتییەکی عێراقی ئازاد کردووە لە خاوەنداری و موڵکداری بێ مەرج لە سەرتاسەری عێراق. هەر بە هەمان پرنسیپ لە کوێ کاربکات و بژیت، مافی وەها بەو(ڕەها)ییە، و بۆ کەمینەیەکی وەکو کورد لە کوردستانی عێراق، بەرامبەر بە زۆرینەی عەرەبی عێراق و، پاش ٨٣ ساڵ لە بەربەرەکانێ و پێشێل کردنی ماف و تەعریب و گۆڕینی قەوارەی نەتەوایەتی و قڕکردن و ئەنفال و کیمیاباران، جێگای مەترسییە...!

ئەم دەقانە زۆر ڕوون و زەقن، ئەگەر شاندی کورد هەستی پێ نەکردبێت ئەوە مووسیبەتە، ئەگەر هاتوو هەستی پێ کردبێت، ئەوە مووسیبەتەکە گەورەتر دەبێت، کە دەبینین هەوڵی هیچ جۆرە تەسبیت کردنی میکانیزمێکی وەهایان نەداوە، کە هەندێ لە(ئیستغلال) کردنی نیازپاکی ئەم چەند پرەنسیپە گشتیانە کەم بکاتەوە!

هەرچەندە بەم یاسایە گرێکوێرەکان زیاتر ئاڵۆزتر بوونەو، هەندێ لەو گرێیانە کردنەوەی لەحوکمی موحاڵە، بەڵام هێشتا کورد دوو دەرفەتی دیکەی لە پێشدا ماوە:

یەکەمیان: لە داڕشتنی دەستووری هەمیشەیی ئایندە.

دووهەمیان: بڕیاری ڕاپرسینێک بدرێت لە کوردستان لە ژێر چاودێری و سەرپەرشتی دەسەڵاتی ئەمریکی و هاوپەیمانانی و کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، تێیدا کورد خۆی بڕیاری چارەنووسی خۆی بدات، هەر وەکو لە زنجیرە وتارێکماندا لە ڕۆژنامەی(خەبات) ژمارە «١٣٣٩»، «١٣٤٠» ، «١٣٤١»، «١٣٤٢» ،لە مانگی ٢٠٠٣/١١ بلاوکرایەوە...

## پوختەکەی

١- سەرکردایەتی سیاسی کورد نەیتوانی هیچ پەیمان و بەڵێنێکی نووسراوو رەسمی لە هێزەکانی هاوپەیمان، بە تایبەتی ئەمریکا وە دەست بێنێ، بۆ تەئمین کردنی دوا رۆژی کێشەکەی لە کات و لە کۆتایی قۆناغی رزگاری عێراق. ئەگەر دەڵێنیش بەڵێ بەڵێنمان وەرگرتووەو، ئەنجامی ئەم دەستوورەیە، ئەوە دەقەکانی ئەم دەستوورە کە پەیوەندی بەکێشەو مافی کوردەوە هەیە، خۆی شەرعی خۆی دەکات. واتە (یاسای بەڕێوەبردنی «**دەوڵەتی عێراق**» بۆ قۆناغی ئینتیقالی)، نەک (**دەوڵەتی فیدراڵی یان ئیتیحادی عێراق**).

٢- سەرکردایەتی سیاسی کورد نەیتوانی لە قۆناغی هەڵمەتی رزگاری عێراق کێشەی ناوچە بە عەرەبکراوەکان وەکو پێویست چارەسەرکات، جا لە نیازپاکی، یان حیساب کردنی بۆ فاکتەری ئیقلیمی، یان لە کورت بینی، یان لە بێ باوەڕی، یان لە پەراوێزکردنی ئەمریکا بێت...هتد. هەل وەکو تیغ وایە نەیبریت دەتبرێ. پێویست ناکات ئیستا ئاخی بۆ هەڵکێشین یان بڵێین هاوپەیمانان، چ ئەمریکا بێت، یان هێزە سیاسییەکانی عەرەبی عێراق، خیانەتیان لێ کردین و پاشگەز بوونەوە. ئەوانیش وەکو ئێمە ئامانج و کێشەو بەرنامەیان هەیە، کە هەلیان بۆ رەخسا وەکو خۆیان دەیانەوێ ئاوا دەکەن جا باکوردیش بە پێی بەرژەوەندی بالای خۆی هەڵسوکەوتی بکردایەو، باشتر سوودی لەو هاوپەیمانیەتی و هاوکاری و تەنسیقانە وەرگرتبایەو دەرفەتەکانی باشتر بقۆزتبایەوە، یا ئەوەندە بەشتی بچووک و لاوەکی مەشغوول نەبایەو کچی خۆی نەکردبایە بە قوربانی کوڕی خەڵکی.

٣- سەرکردایەتی سیاسی کورد لە دامەزراندنی ئەنجومەنی دەسەڵاتی کاتیی عێراق، کە رازی بوو بە ٥ ئەندام و، بۆ پۆستی وەزارەتەکانیش کە بۆ هەردوو حاڵەتەکە لە رێژەی ٢٠٪ تێ نەپەڕی، ئەمەیش دەستپێک و سابیقەیەکی باش نەبوو، ئەگەرچی کورد لە عێراق گرفتی بەشداری لە دەسەڵاتی ناوەند و ناسنامەی نەبووە وەکو کورد، بە تایبەتی لە کاتی لاوازی دەسەڵاتی ناوەندا...! ئەم دیاریدەیە دووپات بووەوە لە سەرەتای دامەزراندنی ئیداراتی کەرکوک و لە

هەندێ ناوچەکانی دیکەی بە عەربکراومان، لە بەر هەر هۆیەک بێت، نەدەبوو سەرکردایەتی سیاسی کورد ئیقراری ئەو جۆرە بەشدار بوونەی بکردایە، لە دەزگاکانی ئەنجومەنی پارێزگا، یان لە دەزگا ئیدارییەکان. هەرچی نەبێت دەکرا نارەزایی و خۆپیشاندان و مانگرتنی ئاشتیخوازانە و مەدەنی، لە لایەن جەماوەری ئەو دەڤەرانەوە ئەنجام بدرایە لە کاتێکدا داگیرکەری ئەمریکی سووربوو (تاکو ئێستایش سوورە) لە سەرپێشێل کردنی ماف و بەرژەوەندی کورد لە کەرکوک، بڕوانە یاداشتنامەی گروپی کوردی لە پارێزگای کەرکوک لە ٢٠٠٤/٦/١٠ سەبارەت بە هەڵوێستی ئیدارەی مەندی ئەمریکی(CPA)* لە کەرکوک کە وێنەیان دابوو بە بەڕێز(بریمەر و گشت دەزگا و بەرپرسە پەیوەندداره‌کان) یان لە مەخموور، کە وەکو ناوچەیەکی سەر بە پارێزگای مووسڵ، یان شێخان...هتد، و زۆرجار کۆبوونەوەکانیان لەگەڵ پارێزگاری مووسڵ لە مەخموور ئەنجام دەدەن. **ئایا کورد تووشی کیمیاباران و ئەنفال دەبوو ئەگەر هات و بەرەسمی و بە یاداشتێک و لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەگەری، بۆ گشت خەڵکی کوردستان و عێراق و جیهانیش ئیعلانی ئەوەی بکردایە کە ئەم جۆرە رێژەو نوێنەرایەتیە قابلی قەبووڵ کردن نییە، لەگەڵ ئەوەش نابێتە کۆسپ و بەشداریش دەبێت...هتد.**

٤- خەڵکی کوردستان بڕیاری فیدراڵیەتی دابوو لە سەر ئەساسی(جوگرافی و نەتەوایەتی) و لە چوارچێوەی سنووری کوردستانی خۆیدا ، کەچی ئەمریکا رەتی کردەوە، و لە جیاتی ئەوە، فیدراڵیەتی پارێزگاکانی بۆ تەسبیت کرد، گروپی کوردییش لە ئەنجومەنی دەسەڵاتی کاتی عێراق لەگەڵ زۆربەی هەرەزۆری ئەندامانی دیکەی ئەنجومەنەکە پەسەندیان کرد و لە ٢٠٠٣/١١/١٥** ئیمزا و جاڕدرا.

٥- خەڵکی کوردستان داوای سەروەت و سامانی خۆی کرد لە کوردستانی خۆیداو بەو جۆرەی کە خاوەنی بێت و بەشی دیاری کراوی هەبێت پاش ئەوەی لەسەری رێک دەکەون لەگەڵ لایەنی بەرامبەر، هەرچۆن لە زۆربەی زۆری کیانە فیدراڵییەکانی دیکەی سەر ئەم سەرزەمینە دیاری کراوەو پیادەش دەکرێت،

* بڕوانە دەقی یاداشتنامەکە لە پاشکۆی ژمارە «٥»-ل٢٣٣ و، هەروەها پاشکۆی ژمارە «٢١»-ل٤٠٢

** بڕوانە دەقی رێکەوتننامەکە لە پاشکۆی ژمارە «٤»- ل٢٣٠

کەچی سەروەت و سامانی کوردستان (نەوت) کرا بە موڵکی (گەلی عێراق) نەک ( گەلانی عێراق)و (مشاورەکردنیش) کە لەیاساکەدا هاتووە، کەمترە لە پرسە خەسوەکەی خۆمانی کوردی و نەوتی خوارووی عێراق کەمتر نییە لە نەوتی کوردستان!

٦- خەڵکی کوردستان داوای کرد سنووری کوردستان حەسم بکرێت، کەچی بەپێی ماددەو برگەکانی ئەم (دەستوورە کاتییە) چارەنووسی کوردستانیەتی زۆر لەشارو شارۆچکەکانی ئەم دیوی سنوورەکانمان و، لە قووڵایی کوردستان، بە کۆمەڵێک فرتوفێڵ خراوەتە بەردەمی ئەگەری لەدەستدانیان..! ئەم هەموو گرفتانە کۆسپن بۆ ئێستاو بۆ قۆناغی دانوستاندنی ئاییندە لە نێوان کوردو لایەنەکانی دیکەی عێراقی:

* ئەگەر پیاوەتییە لەپای چی..؟!
* ئەگەر فەرز دەکرێت، بۆ قبووڵ بکرێت..؟!
* ئەگەر مروونەت و شەفافیەتە.. بۆ کێ..؟!
* ئەگەر بۆ هاوپەیمانان و ئەمریکایە، بۆ دەبێت کورد هەمیشە بەرخی قوربانی بێت..؟!
* ئەگەر لەبەر وڵاتانی ئیقلیمییە ئەوە کورد بۆ دەبێت - هەر گێسکەکەی هەیاس بێت-..؟!
* ئەگەر بۆ زۆرینەی عەرەبی برای باڵا دەستمانە، ئەوە هیچ کات وەکو ئەمڕۆ کورد گیرۆدەی هەڵمەت و شاڵاوی دژایەتی جادەی عەرەبی نەبووەتەوە، لای کەمەوە (٨٣) ساڵە ململانێی کورد، **وەکو پێناسە دەکرێت** لەگەڵ رژێمە یەک لەدوا یەکەکانی عێراق بووە، لەماوەی ئەم (١٤) مانگەی دواییدا کورد کەوتۆتە بەر شاڵاوێکی توندو ناڕەوا، لەلایەن پانتاییەکی گەورەی جادەی عەرەبی عێراق و دەرەوەی.

یەک لە فاکتەرە سەرەکییەکانی ئەم شاڵاوە کە کورد تێیدایە وەکو کورد (**مطلوبە**) هاوپەیمانێتی کوردە لەگەڵ ئەمریکا، ئەمریکاش وەکو هێزی باڵای دەسەڵاتی داگیرکەرو بەڕێوەبەری عێراق و هاوپەیمان، چارەسەرکردنی

کێشەی کوردی ڕووبەڕووی (گەلی) عێراق کردۆتەوە، واتە کوردو زۆرینەی عەرەبی باڵا دەست و بە ڕواڵەت وەکو بلێیت خۆی دوورە پەرێز دەگرێت، لە کاتێکدا بە وجودی ئەمریکا لە عێراق و سیاسەتی ڕۆژانەی ئیدارەی مەدەنی بریمەر و عەسکەریەکانی و **پاشگەزبوونیان لەبەرنامەی ریشەکێش کردنی (استئصال)ی حزبی بەعس و گۆڕینی بۆ (استزراع البعث)، وای لێهات عێراق ببێت بە مەڵبەندێکی (جذب)ی تیرۆرو تیرۆریستانی دنیا**.

* کوردیش ئەگەر بە تەمای خۆیەتی، ئەوە وێنەو سیناریۆکان لەبەرچاوە.
* ئەگەر بەتەمای هاوکاری و هاوپەیمانێتی عەرەبی برای زۆرینەمان بێت! ئەوە ئەوەی لێکەوتەوە کە وەکو یاسا لەبەردەستدایەو ئەوەش هەڵوێستی جادەکەیەتی.

* ئەگەر ئومێدمان بە کاکە (بریمەر) بوو، ئەوە ئەویش وەکو (خەلیل زادە) و (گارنەر) کاری تەواو بوو و لەم ڕۆژانە دەڕوات، هەرچۆن سەرکردایەتیی سیاسی کورد هەڵوێست و مامەڵەی باشی لەگەڵدا کرد و ئەوەی ویستی بۆی کرا، ئەویش هەندێ (قسەی) خۆشی بۆ کردن..! وەکو (گارنەر) و (خەلیل زادە) دەبێ چاوەڕێی یادوەرییەکانی بکەین، یان پاش زیاتر لە(٢٥) ساڵی تر لە ئەرشیفە ڕەسمییەکانی ئەمریکاو وڵاتانی دیکەی پەیوەندار بەدوای نامەو فاکس و ئیمێلەکانیاندا بگەڕێین و بزانین ئەو (دۆستانە)مان چیان لەگەڵ کورددا کردووە..!
* کورد ئەگەر بە تەمای ئەمریکای زلهێز بێت. ئەوە ساڵێک زیاترە چۆن و (کووی) کردووە، هەروەها دەکات، ئەگەر ڕووداوەکانی سێکوچکەی سوننی و نارەزایی ئەم باڵ، یان ئەوەی دیکەی شیعە نەبایە، دوور نەبوو چەک داماڵینی کوردو تەحجیم کردنی دەسەڵاتی ناوچەی ئازادی کوردستان هەنگاوی سەرەکی دوای قۆناغی ڕزگاری عێراقی بایە و، وەکو هەر هێزێکی داگیرکەر، ئەمریکایش ڕۆژێک دێت هەر دەبێت بڕوات، ئەو مەترسیانەش کە لە نامەکەی بەڕێزان ( بارزانی و تاڵەبانی) بۆ جۆرج بوش لە ١/٦/٢٠٠٤ هاتووە، لە جێگای خۆیەتی و (قائم)ە..!

با هەموو لایەک کار بۆ ئەوە بکات بارودۆخەکە نەگات بەو رادەو ئاستەی کە ئەم هەلەش لەدەست بچێت، هەرچەندە شێوەو شێوازو میتۆدی جیاجیا زۆرن بۆ گەیشتن بەو ئامانجە، بەڵام لە هەمووی گرنگتر بۆ ئەم قۆناغە:

* پاش یەکبوونی ئیرادەی کورد و ئەهمیەتی کەناڵە دپلۆماسیەت و نێو دەوڵەتییەکان، شەفافیەتی شێوەو شێوازی مامەڵە کردنی سەرکردایەتیی سیاسی کوردە لەگەڵ جەماوەرو بنکەو مەڵبەندەکانی دروست کردنی راوهەڵوێست لەکوردستان و لەدەرەوەی کوردستانە.

* گواستنەوەی ململانێیەکە چ لەگەڵ داگیرکەری ئەمریکی و دەسەڵاتی ناوەندی ئیتیحادی و چ لەگەڵ لایەنەکانی غەیرە کورد لە کۆمەڵگای عێراقی، لەنێو ژوورە داخراوەکان و کەناڵە سیخورییەکان و لەنێوان چەند کەسێک، بۆ جادەی کوردستان و جەماوەرو دامودەزگا مەدەنییەکانی، ئەمەش هیچ کات لە رۆڵ و مەوقیع و پلەو پایەی سەرکردایەتیی سیاسی کوردستان کەم ناکاتەوە، بەپێچەوانە، ئەو جوهد و وزەو تواناو هەوڵانە بە هێزو کۆک و پتەو دەکات و کێشەکە دەگوێزرێتەوە بۆ نێو جەماوەری کوردستان و هێزی داگیرکەرو دەسەڵاتی ناوەندی ئیتیحادی لەبەغدا.

ماوەیەکە خەریک بوون لەگەڵ هێزی داگیرکەرو هاوپەیمانانی و لایەنە عێراقییەکانی غەیرە کورد، پوختەی ئەو یاساییە کە شاندی کورد بەشداربوو لە دارشتن و پەسندی کردووە، کە:

**١- (فیدراڵییەت)ـەکەی بێ مۆرکی نەتەوایەتی بێت (مادە ٧).**

**٢- هەرێمی فیدراڵ نابێت لە (٣) پارێزگا زیاتر بێت مادە(٥٣) تەنها سلێمانی و هەولێر و دهۆک.**

**٣- کەرکوک بەدەر بێت لە تەشکیلەی هەرێمێک، واتە بەدەر لە هەرێمی کوردستان مادە(٥٣-ج)،**

**٤- سنووری هەر (١٨) پارێزگاکانی عێراق دەستکاری ناکرێت لە قۆناغی ئینتیقالی، واتە وەکو خۆیان دەمێننەوە تاکو پەسند کردنی دەستووری**

هەمیشەیی و هەڵبژاردنی (کۆمەڵەی نیشتمانی و حکومەتی عێراقی هەمیشەیی لە ئایندە) مادە (٥٣-ب) لەوێش هیچ سەقفێکی زەمەنی دیاری نەکراوە، حەسمیش لای زۆرینەی عەرەبی بالا دەستە لە کۆمەڵەی نیشتمانی.

٥-چارەنووسی ناوچە بەعەرەبکراوەکانمان و گەڕانەوەیان بۆ باوەشی هەرێمی کوردستان بەند نییە بەرای خەڵکی کوردستانەوە، بەڵکو بە بڕیاری (کۆمەڵەی نیشتمانی) هەڵبژێردراوی ئایندەی عێراق مادە (٥٣-ب) کە دوور نییە رێژەی برای عەرەبی بالادەستمان و نوێنەرانی غەیرە کورد لە (٧٥٪) زیاتر بێت.

٦- لە هەر (٣) دەزگای دەسەلات (یاسادانان= کۆمەڵەی نیشتمانی)، دەسەلاتی کارگێڕی بە هەردوو باڵەکەیەوە (ئەنجومەنی سەرۆکایەتی و ئەنجومەنی وەزیران) (دەزگای دادوەری بە دادگای بالای فیدرالەوە) کورد نە وەکو ژمارە و نە وەک رێژە ئەندام نییە، بەڵکو وەکو هاوولاتییەکی عێراق، واتە ئەندامیەتی کورد لەم دامودەزگایانە مۆرکی نەتەوایەتیی پێوە نییە.

٧- بەپێی مادە(٢٥) دەسەلاتی ناوەند لە بەغدا چی دەسەلاتی ئەوتۆی نەهێلاوە بۆ حکومەت و پەرلەمانی کوردستان.

٨- تاکو ئێستاش مەعلوم نییە بەشی کورد لە پۆستە سەرەکییەکانی حکومەتی ئینتیقالی و ئایندە وەک سەرۆک کۆمار و سەرۆک وەزیران چی لێدێت.

٩- چ رێژەیەک یان بەشێک لە واریداتی عێراق، یان لە کوردستان بۆ خەڵکی کوردستان دیاری نەکراوە (مادە٢٥) سەروەت و سامانی عێراق بەپێی ئەم یاسایە موڵکی گشت (گەلی) عێراقە. نەک (گەلانی) عێراق.

١٠- مادە (٦٠-ج) وەکو باسی لێوە دەکەن (ضمان)ـە بۆ کورد، ئەم زەمانەش یەک ئیحتیمالە بۆ کوردو (٥)ئیحتیمالە بۆ عەرەبی زۆرینەو یەکجاریش پیادە دەکرێت، ئەویش تەنها بۆ پەسند کردنی رەشنووسی دەستووری هەمیشەیی ئایندەیە، نەک یاساو بڕیارەکانی کۆمەڵە و حکومەتی ناوەندی ئایندەی عێراق.

ئەمانەو بگرە هەندێ بابەتی دیکەی ئەم یاسایە زەق و روونن، لەگەڵ ئەوەش دەگوترێ سازش نەکراوە لەسەر مافەکانی گەلی کورد لەبەغدا..!

ئەنجامی ئەم قۆناغە ئەو واقیعەیە کە تێیدا دەژین و ئەو تاڵی و موعاناتەیە کە لە **ناوەڕۆکی نامەی ٢٠٠٤/٦/١ی بەڕێزان بارزانی و تاڵەبانی بۆ بەڕێز بوش بەدی دەکرێت.**

کورد خیاراتی کەمەو مەودای مناوەراتی تاکو بێت تەسکتر دەبێتەوەو ململانێکەش سەخت و ئاڵۆز تر دەبێت، **بزاڤی رزگاریخوازی کوردیش هێشتا ژمارەیەکە لە هاوکێشەی عێراق و ناوچەکە، ئەگەر هات و سەرکردایەتییەکی بەحیکمەت و بە جورئەت کاری بۆ بکات**..!

میحوەرەکانی ململانێی دوای قۆناغی گەڕانەوەی (السیادە) بۆ عێراقییەکان لەژێر سێبەری شمشێری زیاتر لە (١٥٠) هەزار سەربازی ئەمریکی و هاوپەیمانانی و (٣) هەزار لێپرسراوو پسپۆڕ و کارمەندی باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە بەغدا کە وەعد دراوە لە ئایندەیەکی نزیکدا دەست بەکار بن، شالاوی تیرۆریستان و سەرهەڵدانی بەرخودان لەنێو توێژە جیاجیاکانی عێراقییەکان، ئەگەرچی هێشتا ئەوراقەکان تێکەڵاوە، دەبێتە ناوەڕۆکی باسی ئایندەمان..!

٢٠٠٤/٦/٢٠

---

تێبینی:
ئەم بابەتە بە(٧) بەش لە رۆژنامەی «خەبات» ژمارە (١٦١٥- ١٦١٦- ١٦١٧- ١٦١٨- ١٦١٩- ١٦٢١- ١٦٢٢) لە ٨-٢٠٠٤/١١/١٧ بڵاوکراوەتەوە.

له سەرەتای ئەم مانگەوە، بە تەحدید، لە ڕاگەیاندنەکانی کوردستانەوە، ژمارەیەکی زۆر لە بەرپرس و سیاسەتمەدارو پسپۆڕ و ڕۆژنامەوان و خەڵکی هۆشیار و هۆشمەندی کوردستان، بە دیدو بۆچونێکی نوێ و ڕەخنەگری بەرچاوەوە، باس لە ناوەڕۆکی (یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی)و ئاماژە بۆ کەمتەرخەمی و لاساریی حکومەتی ناوەندی بەغدا دەکەن، سەبارەت بەو خالانەی کە پەیوەندارن بە (هەرێمی کودرستان) و ناوچەکانی تەعریب کراوی کوردستان و ئەو کۆسپ و لەمپەرانەی کە (کۆمسیۆنی بالای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی عێراق) دەیانخاتە بەردەم پرۆسێسی هەڵبژاردن لە کوردستان.
سیاسەت و مامەڵەو ڕەفتاری (کۆمسیۆنی بالای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی عێراق) بۆ هاوولاتیانی کوردستان سەرنج ڕاکێشەو، پێش ئەوەی بێمە سەر باس کردنی ئەو سیاسەت ومامەڵە کردنەی ئەم (کۆمسیۆن)ـە، بە پێویستی دەزانم ئەم چەند خالە بخەینە ڕوو:

١ـ ئەم کۆمسیۆنە بە پێی یاسای ژمارە (٩٢)، کە لە ٢٠٠٤/٥/٣١ *لەلایەن (سەرۆکی ئیدارەی مەدەنی ئەمریکی پۆل برێمەر (یادی بە خێر نەبێت) مۆر کراوە، واتە ئەو کاتە بووە کە عێراق داگیر کرابوو، یاساکەش بە ناوی (القانون رقم ٩٢)، (القاضي بتأسيس المفوضية العليا المستقلة للانتخابات في العراق) دەرچووە، پرۆژەی ئەم یاسایەش کاتی خۆی و پێش دەرچواندنی، خراوەتە بەردەمی (ئەنجومەنی کاتی دەسەلاتی عێراق) لە بەغدا و ئەویش پەسەندی کردووە، لە سەرەتای ئەم یاسایەو لە بەشی (١) و لە ژێر ناونیشانی (الغاية)دا هاتووە هەر وەکو دەقە عەرەبییەکەی:

الجزء ١: (الغاية)

(تؤسس مفوضية الانتخابات العراقية المستقلة (المفوضية) وتعطي الصلاحية لتنظيم ومراقبة وإجراء وتنفيذ جميع الانتخابات المنصوص عليها في قانون ادارة الدولة للمرحلة الانتقالية...تم تأسيس المفوضية لضمان الاستقلال الكامل عن التأثير السياسي وللاستفادة من المشاورات المستمرة مع الكيانات الدولية مثل الأمم المتحدة والتي أدارت بفاعلية وحياد انتخابات حرة ونزيهة في أمم خارجة من عهود ظلم وصراع ونضال عنيف.)

** بڕوانە دەقی یاساکە لە پاشکۆی ژمارە «٩» - ل٣٠٤

٢ـ ئەم جەخت کردن و سوور بوونە لە دامەزراندنی ئەم (کۆمسیۆنە) وەکو دەزگاو دەسەلات و ئەرک، جارێکی دیکە دووپات دەبێتەوە بە پێی (بەشی٣) و لە ژێر ناونیشانی (تأسیس المفوضية)بەتایبەتی برگە(١، ٢)ی:

الجزء٣: (تأسيس المفوضية)

١ - تؤسس مفوضية الانتخابات العراقية المستقلة كمكتب حكومي مستقل وذو سيادة وغير متحزب وحيادي ومحترف له صلاحية إعلان وتنفيذ وفرض التعليمات والقواعد والاجراءات بموجب القانون بما يتعلق بالانتخابات خلال الفترة الانتقالية. وتكون المفوضية مستقلة عن فروع الحكومة القضائية والتشريعية والتنفيذية وتكون السلطة الانتخابية الوحيدة في جميع أرجاء العراق خلال المرحلة الانتقالية. تتألف المفوضية من مجلس المفوضين (المجلس) والإدارة الانتخابية.

٢ - المهمة الرئيسية للمفوضية هي ضمان ادارة ناجحة للانتخابات بحسب قانون ادارة الدولة للمرحلة الانتقالية ولتحقيق هذا الهدف يحق لها اتخاذ جميع الاجراءات اللازمة تماشيا مع الفقرة الثانية من قانون ادارة الدولة للمرحلة الانتقالية لمراقبة وإدارة انتخابات حقيقية ونزيهة في جميع أرجاء العراق. وستفيد الهيئة من خبرات خبراء الانتخابات الدوليين بما في ذلك وبشكل خاص الأمم المتحدة.

٣ـ ئەم (کۆمسیۆنە) لە ٢٠٠٤/٥/٣١ دامەزراوەو، بە پێی ئەم یاسایە دەستبەکار بوونی لەم مێژووەوە دەبێ:

الجزء الثامن: (تاريخ النفاذ)

يعتبر هذا الأمر سارياً اعتباراً من تاريخ توقيعه في ٢٠٠٤/٥/٣١.

٤ـ لەم چەند ماددە و برگەیانە وە دەردەکەوێت کە:

١ـ ئەم (کۆمسیۆنە) بە تەواوی سەربەخۆ کراوە لە هەر سێ دەسەلاتی عێراقی (یاسادانان)و، (کارگێڕی بە هەردوو باڵەکەیەوە)و، (دادوەری). لە کاتێکدا (مەکتەبێکی حکومی)یشە..!!، (بەشی ٣-١). ئەم جۆرە دەسەلاتە (رەها)یە (بۆ مەکتەبێکی حکومی)، ئەگەر بۆ لایەنی عەرەبی عێراقی حوکمڕان، ئەوەندە مەبەست نەبێت، ئەوە دەبوایە بۆ لایەنی کوردی خاوەن ئەزموونێکی دیموکراسی هەڵبژێردراو، بە پێی بنەمایەکی یاسایی

پەسەند کراو، ئەویش یاسای ژمارە (١)و ژمارە (٢)ی ساڵی ١٩٩٢و هەڵویستی زۆربەی لایەنەکان سەبارەت بە بنەماو شێوەی فیدراڵیەت و، ئەو هەموو کۆسپ و تەگەرەو پاشقولانەی ناو (یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی)، جێگای بایەخ پێدان بوایەو، هەر وا بە سادەیی و بێ وردبوونەوە بەسەریاندا دەرباز نەکرایەت.

٢ـ دامەزراندنی ئەم (کۆمسیۆن)ـە بە پێی پشت بەستن بووە بە (ماددە٢)ی (یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی) هەر وەکو لە (بەشی ٣)ی بڕگە (٢)ی سەرەوە تەسبیت کراو هاتووە. لەم ماددە و گشت ماددەکانی دیکەی یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی، لە غەیری ئیقزار کردنی هەڵبژاردن بۆ هەردوو قۆناغەکەی پێش قۆناغی هەمیشەیی، واتە (کاتی و ئینتیقالی)، چ شەرت و مەرجی وا (ڕەها)ی تێدا نییە. **ئەو یاسایە لە ئاستی (دەستوورە)، ئەمەش واتە (یاسای٩٢) ئەم کۆمسیۆنە لە شێوەی فەرمانە واتە (امر)ـە، نەدەبوو دەسەڵاتی کۆمسیۆنێک کە (بە فەرمانێک) دامەزرابێت لە سەروەی دەستوور بێت..!**

٣ـ یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی لە ٢٠٠٤/٣/٨ لەلایەن (ئەنجومەنی دەسەڵاتی کاتی عێراق)ـەوە* مۆر کراوەو، هەر لە هەمان ڕۆژیشدا جاڕدرا. یاسای (٩٢) (یاسای کۆمسیۆنی باڵای هەڵبژاردنەکانی عێراق)، هەر وەکو لە سەروە تەسبیت کراوە لە ٢٠٠٤/٥/٣١، لەلایەنی دەسەڵاتی داگیرکەری ئەمریکی پەسەند و ئیمزا کراوە. واتە پاش نزیکەی (٣) مانگ، لە مۆرکردن و جاڕدانی (یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی). شاندی کورد کە ڕاستەخۆ بەشدار بوونە لە داڕشتنی و، بەرپرسیار بوونە لە موتابەعە و بەراورد کردن و بەدواداچوونەوەی ئەم یاسایەدا، تۆ بڵێیت دەرکیان بە (ڕەها)یی دەسەڵاتی ئەم کۆمسیۆنە نەکردبێت..؟!، بەتایبەتی: بە بەراورد کردنی لەگەڵ گرفتەکانی (یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی)و، ئەگەر

---

** بڕوانە دەقی یاساکە لە پاشکۆی ژمارە «٧» - ل٢٤٠

ئەوانیش دەرکیان نەکردبێت بەوە، خۆ ئەوە بە دەیان پسپۆڕ و یاساناس و ڕۆشنبیری کوردستانی لە ناوەوە و لە دەرەوەی ولات، ئەو یاسایانەیان خستە بەر شەن و کەوی زانستی و، هەر لە ڕۆژانی یەکەمەوە پەنجەیان نایە سەر گشت گرفتەکان. تۆ بلێیت ئەوانە هەر هەمووی و، **هەڵوێستی زۆر لایەنی عەرەبی(برای بالا دەستمان)و، شەمبوزی ڕێژەیەکی فراوانی جادە عەرەبیەکەی عێراق دەرحەق بە کوردو، (نیاز پاکی و دەم راستی) (کاکە برێمەرو ئیدارەکەی)، ئەوەندە کاریگەری نەبوبێت کە هەندێ بە وردی و بە سەلیقەت و هۆشیاری مامەڵەیان لەگەڵ رەشنووسی یاسای (٩٢) بکردایە و ئەمیشیان نەبوایەتە (کوێرە مار)و بینالێننە ئەستۆی کورد و بەتایبەتی کەرکوک و ناوچەکانی دیکەی کوردستانی تەعریب کراو**، هەر وەکو زۆر لە مادده و برگەکانی (یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی) و چەند یاسا و (فەرمانی) دیکەی ئەو سەردەمە.

٤ـ وا لە هەموو کون و قوشبنێکی کوردستان هەڵلایە بە تایبەتی دژ بە کۆمسیۆنی بالای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی عێراق. بەلام پاش چی..؟، پاش نزیکەی (٧) حەوت مانگ لە دەرچوون و پیادە کردنی ئەو یاسایەو کارکردنی ئەم کۆمسیۆنە و نزیک بوونەوەی کات و رۆژی هەڵبژاردن. دیارە رەخنەکانیش زیاتر ئاراستەی ئەنجوومەنی ئەم کۆمسیۆنە دەکرێت. (بەشی ٤)ی یاسای (٩٢) و لە ژێر ناوونیشانی (مجلس المفوضین).چوارچێوەو بنەمای کاری ئەم ئەنجوومەنەی دیاری کردووە.

دەکرا هەر کاتی خۆی بە پێی خودی ئەم یاسایە و یاسای (بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی)، کورد پێی داگرتبایە و حەدێکی بۆ خروقات و زیادەڕۆیی ئەم ئەنجوومەنە دابنایە، بە تایبەتی (ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوک)و (دەستەی بالای هەڵبژاردنەکانی هەرێمی کوردستان)، دوور نییە دەزگای دیکەش هەبێت، لایەنە پەیوەندیدارەکانی ئاگادار کردبێتەوە لەم بارەیەوە.

٥ـ ئەو کەسانەی کە پاڵێورابوون بۆ ئەندامەتی ئەنجومەنی ئەم کۆمسیۆنە بە گشتی و بەشی کورد لەم (ئەنجومەنە)و گشت کارمەندی ئۆفیسەکانی بە تایبەتی و،

به ڕەچاوکردنی دەسەلاتی (ڕەها)ی ئەم کۆمسیۆنە بالایە، یەک لە خالە هەرە گرنگەکان بوو و، نوێنەرانی کورد دەبوایە لەمەڕ دەستنیشان کردنیان وردتر و جدیتر بونایە. هەلوێستی وەها سروشتی و پێویست بوو، کە جووتە لەگەل پرنسیپەکانی هەلبژاردنی (٩) ئەندامەکەی و بڕیاردانیان. **ئەنجامی ئەم ناوردبینییە ئەو گلەو گازندانەیە کە ئێستا لە (کۆمسیۆنی بالا) دەکرێت**، بەلام دیارە هەندی لە ئەندامانی ئەم کۆمسیۆنە وەکو پرنسیپ بەرامبەر بە هەلبژاردنەکانی هەرێم و ناوچەکانی تەعریبکراوی کوردستان، هەلوێستێکی (سلبی)یان هەیە، بە تایبەتی زیاتر کە باس دێتە سەر باسی کەرکوک.
بڕگە (١و ٢و ٣)ی بەشی (٥)ی یاسای ژمارە (٩٢)و لە ژێر ناوونیشانی (تنظيم مجلس المفوضين) دا لەم بارەیەوە باسی ژمارەو شێوەی دەنگدان و چۆنیەتی دەستنیشان کردنی ئەندامانی ئەم کۆمسیۆنە دەکات:

(الجزء٥) (تنظيم مجلس المفوضين)
بڕگە (١):
١- يتألف المجلس من (٩) أعضاء بما في ذلك (٧) أعضاء يحق لهم التصويت يكونون مواطنين عراقيين وعضوين لا يحق لهم التصويت. العضوين الذين لا يحق لهم التصويت هما رئيس الهيئة الأنتخابية كما ذكر في الجزء (٦) (٢) من هذا الأمر وخبير الأنتخابات الدولي المختار من قبل الأمم المتحدة... ويخدم الأعضاء السبعة الذين يحق لهم التصويت الى حين تشكيل هيئة جديدة بعد انتهاء المرحلة الأنتخابية أو اليى ما بعد (٣) شهور من المصادقة على أول أنتخابات في ظل الدستور الدائم بحسب الفترة الأقصر. تؤخذ قرارات المجلس بالأجماع ، ما أمكن ذلك ، وفي حال تعذر الحصول على الأجماع يسود قرار أغلبية بسيطة من الأعضاء الذين يحق لهم التصويت الحضور بشرط أكتمال النصاب الا اذا نص هذا الأمر على غير ذلك .)
بڕگە (٢):
(٢- يستطيع العراقيون والمنظمات العراقية تقديم اقتراح مرشحين لمنصب اعضاء المجلس الناخبين السبعة الي الأمم المتحدة، تقوم الأمم المتحدة

باعداد قائمة بالمرشحين المؤهلين اخذة بعين الأعتبار الترشيحات المقدمة وتقدمها الى مجلس الحكم الذي يقوم بدوره بترتيب مرشيحن من القائمة ليتم تعيينهم من قبل الحاكم المدني. تبعا لذلك يقوم الحاكم المدني بتعيين أعضاء المجلس السبعة الذين يحق لهم التصويت ويقوم أمين عام الأمم المتحدة بتعيين خبير الأنتخابات الدولي كعضو لا يحق له التصويت في المجلس.)

برگە (٣)ی ئەم یاسایە جەخت لەسەر کۆمەڵێک پرنسیپ و مەرج دەکات سەبارەت بە هەڵبژاردن و دامەزراندنی ئەو (٧) کەسە کە جگە لەوەی کە ئەبێت عێراقی بن، دەبێت خاوەن خووڕوشتی پاک و بێ گەرد بن لە بێ لایەنی و نەزاهەت و ئیستقامەو (المهنية والحكم السليم كما يجب ان تنطبق عليهم المعايير المذكورة في المادة (٣١ - ب) (من قانون ادارة الدولة للمرحلة الأنتقالية). الأشخاص الذين يعتبرون مواطنين عراقيين يحسب المادة (١١) من القانون المذكور أو المؤهلين للمطالبة بالجنسية العراقية بحسب المادة (١١) من القانون ذاته يحققون متطلب الجنسية لعضوية المجلس. المؤهلات المفضلة لعضوية المجلس تشمل مهارات في الأدارة والعدل والتعيين والتجارة والدفاع الأجتماعي وغيرها من اشكال القيادة المدنية.).
شایانی باسە ( مادده (٣١-ب) ی (یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی)، تایبەت بە مەرجەکانی پاڵێوراوان بۆ ئەندامەتی (ئەنجوومەنی نیشتمانی ئینتیقالی ئایندەیەو، مادده (١١)یش مافی جووت شناسنامەیی و گەڕاندنەوەی شناسنامەی عێراقی بۆ ئەوانەی کە مەحروم کراون لێی.. هتد).

٦ـ واتە (کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی عێراق) لە(٩) کەس پێک دێت بە لای کەمەوە دەبێت (٧)یان عێراقی بن. بە پێی پێکهاتەی عێراق و ئالیەتی وەرگرتنی (بڕیار) لە ولاتەکەو لە قۆناغی کاتی، هەر وەکو ڕاگەیەندراوە، **دەبێت بە (تەوافق) بێت. مافی کورد بوو کە لە (٢ تا٣) ئەندامی لەم (کۆمسیۆنە) هەبایە. لانی کەم (٢) لە (٧) ئەندامە کارگێڕەکەی**

**لیژنەکە کە مافی دەنگدانیان هەیە دەبوایە کورد بن و، هەر بە هەمان ڕێژە بۆ گشت ئۆفیسەکانی دیکەیش*.**

ئەوانەی کە شارەزاییان هەیە لە کاروباری ئیداری، بە تایبەتی ئەگەری ململانێی تێدا مەزەندە بکرێت و، پرۆسەکەش ناوەڕۆکی کێشەیەکی سیاسی هەبێت، ئەوە تەقدیری ئەهمیەتی ڕۆڵ و کاریگەری (کارمەندەکان)و (لێپرسراوانی) ئەو ئۆفیسانە دەکەن و، هەر ئەوانە بەفیعلی وەکو کادیرێکی مامناوەندی بڕیارو ڕێنماییەکان جێبەجێ دەکەن و، هەر ئەوانیش دەتوانن کۆسپ و تەگەرەیەکی زۆر دروست بکەن و، هەر ئەوانیش ئاگادارن لە وردەکارییەکان، هەروەها ژمارەو نوعیەتی ئەو کوردانە کە لەو ئۆفیسانە کاردەکەن (ئەگەر هەبن) دەوری کاریگەری هەیە بەتایبەتی لە ئۆفیسی ناوەندی لە بەغدا. بە گشتی تاکو ئێستا خەڵکی کوردستان لەم بارەوە ئاگادار نین لە ژمارەو ڕێژەو نەوعیەتی ئەو کوردانەی کە لەو دەزگا گرنگەدا کار دەکەن، کە (برێمەر) لە سەرووی هەر سێ دەزگا دەستوریەکەی عێراق داینەوە ( دەزگای یاسادانان) و (کارگێڕی بە هەردوو باڵەکەیەوە)و (دادوەری)، ئەمەیش خۆی لە خۆیدا دیاردەیەکی کەم وێنەیە لە بواری یاساداناندا..!

باشە ئەوە ئەم ڕاستیانە بە سەر ئەو کوردانەدا تێپەڕین کە ڕاستەوخۆ بەرپرسیار بوون لە ئامادە کردن و داڕشتنی یاسای ژمارە (٩٢)، هەروەها بە سەر گروپی کوردی لە (ئەنجوومەنی دەسەڵاتی کاتی ئەو کاتەی عێراق)یش تێپەڕیوو، بەڵام خۆ لە ٢٠٠٤/٧/١، کە هەر سێ دەزگاکانی دەسەڵاتی ئەمڕۆی عێراق پێک هات و لە هەر (٣) دەزگاکەدا کورد هەم نوێنەری هەیەو، هەم وەکو ڕاگەیەندراویشە بڕیارەکانیان بە تەوافقە.

کە واتە نوێنەرانی کورد لە بەغدا لە پێش و لە پاش دەرچواندنی هەر جۆرە یاساو بڕیارو ڕێنماییەکی ناوەند ڕاستەوخۆ بەرپرسیارن کە:

١ـــ **بە گشتی**: پێویستە ئاگاداری سەرکردایەتی سیاسی کورد و پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان بکرێتەوە لێیان.

* خۆ ئەگەر لەسەر بنەمای شەراکەت کوردو عەرەب مامەڵەیان لەگەڵ ئەم کۆمسیۆنە بکردایەت، ئەوە دەبوو نیوەی کورد بێت!!.

٢ـــ **بە تایبـەتی**: خۆیان وەکو نوێنەرانی کورد راستەوخۆ، چ وەکو تاک لە شوێن و
پلەی لێپرسراویەتی و چ وەکو فراکسیۆنی کوردستان لە هەر سێ دەزگاکانی
دەسەلاتی ناوەند..

لەملاشەوە پەرلەمان و حکوومەتی هەرێمی کوردستان بە ( هەردوو باڵەکەیەوە)و دەسەلاتی دادوەری کە وەکو لایەنی پەیوەندار چاودێرە، بەرپرسیارن لە موتابەعەو دەربڕینی هەڵوێست لە پێش و لە پاش دەرچواندنی هەر جۆرە یاســاو بریار و رێنماییەک کە لە ناوەندی بەغداوە دەردەچێت (ئەگەر ئاگادار بکرێنەوە لێیان)، بە تایبەتیش ئەوانەیان کە راستەوخۆ، یان ناڕاستەخۆ پەیوەندییان بە کورد و هەرێمی کوردستانەوە هەیە. سەرەڕای ئەمانە هەر هەموو کوردو کوردستانییەکان نوێنەرایەتییان هەیە لە ئەنجوومەنی پارێزگاکانی: مووسڵ و کەرکوک و دیالە بە تەحدید.

**کەچی رەوتی رووداوەکان و بڕیارەکانی حکومەتی کاتی عێراق و پیادەکردنی یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی و، بڕیار و هەڵسوکەوتی ئەم (کۆمسیۆنە) کە ناوەڕۆکی باسەکەمانە، رەنگدانەوەی ئەم (توافق)ی پێوە دیار نییە..!**

زیاتریش: گلەو گازندەی نوێنەرانی کورد لە ناوەندی بەغدا (لە نێو خۆ بۆ خۆیان)ـە، سەبارەت بە کێشەکان، سەرنج راکێشە..!

( کۆمسیۆنی بالای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی عێراق)، هەیئەتێکی دەستنیشان کردووە بۆ سەرپەرشتی هەڵبژاردنەکانی هەرێمی کوردستان بە ناوی (دەستەی بالای هەڵبژاردنەکان لە هەرێمی کوردستان)و، سەرۆکەکەشی (د.نوری تاڵەبانی)یە، راستەوخۆش گرێدراوە بەو کۆمسیۆنە لە هەموو روویەکەوە، هەرچەندە لەم رۆژانەدا بیستمان ناوبراو دەستی لەو کارە کێشاوەتەوە، چونکە پاڵێوراوی ئەندامەتی پەرلەمانی کوردستانە..

ئەم (کۆمسیۆنە) ئەوەندە گوێ نادات بە(دەستە)کەی هەولێرو، بە پێی قسەکانی (د.نوری تاڵەبانی) مامەڵەی (کۆمسیۆنی بالا) هەر لە مامەڵەی جارانی کاربەدەستانی بەغدای ناوەندی سەدام دەچێت، کە لە کاتی خۆیدا لەگەڵ دەزگا حوکمە زاتییە کارتۆنییەکەی (ناوچەی کوردستان)یان دەکرد. دوور نییە زۆر لەمانە هەر لەوانە بن کە لە نێو دەزگاکانی ناوەندی کۆندا کاریان دەکرد.

هەر بۆ نموونە:

١ـ (٨٥٪)ی فۆرمەکانی دەنگدانی شاری هەولێر هەڵەی تێدایەو، دەبێت راست بکرێنەوەو، ئەو فۆرمانە لەلایەن ئەم (کۆمسیۆنە)وە ئامادە کراون (هەرچەندە دەڵێن لە دەرەوە پڕ کراونەتەوەو، لەسەر هەمان ئەو سیدیەی پارێزگای هەولێرە، کە کاتی خۆی نوێنەری ئەم حکومەتە ناردویەتی بۆیان...)، گریمان واش بێت، (کۆمسیۆن) بەرپرسیارەو، لە رێگای ئەوانەوە ئەدرێت بە (بایعەکان) (ئەگەر نیازیان پاک بایە چۆن رازی بوون دابەشی بکەن لە کاتێکدا (هەزارەها فۆرم هەر ناوی یەکەمی کەسەکە خۆی بووەتە ناوی باب و باپیریشی)و، دابەشیان کردووە بە سەر هاوولاتیانداو، ماوەی راستکردنەوەی هەڵەکانیش هەر لەلایەن ئەم کۆمسیۆنەوە تەحدید کراوە کە دوا رۆژی (١٥/١٢/٢٠٠٤)ـە کە داواش کرا بۆ چەند هەفتەیەک دێژ بکرێتەوە بۆ راستکردنەوەی هەڵەکان، رەفزیان کرد. (ئەگەر چی لەم رۆژانەشدا و لە ژێر فشاری کوردان بۆ چەند رۆژێک درێژەیان پێ دا...).

٢ـ بە پێی راگەیاندنی سەرۆکی دەستەی هەڵبژاردنەکانی هەرێمی کوردستان (د.نوری تاڵەبانی) کۆمسیۆنی باڵا تاکو ٤/١٢/٢٠٠٤ بودجەی بۆ (دەستەکەی) خۆی لە هەرێمی کوردستان دیاری نەکردووە. واتە تا پێش تەواو بونی مۆڵەتی راستکردنەوەی فۆرمە هەڵەکان بە (١٠) رۆژ. تەنها فۆرمەکانی شاری هەولێر (٧٥٠) هەزار فۆرمە وەکو باسی لێوە دەکەن. واتە تەنها ژمارەی فۆرمی هەڵەی شاری هەولێر دەگاتە سنووری (٦٠٠٠٠٠) شەش سەد هەزار فۆرم، فۆرمەکانی دهۆک و سلێمانیشی بخرێتە سەر دوور نییە ژمارەکە خۆی لە (١) ملیۆن فۆرمی هەڵە بدات*، ئەگەر زیاتریش نەبێت..! باسی ناوچەکانی دیکەی کوردستان ناکەم کە لە دەرەوەی (هەرێمی) کوردستانن بە تایبەتیش (کەرکوک) و ئۆفیسەکەی، کە لە واقعیدا بۆ ئێمەی کورد گرنگییان لە پارێزگاکانی (هەرێم) کەمتر نییە ئەگەر گرنگتریش نەبن.

٣ـ تاکو رۆژی ٢٦/١٢/٢٠٠٤، فۆرمی هەڵبژاردنی شارو شارۆچکەکانی (مووسڵ) نەگەیشتبووە دەستی (بایعەکان). سەرچاوە ئاگادارەکان ئەوە رادەگەیەنن کە تاکو پێش چەند رۆژێک هیچ (مەکتەبێک) یان (دەستەیەک)ی

* بروانە دەقی یاداشتێکی (د.نوری تاڵەبانی) لە پاشکۆی ژمارە «٢٢-ل٤٠٦و ٢٣-ل٤١٤»

( کۆمسیۆنی باڵای هەڵبژارنەکانی عێراق) نەبووە لە مووسڵ، ئەو کۆگایەی کە فۆرمەکانی هەڵبژاردنی تێدابووە، سوتێنرا و تاکو ئێستایش لە مووسڵ ئۆفیسی کۆمسیۆنی باڵای هەڵبژاردن بە تەواوی وجودی نییە، مەترسی شەڕو پێکدادانیش لە نێو شاری مووسڵ و دەوروبەری هێشتا ماوە..!

٤ـ لە کەرکوک هەتاکو ئەگەر هەڵبژاردنیش بکرێت و فۆرمەکانیش هەموو راست بکرێنەوە، ئەوە بە لای کەمەوە (١٧٢) هەزار لە هاووڵاتیانی کەرکوک، کە دوور نییە ٩٥٪ی کورد بن و، باقی دیکە تورکمان و برا کلدان و ئاشورییەکان بن...هتد، بۆیان نییە دەنگ بدەن..!

٥ـ (کۆمسیۆنی باڵا) بڕیاری داوە کوردی خەڵکی کوردستانی عێراق کە لە هەندەرانن وەکو هەر هاووڵاتییەکی عێراقی بۆیان هەیە بەشداری لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی عێراق بکەن، کەچی ئەو مافە بۆ هەمان ئەو کوردانە رەوا نابینی بۆ ئەوەی بەشدار بن لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان و ئەنجومەنی پارێزگاکانی کوردستان*. ئەمەش وەکو بڵێیت (بانێکەو دوو هەوا)، دەنا ئەوەی بۆ (کُل) رەوا بێت، چۆن دەبێت بۆ (اجزاء) یان (جزء) رەوا نەبێت..؟!. دیارە لای ئەم (کۆمسیۆنە) (مجموع الاجزاء) ناکات بە کۆی (کُل)..!. سەیر لەوەدایە دەستەی باڵای هەڵبژاردنەکان لە هەرێمی کوردستان ئاگای لەو بڕیارە نەبووە. کە گازندەشی کردووە دیارە تاکو ئێستا ئەنجامی نەبووە، ئەمە پەیوەندی هەیە بە مافی سەدەها هەزار کوردو کوردستانییەوە، کە (دەستووری کاتی) عێراق و (یاسای ژمارە ١)ی پەرلەمانی کوردستان مافی دەنگدانیان پێ داوە. لەسەر (کۆمسیۆنی باڵا)یە، کە بە پێی یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی کار بکات و، نابێت لە جێبەجێ کردنی ئەو یاسایەدا ئینتیقائی بێت و، بۆی نییە لەم بارەیەوە زیادەڕۆیی بکات.

سەبارەت بەم حاڵەتانەو هەندێ گرفتی دیکەش وادیارە نوێنەرانی کورد لە بەغدا و سەرکردایەتی سیاسی کوردیش وەکو پێویست ئەم دیاردەیان ئەوندە بە هەند وەرنەگرتووە تاکو ئێستا، لە کۆڕو کۆمەڵ و راگەیاندنەکاندا، وەکو پێویست، رەنگی نەداوەتەوە و نەکراوەتە کێشەیەکی مەترسیدارو، ئەوەی ئێستا گوێ بیستی دەبین

* بڕوانە دەقی (النظام رقم ١٠)ی کۆمسیۆنی باڵا لە پاشکۆی ژمارە «١٢» - ل٣٢١

دەبوایە هەر لە سەرەتاوە بایە، چونکە ئەوانە وەکو کۆمسیۆن کاری خۆیان کردووە، ئەو ماوەیەش کە ماوەتەوە زۆر کەمەو، جهودی کورد لە نێوان گازندەو ناڕەزایی و پێویستی هاندانی خەڵکی کوردستان بۆ دەنگدان بزر دەکات و دەنگدەرانی کوردستان سارد و بێ ئومێد دەکات و، ئەوەیش کە ئێستا دەکرێت هەندێ درەنگە، بۆیە ئەو بێ دەنگییە دووجار مافی هاووڵاتییانی کوردستانی پێشێل کرد:

١ـ جارێک بێ دەنگ بوون سەبارەت بەم ناحەقیانە، کە ئەم (کۆمسیۆنە) پیادەی دەکات و سووربوونیان لەسەری کە بە روونی فەرق و جیاوازی پێوە دیارە، کە خۆی لە خۆیدا هەڵوێستێکی ناڕەواو، دیاردەیەکی ترسناکەو، نەدەبوو وا پشتگوێ بخرێت و، بە پێچەوانەوە دەبوایە بە جدیتر وەربگیردرایە. ئەم پەراوێزکردنە لەوە دەچێت ئەم بابەتەش وەکو زۆری دیکە راپێچ بکرێت بە تایبەتی لاساری حکومەتی بەغدا لەم بارەیەوەو، کەسیش خۆی نەکات بە خاوەنی و بڵێن ئەمەشمان هیچ، ئەمەش سابیقەیەکی یاسایی و مێژوویی خەتەرناکە کە نابێت بەسەر کورددا دەرباز ببێت.

٢ـ کورد لە هەر کوێ بێت مافی دەنگدانی هەیە، چونکە (یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی) دوو مافی سەرەکی لەم بارەیەوە بۆ سەلماندووە:

* وەکو هەر هاووڵاتییەکی عێراقی کورد مافی دەنگدانی هەیە بۆ ( ئەنجومەنی نیشتمانی عێراق)و (پەرلەمانی کوردستان)و (ئەنجوومەنی پارێزگاکانی) ئەمەش بە (مطلق) هاتووە. لەو یاسایەداو چ ماددە و بڕگەیەکی وا نییە بۆ تەحدید کردن و جیاوزای دەنگدان، بۆ ناوەوەو بۆ دەرەوەی وڵات ، هەروەها هەر هەمان یاسا ئیقراری مافی پتر لە یەک شناسنامەی کردووە بۆ گشت عێراقییەکان، (بڕگە«ج»ی ماددە «١١»: يحق للعراقي ان يحمل اكثر من جنسية واحدة، وان العراقي الذي اسقطت عنه جنسيته العراقية بسبب اكتساب جنسية اخرى يعد عراقيا).

* یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی، دانی بە بوون، واتە بە شەرعیەتی (پەرلەمان و، حکومەت و، دەسەڵاتی دادوەری) هەرێمی کوردستاندا ناوە بە پێی ماددە (٥٣-أ) (ئەگەر چی دان ونینوکیان کراون)، (ماددە ٥٣-أ: ئیعتراف بە حکومەتی هەرێمی

کوردستان دەکرێ کە حکومەتی فەرمی ئەو خاکانەیە، لە پارێزگاکانی دهۆک و هەولێر و سلێمانی و کەرکوک و دیالەو نەینەوا، کە تا (١٩/ئایاری/٢٠٠٣) لەلایەن ئەو حکومەتەوە بەڕێوە دەبرا. دەستەواژەی حکومەتی هەرێمی کوردستان کە لەم یاسایەدا هاتووە، واتە ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان و ئەنجوومەنی وەزیرانی کوردستان و دەسەڵاتی قەزایی هەرێمی لە هەرێمی کوردستان). دەقە عەرەبیەکەی: (یعترف بحكومة اقليم كردستان بصفتها الحكومة الرسمية للأراضي التي كانت تدار من قبل الحكومة المذكورة في ١٩/اذار/٢٠٠٣ الواقعة في محافظات دهوك واربيل والسليمانية وكركوك وديالي ونينوي. ان مصطلح "حكومة أقليم كردستان" الوارد في هذا القانون يعني المجلس الوطني الكردستاني، ومجلس وزراء كردستان والسلطة القضائية الاقليمية في أقليم كردستان).

هەر ئەو یاسایە دان بەوەشدا دەنێت کە حکومەتی هەرێمی کوردستان (هەر سێ دەسەڵاتەکەی هەرێم) بەردەوام دەبن تاکو کۆتایی قۆناغی ئینتیقالی. ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت ئەم یاسایە دانی بە یاسای ژمارە (١) و ژمارە(٢)ی ساڵی ١٩٩٢و گشت یاسا و بڕیارەکانی پەرلەمان و، بڕیارو ڕێساکانی حکومەتی هەرێم و ودەسەڵاتی دادوەری کوردستاندا ناوە. بە پێی مادده (٢٠)ی یاسای ژمارە(١)ی ساڵی ١٩٩٢، (یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانی عێراق): (مەرجە هەڵبژێر لە هاووڵاتیانی کوردستانی عێراق بێ و (١٨) ساڵی تەمەنی تەواو کردبێ) دەقە عەرەبیەکەی: (يشترط في الناخب ان يكون من مواطني كوردستان العراق وأكمل الثامنة عشرة من العمر)، بێ تەحدید کردنی مەوقعی جوگرافی ئێستای ئەو کوردستانییە.

کە کار گەیشتە ئەم ڕادەیە ناچار دەبم جارێکی دیکە بگەڕێمەوە بۆ خودی (یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی)، کە چۆن یاسای ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٩٢ (یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانی عێراق)یان پەکخست، بە تایبەتی تەحدید کردنی یەک ڕۆژی هەڵبژاردن بۆ گشت ناوچەکانی عێراق بە هەرێمی کوردستانەوە. مادده (٥٧-ب) (هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان لە سەرتاسەری عێراق و هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی

کوردستانیش له هەمان کاتدا دەکرێ و نابێت وادەکەش له (٣١ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٥ تێپەڕی)و دەقە عەربیەکەی: (ستجری الانتخابات لمجالس المحافظات في ارجاء العراق كافة، وللمجلس الوطني الكردستاني في نفس موعد اجراء انتخابات في موعد لا يتجاوز ٣١/كانون الثاني/٢٠٠٥). هەروەها بڕیاری (٧٨)ی ٢٠٠٤ ئەنجومەنی دەسەلاتی کاتی عێراق و، بڕیاری (کۆمسیۆنی بالای هەلبژاردنەکانی عێراق) کە عێراق بە هەرێمی کوردستانیشەوە بە یەک ناوچەی هەلبژاردن دانراوە.
بە رای ئێمە ئەم بڕیارە دژی یاسای هەلبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانی عێراقە، هەر وەکو باسمان کرد.
چونکە ئەم یاسایە واتە یاسای ژمارە (١)ی سالی ١٩٩٢ لە:
ماددە (١٤)یدا دەلێت: (لە کاتی تەواو بوونی ماوەی ئەنجومەن، یان هەلوەشانەوەیدا، بڕیارێک لە سەرۆکی دەسەلاتی جێبەجێ کردنەوە لە ماوەی (١٥) رۆژ پاش تەواو بوونی ماوەکە، یا هەلوەشاندنەوەکە دەردەچێ و دەبێ وادەی هەلبژاردنی ئەنجومەنی نوێ بە پێی حوکمەکانی ماددە دوازدەمی ئەم یاسایە دیاری بکات)، دەقە عەربیەکەی: (عند انتهاء مدة المجلس، او حله يصدر قرار من رئيس السلطة التنفيذية خلال خمسة عشرة يوما من تأريخ انتهاء المدة، او الحل، يتضمن تحديدا لموعد الانتخابات للمجلس الجديد وفقا لاحكام المادة الثانية عشرة من هذا القانون).
یان بە پێی ماددە (٦)ی یاسای ژمارە (٤٧)ی سالی ٢٠٠٤ (قانون التعديل الثالث لقانون انتخاب المجلس الوطني لكوردستان العراق المرقم(١) لسنة ١٩٩٢ المعدل)*:
(المادة السادسة: تعدل المادة الثانية عشرة وتقراء كالأتي : يحدد موعد الأنتخابات بقرار من رئيس الأقليم خلال خمسة عشر يوما من تأريخ انتهاء مدة المجلس أو صدور قرار منه بحل نفسه ويعلن بوسائل الأعلام علي المواطنين قبل الموعد المحدد لها بما لا يقل عن شهر).
بە پێی ماددە (٦)ی هەمان یاسا کە تعدیل کراوەو بووەتە ماددە (٢)ی یاسای ژمارە (٤٧)ی سالی ٢٠٠٤، کە دەقە عەرەبییەکەی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

* بڕوانە دەقی یاساکە لە پاشکۆی ژمارە «١٣» -ل٣٢٦

(تشكل بقانون هيئة عليا مستقلة للاشراف علي الأنتخابات في أقليم كوردستان العراق وادارة العمليات الأنتخابية تتولى اعداد جداول الناخبين وتحديد المراكز الأنتخابية في الأقليم واصدار التعليمات اللأزمة لتسهيل سير الأنتخابات وتسمية رووساء واعضاء المراكز الأنتخابية).
هەروەها ئەم چاكسازييە هەرێمی كوردستانی لە چوار ناوچەی هەڵبژاردن كردووە بە يەک ناوچە (مادده ٤).،
لە جێگای ئەوەی لێپرسراوانی كورد لەم مەيانەدا، يان لە دارشتنی بڕياری دامەزراندنی (كۆمسيۆنی باڵا)، پێ داگرن لەسەر تايبەتمەندی كوردستان و دەسەڵاتی پەرلەمانەكەی و، دژی (رەها)يی و نایاسایی فەرمانی ژمارە (٩٢) كە بە (یاسای ژمارە ٩٢- یاسای دامەزراندنی كۆمسيۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەكانی عێراق)ـە راوەستن، كەچی پەرلەمانی كوردستانيان ناچار كرد كە دەستكاری یاسای ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٩٢ بكات و، بەو شێوەيەی كە گونجاو بێت لەگەڵ ئەو فەرمانە. ئەمەش لە واقعدا پاشەكشە و سابيقەيەكی یاسايی سەرنج راكێشەو، چی ورد بوونەوەو بيركردنەوەيەكی بابەتيی قووڵی پێوە ديار نييە، لەمەڕ كاريگەری و دەرئەنجامەكانی ئەم هەڵوێستە لەسەر ماف و بڕياری خەڵكی كوردستان، بە تايبەتی لەم هەلومەرجە ناسكەدا، كە دەبێت كورد بە هەموو هزرو هوش و هێزو توانايەكيەوە، نەک هەر سوور بێت لەسەر دەستكەوتەكانی، بەڵكو پتەوتر و قووڵتری بكات و گەشەشی پێبدات. لەوەش زياتر زۆر لەو دەستكارييانە نە فەرزە، نە پێويست بوو..
لێردا ديسان ناچارين بە دەقە عەرەبيەكەی یاسای ژمارە (٤٧)ی ساڵی ٢٠٠٤ بچينەوە، كە لە دانيشتنی پەرلەمانی كوردستان ژمارە (٥٤)ی رۆژی ١٠/١١/٢٠٠٤دا دەرچووەو، بزانين (بە داخەوە) چۆن خۆمان فێڵ لە خۆمان دەكەين. (هەر وەكو چۆن لە جێگايەكی ديكەی ئەم رۆژنامەيەدا دەقی ئەم یاسايە لەگەڵ دەقی یاسای ٩٢ بڵاوكراوەتەوە)*.
سەرنجی خوێنەری ئازيز و هۆشمەند رادەكێشم بۆ دوو راستی سەرەكی:
١ـ ئەم یاسايە (یاسای ٤٧) وەكو یاسايەكی (چاكسازی) لەسەر یاسای ژمارە(١)ی ساڵی ١٩٩٢. بريتييە لە (٢١) مادده، جگە لە (يەک) ماددەی

* بڕوانە دەقی یاساكە لە پاشكۆی ژمارە «٩» – ل٣٠٤

کـە ئەویش مـاددە (١٨)یەتی، ئەوانی دیکە هەر هەمـووی تەئکیـدە لەسـەر تایبـەتمەندی و شێـوە و سەربەخۆیی هەیئەتی باڵای هەڵبـژاردنی کـوردسـتـان (مـاددە٢)، هەروەها ناوچەی هەڵبـژاردنی هەرێمی کـوردسـتـان و کـاتەکەی و دروست بوون و دەسەڵاتی ئەم (هەیئەتە)، کە پێویستە بە یاسـایەک لەلایەن پەرلەمانی کوردستانەوە دیاری بکرێت (ماددە٢)، کەچی (تاکو ئێستا یاسای وا لەلایەن پەرلەمـانەوە دەرنەچووە)و، بەرپرسیـارەتی ئەم هەیئـەتە لە ئامـادە کردنی لیستی ناوی دەنگدەران (مـاددە٧)...هتد، ئەمانە هەر هەمووی باشە و، بگرە هەندێکی هەر دەبوایە بکرایە، بەڵام کە دێینە سەر مـاددە (١٨)ی ئەم یاسایە کە (بیت القصید)ـە، وەکـو دەڵێن (ڕێسەکەمان لێ دەبێت بە خوری)و، دەمانهێنێتەوە بۆ سەر سفر. دەقی عەربی ماددە (١٨)ی یاسای ژمارە ٤٧ی سـاڵی ٢٠٠٤: (المادة الثامنة عشرة: تضاف المادة التالية الى الباب السابع للأحكام المتفرقة:
(تحل المفوضيـة العليا المسـتقلة للانتـخابات العراقيـة محل الهيئة العليا لانتـخابات المجلس الوطني لكوردسـتـان العـراق الواردة في هذا القـانون للاشراف على انتخابات الدورة الثانية للمجلس وادارتها).
واتە بەم دوو دێڕەی مـاددە (١٨)، (دامـەزراندن و دەسـەڵات و ئەرک و فـەرمـانی..) ئەو (هەیئـەی باڵا)یەی خۆمـان کە یاسـای ژمـارە (١)ی سـاڵی ١٩٩٢ دەستنیشـانی کردبوو و، لە(تعـديل)ـەکـەشیـدا دووپات کـراوەتەوەو، تەئکیـدش کـراوە کە دەبێت بە یاسـایەکی پەرلەمـانی خۆمـان هەر وەکـو مـاددە (٢)ی ئەم یاسایە تەسبیتی کردووە دامەزرێت، سڕاوەتەوەو ئیلغا کراوەتەوە.
هەر وەکـو ئاگادارین (المفوضية العليا المستقلة للانتخابات العراقية) یاسـای خۆی هەیە، ئەوەی دەیکات و تاکو ئێستا کردویەتی، لەگەڵ ئەو هەمـوو گلە و گازندەیەی کە هەیە، بۆیە حەقمانە بڵێین: **ئەوەی پێش و پاش مـاددە (١٨)ی یاسـای ٤٧ی سـاڵی ٢٠٠٤ هاتووە بە حوکـمی مـاددە (١٨).. فیـلێکە لە خۆمانی دەکەین و، خۆمانی پێ دەخەڵەتێنین** و، ئەگەر بۆ ئەوە نییە، ئەبێت بۆ چی بێت..؟!
دیارە ئەوەی لە پشـتی ئەم پێشنیـارەوە بووە وای تەسـەور کـردووە ئەمـە جۆرە زیری (شطار)ـەتێکە و لەوەش ( شطار)تر، ئەم ماددە (١٨)یەیە، لە (البـاب السابع للأحكام المتفرقة)ی داناوە، هەروەها:

٢ـ پێکەوە گرێدانی هەڵبژاردنی ئایندەی ئەنجوومەنی نیشتمانی کوردستان بە هەڵبژاردنی خولی دووهەمی پەرلەمانی کوردستانەوە، هەر وەکو لە مادده (١٨)ی ناوبراودا تەسبیت کراوە: (تحل المفوضية العليا المستقلة للانتخابات العراقية محل الهيئة العليا لأنتخابات المجلس الوطني لكوردستان العراق الواردة في هذا القانون للأشراف على أنتخابات الدورة الأنتخابية الثانية للمجلس وادارتها)، راست نییە چونکە ئەم هەڵبژاردنە بۆ (قۆناغێکە) کە ماوەی کارکردنی کەمترە لە یەک ساڵ، ( ئەگەر هەڵبژاردن بکرێت) دەبێت پێش (٢٠٠٥/١/٣١) بکرێت و ماوەی ئەم (قۆناغە) تاکو (٢٠٠٥/١٢/٣١)ـە، هەروەها ئەم (پێناسە)یە دژی مادده (٥١)ی یاسای ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٩٢ـە. یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانی عێراق، کە ماوەی خولێکی پەرلەمانی بە (٤) ساڵ تەسبیت کردووە، بڕوانە یاسای (ژمارە«٥»)ی ساڵی ١٩٩٨ یاسای چاکسازیی یەکەمی یاسای ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٩٢، مادده(٣).

**بەش بە حاڵی خۆم پێموایە پێویست نەبوو پەرلەمانی کوردستان ملکەچی بڕیاری (کۆمسیۆنی باڵا) بێت، سەبارەت بە هاوزەمانی هەڵبژاردنی خولی دووەمی خۆی و هەردوو هەڵبژاردنەکەی دیکە، چونکە ئەو دوو هەڵبژاردنە بۆ قۆناغێکی ئینتیقالییەو، ماوەکەشی کەمتر لە یەک ساڵە.**

ئەم جۆرە مامەڵە کردنە لەگەڵ مافە یاساییەکانی خەڵکی کوردستان ناگونجێت لەگەڵ ئەزموونی دیموکراسی کوردستان و دامەزراوە یاساییەکانی، بەڵکو بریتییە لە هەڕاج کردنیان بە بێ هیچ جۆرە پاساوێکی یاسایی و لۆجیکی، بۆیە بە بڕیارو کارێکی حەکیم و ڕەوای نابینم چونکە:

١ـ هەموو ڕۆژێک هەل بۆ کورد نارەخسێت تاکو مافەکانی بە ئیرادەی خۆی ریزبەندو یاسایی بکات و، نوێنەرانی ئاوا کۆ نابنەوەو توێژینەوەو لێکدانەوە و تاوتوێ کردنی یاسایی ئامادە بکەن و بیکەن بە یاساو بڕیارو، حکومەت و دامودەزگا پەیوەندارەکانی ناوەوەو دەرەوەی کوردستان بە نێودەوڵەتییەکانیشەوە دانیان پێدا بنێن و ڕێزیان لێ بگیردرێت.

٢ـ راستە گۆڕین یەک لە خوسڵەتەکانی ژیانە، بەڵام گۆڕین دەبێت هۆ و هۆکاری هەبێت و پێویست بێت. بەڵام چی مادده و بەندێکی یاسای بەڕێوەبردنی

ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی، فەرزی کردووە بە سەر لایەنی کوردی لە بەغدا، کە بە هەڵەداوان بێن و پەرلەمانی کوردستان ناچار بکەن یاسای ژمارە (١)یساڵی ١٩٩٢ بەو شێوەیە دەستکاری بکەن کە کرا، (بە تایبەتی ئەوەی کە پەیوەندی هەیە بەم هەڵبژاردنە)و بە تەحدید مادده (١٨)ـەکەی..؟!

واتە:

* هەرێمی کوردستان لە چوار ناوچەی هەڵبژاردنی سەربەخۆوە، بگۆڕێ بۆ پاشکۆی عێراقێکی یەک ناوەندی هەڵبژاردن..!
* لیژنەی یاسایی سەرپەرشتیاری هەڵبژاردنی پەرلەمانی سەربەخۆی کوردستان ئیلغا بکرێتەوە، کە مافێکی یاسایی و سەلمێندراوە لەلایەن پەرلەمانی هەڵبژێردراوی کوردستان، بدرێت بە کۆمسیۆنی باڵای هەڵبژاردنەکانی عێراقی تەعین کراو، جگە لەوەش دەزانرا ئەم (کۆمسیۆنە) هەڵوێستی باش نییە دەرحەق بە کوردو، خەریکی کۆسپ و تەگەرە نانەوەیە لەسەر رێگای هەڵبژاردنێکی راست و دروست لە ناوچەکانی کوردستان.
* پشتکوێ خستنی مافی سەدەها هەزار هاووڵاتی کوردستانی هەندەران لە دەنگدان بۆ پەرلەمانی کوردستان و پارێزگاکان و تەسلیم بوون بە رای کۆمسیۆنی (باڵا) کە مافی ئەوەی نییە.

بەش بە حاڵی خۆم نازانم تاکو چەند ئەندامانی سەرکردایەتی سیاسی لایەنە سیاسیەکانی کوردستان و بەتایبەتی (پارتی و یەکێتی) و (ئەندامانی پەرلەمانی کوردستان) و (حکومەتی هەرێمی کوردستان بە هەردوو ئیدارەی هەولێر و سلێمانی)..هتد، ئاگادارن لە قۆناغەکانی دارشتنی (فەرمانی ٩٢)، (الأمر: رقم٩٢ القاضي بتأسيس المفوضية العليا المستقلة للانتخابات في العراق) کە لە ٢٠٠٤/٥/٣١ دەرچووەو(ساری المفعول)ـە*، هەروەها (فەرمانی) رقم (٩٦) القاضي بأصدار قانون الانتخابات) ،کە لە ٢٠٠٤/٦/١٥دەرچووەو (ساری المفعول)ـە**، یان (فەرمانی رقم(٩٧) قانون الأحزاب والكيانات السياسية)، کە لە ٢٠٠٤/٦/١٥ دەرچووەو(ساری المفعول)ـە***، (دوور نییە زۆر لەو بەرێزانە هەر لە ئەسڵدا ئاگایان لە یاسای ٩٢ نەبێت)..!

---

* بڕوانە دەقی یاساکە لە پاشکۆی ژمارە «٩» - ل ٣٠٤
** بڕوانە دەقی یاساکە لە پاشکۆی ژمارە «١٠» - ل ٣١٣
*** بڕوانە دەقی یاساکە لە پاشکۆی ژمارە «١١» - ل٣١٧

لەو باوەڕەداین پەرلەمانی کوردستان لە رووی یاساییەوە حەق بوو:
١ـ دەستکاری ئەو ماددەو بەندانەی نەکردایە لە یاسای ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٩٢، کە بووە مایەی لە دەست دانی هەندێ لەدەسەڵاتەکانی و بە تەحدید مادده (١٨)ی ئاماژە پێ کراو، یان لیژنەی باڵای هەڵبژاردنی یاسایی خۆمان ئیلغا بکەینەوەو، هەموو دەسەڵاتەکانی بدرێت بە کۆمسیۆنی باڵا، کە بە پێی یاسایەکی دیکە رەفتار دەکەن، رەفتاری (کۆمسیۆن)یش هەر لە سەرەتاوە دیار بوو چۆنە.
٢ـ گرێدانی رۆژی هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان بە هەمان رۆژی هەڵبژاردنی گشتی عێراقەوە.

دوور نییە رایەک هەبێت بە پێچەوانەی ئەم بۆچوونانەو بە پشت بەستن بە (برگە «أ، ب»)ی مادده (٣)ی یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی.... هتد.
ئەم بڕگەیە مشتومڕی زۆری لەسەرەو، هەر لە هەمان یاسا مادده و بڕگەی تێدایە کە ئەم بڕگەیە قەتیس دەکاو و هەڵیدەپەسێرێ.
لەم یاسایەدا بڕگەو ماددەی زۆر هەن کە دژ بە یەکن، یان تەفسیرات و ئیجتیهاداتی جودا هەڵدەگرن. بۆیە دەکرا لایەنی کوردی بە پێی یاسای پەرلەمانی کوردستان رەفتاری خۆی بکردایە.

**من نازانم چی دەقەوما ئەگەر هاتوو پەرلەمانی کوردستان، لە جیاتی ئەوەی ئەو گۆڕانکاریانە بکات، بهاتایە بڕیاری:**
**١ـ هەڵبژاردنی خولی دووهەمی خۆی بخستایەتە پێش، یان پاش هەڵبژاردنی گشتی عێراق.**
**٢ـ ئەگەر هەموو هاووڵاتیانی کوردستان لە دەرەوەو لە ناوەوەی عێراق بەشداربایەن لەو هەڵبژاردنانەدا.**
**٣ـ ئەگەر هەیئەتی باڵای هەڵبژاردنی کوردستان هەر وەکو یاسای (١)ی ساڵی ١٩٩٢ی هەموارکراو دیاری کردووە، سەرپەرشتیاری هەڵبژاردنەکانی کوردستانی بکردایە.**

**دوور نەبوو (کۆمسیۆنی باڵا)، یان هەر دەزگایەکی دیکەی ناوەندی بەغدا سەبارەت بەو بڕیارە یاساییەی کورد گلەو گازندەی هەبایە.** ئەو کات مافی رەوای خۆیان بوو ئەو گلەو گازندانەیانە بدایە بە لایەنی پەیوندار. لەم بارەیەوە لایەنی پەیوەندار بە پێی (یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی)، (**دادگای باڵای فیدراڵ**)ەو، **هەر ئەویش مافی حەسم کردنی کێشەی وای هەیە. ئەمەش وەکو زۆر مادده و بڕگەی ئەم یاسایە هێشتا نەک هەر دانەمەزراوە، بەڵکو بیریشی لێ نەکراوەتەوە، هەر کاتێکیش دامەزرا با ئەوسا بڕیاری خۆی لەسەر یاسایی بڕیاری پەرلەمانی کوردستان بدایە..!!**

چی دەبوو ئەگەر وامان بکردایە خۆ دونیا خراپ نەدەبوو..؟!
یان ئەوانەی کە لە رووی یاساییەوە وای بۆ دەچن کە دەستکاری کردنی فەرمانی (٩٢)، یان فەرمانی (٩٦، ٩٧)و رێنماییەکانی (کۆمسیۆنی باڵا)، یان ئەوەی (برێمەر) **لە حوکمی موحاڵە**..!

بە دیدی ئێمە ئەو جۆرە بۆچوونە دوور نییە دروست نەبێت **چونکە**:

١ـ هەر بڕیارو یاسایەکی (ئیدارەی مەدەنی ئەمریکی) لە قۆناغی (داگیر کردنی) عێراقدا دەریان کردووە، نابێت ناتەبا بێت لەگەڵ میساقی نەتەوە یەکگرتووەکان و یاساو رێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکاندا، بە تایبەتیش رێککەوتننامەی (جنیڤ)ی ساڵی ١٩٤٩ و پرنسیپەکانی (لاهای)ی ساڵی١٩٠٧.

٢ـ دوای دەرچوونی (یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی)، نابێت هیچ بڕیارو فەرمانێکی (ئیدارەی مەدەنی عێراق) ناتەبا بێت لەگەڵ ئەو یاسایەدا، یان لەگەڵ ماف و دەستکەوتەکانی خەڵکی کوردستاندا.

٣ـ بە پێی بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی، بە تەواو بوونی قۆناغی (داگیر) کردنی عێراق هەموو سەروەری و دەسەڵاتەکان دەگەڕێتەوە بۆ حکومەتی کاتی.

سەرەڕای ئەم بنەمایانە لە قۆناغی داگیرکردنی عێراق، کۆمەڵێک یاساو بڕیار دەرچوون، چ لەلایەن (ئیدارەی مەدەنی) یان (ئەنجومەنی کاتی دەسەڵات)ەوەو، چ

لەلایەن هەردوو لایانەوە، بەڵام جێبەجێ نەکراون، یان هەڵوەشێنراونەتەوە، بۆ نموونە:
١ـ بڕیاری دامەزراندنی دادگای (جنایات)، کە دەسەڵاتی دادوەری عێراق پێی لەسەر هەڵوەشانەوەی داگرت، یاسایەکە، یان بڕیارەکە، هەڵوەشایەوە.
٢ـ بڕیاری، یان یاسای (استئصال)ی حزبی بەعس، هەڵوەشایەوەو، لە سەردەمی حکومەتی د.عەلاوی بوو بە (استزراع) البعث.
٣ـ ڕێککەوتننامەی (٢٠٠٣/١١/١٥)ی نێوان (ئەنجومەنی دەسەڵاتی کاتی عێراق)و (ئیدارەی مەدەنی ئەمریکی)، هەروەها بڕیاری (ئاڵای نوێی عێراق) کە بە هەمان شێوە هەڵوەشێنرانەوە.

هەر لە خودی یاسای (بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی) زنجیرەیەک مادده و بڕگە هەن تاکو ئێستا جێبەجێ نەکراون، هەر بۆ نموونە:
١ـ مادده و بڕگەکانی گۆڕینی قەوارەی نەتەوایەتی خەڵکی کوردستان و، نەهێشتنی ئاسەواری تەعریب و تەبعیس . بە تایبەتی (مادده ٥٨).
٢ـ پیادە کردنی بە فەرمی کردنی زمانی کوردی لە تەک زمانی عەرەبی لە دام و دەزگاکانی ناوەندی بە ناو (فیدراڵ). (مادده ٩).
٣ـ دامەزراندنی (دادگای باڵای فیدراڵ). (مادده (٤٤-أ).
٤ـ پێناسە کردنی حکومەتی ئێستای ئینتیقالی، بە شێوەیەکی فەرمی بە (حکومەتی ئیتحادی). (مادده ٢٤).
٥ـ ئەنجامدانی سەرژمێرییەکی سەرتاسەری عێراق.
٦ـ کێشەی ئاڵاو سروودی نیشتمانی و ئارمی عێراقی فیدراڵی نوێ. (مادده ٨).
٧ـ پرس و را وەرگرتنی حکومەتی هەرێمی کوردستان و پارێزگاکان لە کاتی دانانی بودجەی عێراق. (مادده ٢٥-ج، ه).

## پوختەکەی

١- زۆر لە رەفتارو بڕیارەکانی (کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی عێراق) یاسایی نییەو دەکرا هەر لە کاتی خۆیدا رابگیرێن، چونکە لە بنەڕەتدا ئەو ئەرک و دەسەڵاتە کە بە پێی فەرمانی ژمارە (٩٢)ی ٢٠٠٤/٥/٣١ پێی دراوە، لە سەرەوەی (یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عیراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی)ـە، کە لە ٢٠٠٤/٣/٨ دەرچووە. هەروەها بڕگەی یەکەمی دیباجەی بڕیاری ژمارە(١٥٤٦)ی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی لە ٢٠٠٤/٦/٨و، بڕگەکانی (١، ٢، ٣، ٤-أ)، مەتنی بڕیاری ئەنجومەنی ئاماژە پێ کراو.

٢- رەفتارەکانی ئەم کۆمسیۆنە لە هەندێ لایەوە دوو روویی و لایەنگیری و لاساری پێوە دیارە جگە لەوە بڕیاری وەهاشی هەیە کە (ئینتقائی)یەو، (کۆمسیۆنی باڵا) بۆی نییە رەفتاری وەها بکات، چونکە بەدەر لە دەسەڵاتی ئەودایەو، هەروەها ناگونجێت لەگەڵ خودی ماددەو بڕگەکانی یاسای (٩٢) کە جەخت لەسەر بێ لایەنی ئەم کۆمسیۆنە دەکات.

٣- کۆمسیۆنی باڵا راست ناکات کە دەڵێن دەرفەت نییە بۆ (تأجیل) کردنی هەڵبژاردنەکان. دەکریت تأجیل بکرێت و بڕیاردان لەم کێشەیە لەدەسەڵاتی (ئەنجومەنی نیشتمانی کاتی عێراق)ـە بە پێی بڕگە «أ» لە ماددە (٣)ی یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی، ئەمەش دەقەکەیەتی:

"ماددەی ٣-أ: ئەم یاسایە بە یاسای باڵای وڵات دەژمێردرێ و بە بێ جیاوازی لەسەرانسەری عێراقدا مولزیمە، نابێ ئەم یاسایە بە بێ رەزامەندی زۆرینەی سێ لەسەر چواری ئەندامانی جەمعیەی نیشتمانی و کۆدەنگی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی هەموار بکرێ، هەروەها نابێت ئەم یاسایە هەموارێکی ئەو تۆ بکرێ، کە هەر مافێک لەو مافانەی گەلی عێراق کەم بکاتەوە، کە لە بەشی دووەمی ئەم یاسایەداهاتووە، یان ماوەی قۆناغی ئینتقالی درێژ بکاتەوە تا دوای ئەو ماوانەی لەم یاسایەدا ئاماژەیان پێکراوە، یان پرۆسەی هەڵبژاردنی جمعیەی نوێ دوابخات یان (دەسەڵاتی هەرێمەکان و پارێزگاکان کەم بکاتەوە یا کار لە ئیسلام و ئایین و تایفەکانی دیکەو سروشەکانیان بکات)".

دەقە عەرەبییەکەی:
"المادة ٣- أ: ان هذا القانون يعد القانون الاعلى للبلاد ويكون ملزما في انحاء العراق كافة، وبدون استثناء. ولايجوز تعديل هذا القانون إلا بأكثرية ثلاثة ارباع أعضاء الجمعية الوطنية، وإجماع مجلس الرئاسة، كما لايجوز إجراء أي تعديل علية من شأنة أن تنقص بأي شكل من الأشكال من حقوق الشعب العراقي المذكورة في الباب الثاني او أن يمدد أمد المرحلة الإنتقالية الى ما بعد المدد المذكورة في هذا القانون، أو يؤخر اجراء الانتخابات لجمعية جديدة أو يقلل من سلطات الاقاليم والمحافظات أو ما من شأنة ان يؤثر على الاسلام او غيرة من الاديان والطوائف وشعائرها."

٤ـ مافی پەرلەمانی کوردستان بوو، بڕیاری هەڵبژاردنی خولی دووەمی خۆی بدات و، چۆنیەتی سەرپەرشتی کردنی بە پێی یاسای ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٩٢ی هەموارکراو، یان بە پێی ئەو چاکسازییە کە هاتووەتە سەر ئەم یاسایە بە ناوی یاسای (٤٧)ی ساڵی ٢٠٠٤، بەدەر لە ماددە (١٨)ی..!
٥ـ مافی ڕەوای پەرلەمانی کوردستانە بڕیاری بەشداربوونی گشت هاووڵاتیانی کوردستان بدات لە هەڵبژاردنی خولی دووەمی پەرلەمان لە هەرکوێیەک بن، چی لە کوردستان و چی لە دەرەوەی وڵات.
٦ـ هەر لەسەرەتای بەدەرکەوتنی دیاردەی تاکڕەوی ولایەنگیری و، دیدی ناپاکی ئەم کۆمسیۆنە دەرحەق بە کورد، پێویست بوو لەسەر نوێنەرانی کورد لە ناوەندی بەغداو، لە ئاستێکی بەرزو لە کاتی خۆیدا کێشەکانیان چارە سەر بکردایەت و، لەحاڵەتی لاساری، کێشەکان حەواڵەی ڕاگەیاند و ڕای گشتی و، دواتر پەرلەمانی کوردستان بکردایەت. بەڵام: هەر وەکو باسمان کرد کات درەنگەو زۆر چووەو کەم ماوە.!

٧ـ لەم هەل و مەرجەدا، جێبەجێ کردنی ماددە(٥٨)ی یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی، لەو ماوەیە کە ماوە بۆ هەڵبژاردنەکانی عێراق، کە دەبێت لە پێش کۆتایی مانگی ١ی/٢٠٠٥ ئەنجام بدرێت، لەحوکمی موحاڵە لەبەر کۆمەڵێک هۆو هۆکار لەوانە:

١- سوور بوونی سەرۆک کۆماری ئەمریکاو ئیدارەکەی و هەروەها (تۆنی بلێر)ی سەرۆک وەزیرانی بەریتانیاو، هەندێ لە هێزە سیاسییەکانی عێراق و بەتایبەتی لایەنە شیعەکانی لە دوانەخستنی هەڵبژاردنەکان.

٢- بارودۆخی سیاسی و ئیداری و ئەمنی ناوچە بەعەرەبکراوەکان و بە تایبەتی کەرکوک.

٣- ئەو هەموو کەلێنەی کە لە خودی یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی بەدی دەکرێت، وەکو کۆسپ و تەگەرە، لە ڕێی جێبەجێ کردنی مادده پەیوەندارەکان بە کوردو گۆڕینی قەوارەی نەتەوایەتی و، بەتایبەتی مادده ٥٨ی...

٤- هەڵوێستی حکومەتی ناوەندی بەغداو کۆمسیۆنی باڵاو ئۆفیسی کەرکوکیان و ڕۆڵی تەماشاکەر و بگرە سلبیی هێزو ئیدارەی هاوپەیمانان لە کەرکوک بەتایبەتی..

سەرکردایەتی سیاسی کورد لە دوو ڕیانێکدایە یان:

یەکەم: دەبێت داخیلی هەر سێ هەڵبژاردنەکە بێت بەو پلان و نەخشەیە کە هەیە ئەویش:

* دەنگدانی (عەرەبی تەعریب) وەکو هەیە لە کەرکوک و ناوچە تەعریبکراوەکانی دیکە: مەندەلی، خانەقین، کفری، دووز، مەخموور، شێخان، تەلەعفەر، زمار، سنجار...هتد، دەبێتە سابیقەیەکی یاسایی و سیاسی و نەتەوایەتی... وەکو دیارە تاکو ئێستا قەبوولی موحاڵە..

* قەتیس (حصر) کردنی دەنگدان لەلایەن (کۆمسیۆنی باڵا) بۆ پەرلەمانی کوردستان تەنها بە هاووڵاتیانی (هەرێمی کوردستان- بەو شێوەیە کە یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی تەحدیدی کردووە)، هەروەها مەنع کردنی کوردستانییەکانی هەندەران لە دەنگدان بۆ پەرلەمانی کوردستان و پارێزگاکانیان هەر یەک بە پێی عائیدیەتی. ئەمەش دژی (یاسای بەڕێوەبردنی عێراق)ـەو، هەروەها دژی یاسای ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٩٢ی هەموارکراوە (یاسای هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان)ـە... قەبوولی ناحەقیبەکی وەها گەورە بێ پاساوە...

دووهەم : یان سوور بوون لە سەر ئەوەی:
١- دەنگی دەنگدەرانی قەزاکانی (چەمچەماڵ، دووز، کفری، کەلار) بخرێتە سەر پارێزگای کەرکوک و (مەخموور) لەسەر هەولێر...هتد، هەر وەکو جەختی لەسەر دەکرێت.
٢- هەموو دەنگدەرە کوردستانییەکانی پارێزگای کەرکوک لە هەر کوێ بن دەنگەکانیان لەسەر پارێزگای کەرکوک بژمێردرێت.
٣ـ هەموو دەنگدەرە تەعریبچییەکانی کوردستان، دەنگەکانیان لەسەر ئەو پارێزگانە بژمێردرێت کە کاتی خۆی لێی هاتوون بەوانەشیان کە لە کەرکوک و ناوچە بەعەرەبکراوەکان لە دایکبوونە.
٤ـ هەر لە ئێستاوە بە بڕیارێکی ئەنجومەنی (نیشتمانی کاتی) عێراق خشتەیەکی زەمەنی (فەرمی) تەسبیت بکرێت، بۆ گەڕانەوەی تەعریبچییەکان بۆ دەرەوەی (کوردستانی عێراق)، واتە خشتەیەکی زەمەنی بۆ جێبەجێ کردنی مادده (٥٨)ی یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی، بەمەرجێک ماوەی ئەنجام دانی کۆتایی، پێش دارشتنی دەستووری هەمیشەیی عێراق بێت*.

ئەگەر ئەوەی سەرەوە ئەنجام نەدرێت، کوردستانییەکان ناچارن (مقاطعە)ی هەڵبژاردنەکان بکەن لە کەرکوک، یان بە گشتی، وەکو تاکو ئێستا باسی لێوە دەکەن.
کورد (٨٤) ساڵ پێش ئێستا (مقاطعە)و ( رەفزی) دەنگدانی کرد، کاتێک داگیرکەری بەریتانی و هاوپەیمانانی بێ گوێ گرتن و بایەخ دان بە ماف ویست و خواستی خەڵکی کوردستان لەرێگای ریفراندۆمی ساڵی ١٩٢١ی عێراق، ویستیان ئەمیر (فیصل بن الحسین)ێک بە مەلیکی عێراق دانێن، چونکە بەو گرێدانەی کوردستانی عێراق (ولایەتی مووسڵ) بە عێراقی عەرەبی (ولایەتی بەغداو ولایەتی بەسرە)، روخساری راستەقینەی سیاسەتی داگیرکەری ئینگلیز و هاوپەیمانانی لەمەڕ رێککەوتننامەی (سیڤەر)ی ئابی/ ١٩٢٠و، بەڵێنیان سەبارەت

* بۆ جێبەجێ کردنی هەندێ لەم چوار خاڵە پێویستی بە چاکسازی لە (یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی ئینتیقالی)هەیە، ئەمەیش دەکرێت ئەگەر هاتوو کورد جەختی لەسەر بکات!

بەدامەزراندنی(کیان)ی کوردستان، بۆ خەڵکی کوردستان دەرکەوت، ئەوە بوو (سیڤەر) بە (لۆزان) گۆڕایەوەو، ساڵی ١٩٢٥ کوردستانی عێراقیان (ولایەتی مووسڵ) خستە سەر عێراقی عەرەبی و، ئەم عێراقەیانە، وەکو دەوڵەتیکی بەزۆر لکێندراو دروست کردو، لە پەراوێزیشیداو، بۆ چەواشەکردنی خەڵکی کوردستان، چەند مافێکی رۆشنبیریان.. بۆ کورد دەستنیشان کردو، دواتر ئەوشیان قایل نەبینی و پشتگوێ خران...
لە ماوەی ئەو (٨٤)ساڵە، ئەو ( مقاطعە) و( رفض)ی ساڵی (١٩٢١)ی کوردان، یەک لە هۆکارە سەرەکی و گرنگەکانی ململانێی یاسایی و سیاسی و دپلوماسی کوردە دەرحەق بەو کیانە کە پێی دەڵێن عێراق.
ئەو ئەزموونەو گشت بەسەرهاتەکانی خەڵکی کوردستان، بە قڕکردن و جینۆسایدو تەعریب و گۆڕینی قەوارەی نەتەوایەتی و، هەڵوێستی ئەمریکاو هاوپەیمانانی و، ئەو ئامرازانەی کە دایەزراندووە لە پاش (رزگاری)و (داگیرکردنی) عێراق، (خیارات)ی کوردی تەحدید کردووە. بەڵگەنەویستیشە دواخستنی جێبەجێ کردنی ماف و داخوازییەکانی خەڵکی کوردستان لەم سەردەمە، سەردەمی دامەزراندنەوەی عێراق و، دارشتنەوەی سەر لەنوێ، لە قازانجی کوردان نییە...
هێشتا کات ماوەو، زەرەر لە نیوەش بگەڕێتەوە هەر باشە...!

٢٠٠٤/١٢/٢٧

## پاشكۆی ژماره «١»

# قرار مجلس الامن رقم ٦٦٨

### الذي اتخذه مجلس الأمن الدولي في جلسته ٢٩٨٢ المنعقدة في ٥ نيسان ١٩٩١

ان مجلس الأمن الدولي إدراكا منه لواجباته ومسؤولياته وفقا لميثاق الأمم المتحدة الداعي الى الحفاظ على السلام والأمن العالميين ورجوعا إالى الفقرة السابعة من البند الثاني ومن منطق قلقه البالغ بشأن قمع المدنيين العراقيين في كثير من اجزاء العراق بما في ذلك ما حدث مؤخرا في المناطق التي يقطنها الأكراد وأدى إلى تدفق اللاجئين الهائل الى الحدود الدولية وعبر الجيوب الحدودية مما يهدد الأمن والسلام الدوليين في المنطقة وانطلاقا من اهتمامه العميق بحجم المعاناة الإنسانية وانتباها الى الرسائل التي بعث بها مندوبا تركيا و فرنسا في الأمم المتحدة بتاريخ ٢و ٤ من ابريل - نيسان عام ١٩٩١ والتفاتا أيضا الى رسائل ممثل جمهورية ايران الإسلامية الدائم في الأمم المتحدة بتاريخ الثالث و الرابع من ابريل- نيسان ايضا لعام ١٩٩١ وتأكيدا بالتزام كافة الدول الأعضاء بالحفاظ على سلامة سيادة الحدود والاستقلال السياسي للعراق وكافة الدول في المنطقة وواضعا في الحسبان تقرير الأمين العام للأمم المتحدة الصادر بتاريخ الثاني من مارس - آذار عام ١٩٩١، انطلاقا من كل ما سبق يعلن مجلس الامن مايلي:

اولا: شجب عملية قمع المدنيين العراقيين في كثير من أجزاء العراق بما في ذلك ما جرى مؤخرا في المناطق التي يقطنها الأكراد الذي يهدد عواقب السلام والأمن الدوليين في المنطقة.

ثانيا: مطالبة العراق كمساهمة منه في إزالة الخطر الذي يهدد السلام والأمن في المنطقة بإنهاء القمع فورا وإعراب المجلس عن أمله في نفس هذا السياق في أن يجري حوارا مفتوحا لضمان واحترام الحقوق الانسانية والسياسية لكافة المواطنين العراقيين.

ثالثا: الإصرار على أن يسمح العراق على الفور للمنظمات الإنسانة العالمية بالوصول الى كل الذين يحتاجون الى العون في كافة اجزاء العراق وعلى أن يوفر لهذه المنظمات جميع المنشآت الضرورية لتنفيذ تعليماتها.

رابعا: مطالبة الأمين العام للأمم المتحدة بمواصلة جهوده الإنسانية في العراق واخطار المجلس بها إذا كانت ملائمة كقاعدة لمزيد من الجهود في المنطقة وعن محنة المدنيين العراقيين وعلى الأخص الشعب الكردي الذي يعاني من القمع في كل أشكاله على يد السلطات العراقية.

خامسا: مطالبة الأمين العام باستخدام كافة المصادر المتاحة له بما في ذلك مصادر الوكالات التابعة للأمم المتحدة لسد حاجة اللاجئين والمشردين العراقيين العامة بأسرع ما يمكن.

سادسا: مناشدة كافة الدول الأعضاء وجميع المنظمات الأنسانية المساهمة في جهود الإغاثةالإنسانية.

سابعا: مطالبة العراق بالتعاون مع الأمين العام للأمم المتحدة لتنفيذ المذكور اعلاه.

ثامنا: يقرر المجلس بان يظل مهتما ومعنيا بهذا الموضوع.

* صدر هذا القرار باغلبية ١٠ اصوات مقابل ثلاثة (زمبابوي، كوبا واليمن) وامتناع الصين والهند عن التصويت.

---

سەرچاوە: لە تۆری ئەنتەرنێت وەرگیراوە

# قرار مجلس الامن رقم ١٥١١

## نص قرار مجلس الامن رقم ١٥١١، بتاريخ ١٦/ ١٠/٢٠٠٣

ان مجلس الامن، اذ يعيد تأكيد قراراته السابقة بشأن العراق، بما فيها القرار ١٤٨٣ (٢٠٠٣) المؤرخ ٢٢ ايار (مايو) ٢٠٠٣ والقرار ١٥٠٠ (٢٠٠٣) المؤرخ ١٤ اب (اغسطس) ٢٠٠٣. وبشأن الاخطار التي تهدد السلام والامن بسبب الاعمال الارهابية، بما فيها القرار ١٣٧٣ (٢٠٠١) المؤرخ ٢٨ ايلول (سبتمبر) ٢٠٠١ وغيرها من القرارات ذات الصلة.

واذ يشدد على ان سيادة العراق تكمن في دولة العراق، واذ يعيد تأكيد حق الشعب العراقي في ان يقرر بحرية مستقبله السياسي وان يتحكم في ثرواته الطبيعية، واذ يؤكد من جديد عزمه على ضرورة التعجيل بحلول اليوم الذي يتولى فيه العراقيون ادارة شؤونهم بانفسهم، واذ يسلم بأهمية الدعم الدولي، لا سيما من بلدان المنطقة جيران العراق والمنظمات الاقليمية، من اجل السير قدما بهذه العملية بسرعة.

وادراكا منه لكون الدعم الدولي لاستعادة اوضاع الاستقرار والامن امرا اساسيا لرفاه الشعب العراقي وكذلك لقدرة جميع الاطراف المعنية على اداء عملها باسم شعب العراق، واذ يرحب بمساهمات الدول الاعضاء في هذا الاطار بموجب القرار ١٤٨٣ (٢٠٠٣)، واذ يرحب بقرار مجلس الحكم في العراق تشكيل لجنة دستورية تحضيرية من اجل الاعداد لعقد مؤتمر دستوري يقوم بوضع دستور يجسد طموحات الشعب العراقي. واذ يحثه على اتمام هذه العملية بسرعة.

واذ يؤكد ان التفجيرات الارهابية التي طالت سفارة الاردن في ٧ اغسطس (اب) ٢٠٠٣، ومقر الامم المتحدة في بغداد في ١٩ (اب) ٢٠٠٣، ومسجد الامام علي في النجف في ٢٩ اغسطس ٢٠٠٣، هي اعتداءات على شعب العراق، والامم

المتحدة والمجتمع الدولي، واذ يشجب اغتيال الدكتورة عقيلة الهاشمي، التي توفيت في ٢٥ ايلول ٢٠٠٣، ويعتبره اعتداء موجها ضد مستقبل العراق.
واذ يبرز، في هذا السياق، ويعيد تأكيد البيان الذي ادلى به رئيسه في ٢٠ اغسطس ٢٠٠٣ (prst/s/٢٠٠٣/١٣) والقرار ١٥٠٢ (٢٠٠٣) المؤرخ ٢٦ اغسطس ٢٠٠٣.
واذ يقرر ان الحالة في العراق، رغم تحسنها، ما زالت تشكل خطرا على السلام والامن الدوليين.

واذ يتصرف في اطار الفصل السابع من ميثاق الامم المتحدة.

١ - يعيد تأكيد سيادة العراق وسلامة اراضيه، ويشدد في هذا الصدد على الطابع المؤقت لاضطلاع سلطة التحالف المؤقتة (السلطة) بالمسؤوليات والسلطات والالتزامات المحددة بموجب القانون الدولي المنطبق المعترف بها والمنصوص عليها في القرار ١٤٨٣ (٢٠٠٣)، والتي ستتوقف حين قيام شعب العراق بتشكيل حكومة ممثلة للشعب معترف بها دوليا تؤدي اليمين وتتولى المسؤوليات المنوطة بالسلطة، وذلك باساليب منها اتخاذ الخطوات المشار اليها في الفقرات من ٤ الى ٧ و١٠ ادناه.
٢ - يرحب برد الفعل الايجابي للمجتمع الدولي، في محافل من قبيل جامعة الدول العربية، ومنظمة المؤتمر الاسلامي، والجمعية العامة للامم المتحدة، ومنظمة الامم المتحدة للتربية والعلوم والثقافة، حيال تشكيل مجلس الحكم الممثل للشعب على نطاق واسع كخطوة هامة نحو اقامة حكومة ممثلة للشعب معترف بها دوليا.
٣ - يؤيد الجهود التي يبذلها مجلس الحكم من اجل حشد قدرات الشعب العراقي بطرق منها تعيين مجلس للوزراء ولجنة دستورية تحضيرية تتولى قيادة العملية التي ستمكن شعب العراق من ان يتولى تدريجيا ادارة شؤونه بنفسه.
٤ - يقرر ان مجلس الحكم ووزراءه هم الاجهزة الرئيسية للادارة المؤقتة العراقية في تجسيد، دون المساس بتطورها، سيادة دولة العراق خلال الفترة الانتقالية الى ان يتم تشكيل حكومة ممثلة للشعب معترف بها دوليا تتولى مسؤوليات السلطة.

٥ - يؤكد ان ادارة شؤون العراق ستتم تدريجيا على يد الاجهزة التي تنشئها الادارة المؤقتة العراقية.

٦ - يدعو السلطة، في هذا السياق، الى ان تعيد مسؤوليات وسلطات الحكم الى شعب العراق، باسرع ما يمكن، ويطلب الى السلطة ان تقدم الى المجلس، بالتعاون مع مجلس الحكم والامين العام، حسب الاقتضاء تقريرا عن التقدم المحرز.

٧ - يدعو مجلس الحكم الى ان يقدم الى مجلس الامن للنظر، في موعد اقصاه ١٥ كانون الاول (ديسمبر) ٢٠٠٣، وبالتعاون مع السلطة، ومع الممثل الخاص للامين العام للامم المتحدة اذا سمحت الظروف، جدولا زمنيا وبرنامجا لصياغة دستور جديد للعراق، ولاجراء انتخابات ديمقراطية في ظل ذلك الدستور.

٨ - يقرر ان الامم المتحدة، التي تتصرف عن طريق الامين العام وممثله الخاص وبعثة الامم المتحدة للمساعدة في العراق، ينبغي ان تعزز دورها الحيوي في العراق بامور منها تقديم الاغاثة الانسانية، وتعزيز الاعمار الاقتصادي للعراق وتهيئة الظروف اللازمة لتنميته المستدامة، ودعم جهود اعادة وانشاء المؤسسات الوطنية والمحلية للحكومة الممثلة للشعب.

٩ - يطلب ان يقوم الامين العام، حسبما تسمح الظروف، بمواصلة مسار العمل المبين في الفقرتين ٩٨ و٩٩ من تقرير الامين العام المؤرخ ١٧ تموز (يوليو) ٢٠٠٣ (S/٢٠٠٣/٧١٥).

١٠ - يحيط علما باعتزام مجلس الحكم عقد مؤتمر دستوري، واقرارا منه بأن عقد المؤتمر سيشكل معلما في الانتقال الى الممارسة الكاملة للسيادة يطلب الى الممثل الخاص للامين العام ان يقدم، عند عقد المؤتمر، او حسبما تسمح الظروف، الخبرة الفريدة المتوفرة لدى الامم المتحدة الى الشعب العراقي في عملية الانتقال السياسي هذه بما في ذلك اعداد عمليات انتخابية.

١١ - يطلب الى الامين العام كفالة ان تكون موارد الامم المتحدة والمنظمات المرتبطة بها للمساعدة ان طلب مجلس الحكم العراقي ذلك وحسبما تسمح

الظروف متاحة لدعم البرنامج المقدم من مجلس الحكم بموجب الفقرة ٧ اعلاه، ويشجع المنظمات الاخرى ذات الخبرة في هذا المجال على تقديم الدعم الى مجلس الحكم العراقي، ان طلب منها ذلك.

١٢ ـ يطلب الى الامين العام ان يقدم الى مجلس الامن تقريراً عن مسؤولياته بموجب هذا القرار وعن وضع وتنفيذ جدول زمني وبرنامج بموجب الفقرة ٧ اعلاه.

١٣ ـ يقرر ان توفير الامن والاستقرار امر اساسي لاتمام العملية السياسية بنجاح حسبما ورد في الفقرة ٧ اعلاه، وتمكين الامم المتحدة من المساهمة بفعالية في ذلك لعملية وتنفيذ القرار ١٤٨٣ .(٢٠٠٣) ويأذن بتشكيل قوة متعددة الجنسيات تكون تحت قيادة موحدة لاتخاذ جميع التدابير اللازمة من اجل الاسهام في صون الامن والاستقرار في العراق، بما في ذلك لتأمين الظروف الضرورية لتنفيذ الجدول الزمني والبرنامج، فضلا عن الاسهام في كفالة امن بعثة الامم المتحدة لتقديم المساعدة في العراق، ومجلس الحكم في العراق والمؤسسات الاخرى التابعة للادارة المؤقتة العراقية، والخدمات الانسانية والاقتصادية الاساسية.

١٤ ـ يحث الدول الاعضاء على المبادرة، بموجب ولاية الامم المتحدة هذه، الى تقديم مساعداتها للقوة المتعددة الجنسيات المشار اليها في الفقرة ١٣ اعلاه، بما في ذلك توفير قوات عسكرية.

١٥ ـ يقرر ان يستعرض المجلس احتياجات ومهام القوة المتعددة الجنسيات المشار اليها في الفقرة ١٣ اعلاه في غضون فترة اقصاها سنة واحدة من تاريخ صدور هذا القرار، بحيث تنتهي ولاية القوة على اي حال لدى اتمام العملية السياسية على النحو المبين في الفقرات ٤ الى ٧ و١٠ اعلاه، ويعرب عن استعداده للنظر، في هذه المناسبة، في مدى ضرورة مواصلة بقاء القوة المتعددة الجنسيات مع مراعاة آراء حكومة العراق الممثلة للشعب والمعترف بها دوليا.

١٦ ـ يؤكد على اهمية انشاء قوة شرطة وقوات امن عراقية فعالة للحفاظ على القانون والنظام والامن ومحاربة الارهاب، وفقا للفقرة ٤ من القرار ١٤٨٣

(٢٠٠٣)، ويهيب بالدول الاعضاء والمنظمات الدولية والاقليمية ان تساهم في تدريب الشرطة وقوات الامن العراقية وتزويدها بالمعدات. ١٧ - يعرب عن عميق تعاطفه وخالص تعازيه للشعب العراقي وللامم المتحدة لما تكبداه من خسائر في الارواح، ولأسر موظفي الامم المتحدة وغيرهم من الضحايا الابرياء الذين قتلوا او اصيبوا في هذه الهجمات المفجعة.

١٨ - يدين ادانة قاطعة التفجيرات الارهابية التي طالت سفارة الاردن في ٧ اغسطس ٢٠٠٣ ومقر الامم المتحدة في بغداد في ١٩ اغسطس ٢٠٠٣، ومسجد الامام علي في النجف في ٢٩ اغسطس ٢٠٠٣ واغتيال الدكتورة عقيلة الهاشمي التي توفيت في ٢٥ ايلول (سبتمبر) ٢٠٠٣، ويشدد على وجوب تقديم المسؤولين عن تلك التفجيرات الى العدالة.

١٩ - يدعو الدول الاعضاء الى منع عبور الارهابيين الى العراق، ومنعهم من الحصول على الاسلحة والتمويل الذي من شأنه ان يدعم الارهابيين، ويؤكد اهمية تعزيز تعاون بلدان المنطقة ولا سيما جيران العراق، في هذا الصدد.

٢٠ - يناشد الدول الاعضاء والمؤسسات المالية الدولية ان تعزز ما تبذله من جهود لمساعدة الشعب العراقي على التعمير وتنمية اقتصاده، ويحث تلك المؤسسات على اتخاذ خطوات فورية من اجل تقديم مختلف انواع القروض وغيرها من المساعدات المالية الى العراق، على ان تعمل في ذلك مع مجلس الحكم، والوزارات العراقية المختصة.

٢١ - يحث الدول الاعضاء والمنظمات الدولية والاقليمية على دعم مجهود اعمار العراق، الذي بدأ خلال المشاورات الفنية التي عقدتها الامم المتحدة يوم ٢٤ حزيران (يونيو) ٢٠٠٣، وذلك بطرق منها الاعلان عن تقديم تبرعات ضخمة في المؤتمر الدولي للمانحين المقرر عقده في مدريد يومي ٢٣ و٢٤ اكتوبر (تشرين الاول) ٢٠٠٣.

٢٢ - يدعو الدول الاعضاء والمنظمات المعنية الى المساعدة في تلبية احتياجات الشعب العراقي عن طريق توفير الموارد اللازمة لاصلاح واعادة تأهيل البنية التحتية لاقتصاد العراق.

٢٣ ـ يؤكد ضرورة القيام، على سبيل الاولوية، بتشكيل المجلس الدولي للمشورة والمراقبة، المشار اليه في الفقرة ١٢ من القرار ١٤٨٣ (٢٠٠٣)، ويعيد تأكيد وجوب استخدام صندوق تنمية العراق بطريقة شفافة على النحو المنصوص عليه في الفقرة ١٤ من القرار ١٤٨٣ (٢٠٠٣).

٢٤ ـ يذكر جميع الدول الاعضاء بالتزاماتها المقررة بموجب الفقرتين ١٩ و٢٣ من القرار ١٤٨٣ (٢٠٠٣)، ولا سيما الالتزام بالعمل فورا على نقل الاموال وغيرها من الاصول والموارد الاقتصادية في صندوق تنمية العراق من اجل مصلحة الشعب العراقي.

٢٥ ـ يطلب الى الولايات المتحدة ان تقوم نيابة عن القوة المتعددة الجنسيات على النحو المبين في الفقرة ١٣ اعلاه، بتقديم تقرير الى مجلس الامن عن جهود هذه القوة وما تحرزه من تقدم، حسب الاقتضاء، وذلك كل ستة اشهر على الاقل.

٢٦ ـ يقرر ان يبقي هذه المسألة قيد النظر.

سەرچاوە: لە تۆری ئەنتەرنێت وەرگیراوە

## پاشكۆی ژماره «٣»

# قرار مجلس الامن رقم ٩٨٦

### الذي اتخذه مجلس الأمن في جلسته ٣٥١٩ المعقودة في ١٤ نيسان/ابريل ١٩٩٥

إن مجلس الأمن،

إذ يشير الى قراراته السابقة ذات الصلة،

وإذ يساوره القلق إزاء الحالة التغذوية والصحية الخطيرة للسكان العراقيين، وإزاء خطر زيادة تدهور هذه الحالة،

واقتناعا منه بضرورة توفير الاحتياجات الإنسانية للشعب العراقي، كإجراء مؤقت، الى ان يفي العراق بقرارات مجلس الأمن ذات الصلة، بما في ذلك على وجه الخصوص القرار ٦٨٧ (١٩٩١) المؤرخ ٣ نيسان/ابريل١٩٩١، بما يسمح للمجلس بإتخاذ إجراءات اخرى فيما يتعلق بأوجه الحظر المشار إليها في القرار ٦٦١ (١٩٩٠) المؤرخ ٦آب/أغسطس ١٩٩٠، وذلك وفقا لأحكام تلك القرارات،

واقتناعا منه أيضا بضرورة توزيع المعونة الغوثية الإنسانية بشكل منصف على جميع قطاعات السكان العراقيين في جميع أنحاء البلد،

وإذ يؤكد من جديد التزام جميع الدول الأعضاء بسيادة العراق وسلامته الاقليمية،

وإذ يتصرف بموجب الفصل السابع من ميثاق الأمم المتحدة.

١- يأذن للدول، بصرف النظر عن أحكام الفقرات ٣(أ) و ٣(ب) و٤ من القرار ٦٦١ (١٩٩٠) والقرارات اللاحقة ذات الصلة، بأن تسمح باستيراد النفط والمنتجات النفطية التي يكون منشؤها العراق، بما في ذلك المعاملات المالية وغيرها من المعاملات الأساسية المتصلة مباشرة بذلك، بما يكفي لتوفير عائد

بمبلغ لايتجاوز مجموعه بليونا واحدا من دولارات الولايات المتحدة كل ٩٠ يوما، وذلك للأغراض المبينة في هذا القرار ورهنا بالشروط التالية:

أ. موافقة اللجنة المنشأة بموجب القرار ٦٦١ (١٩٩٠)، لضمان شفافية كل صفقة واتفاقها مع الأحكام الاخرى لهذا القرار، وذلك بعد قيام الدولة المعنية بتقديم طلب تؤيده حكومة العراق، لكل عملية يعتزم إجراؤها لشراء النفط والمنتجات النفطية من العراق، بما في ذلك تفاصيل سعر الشراء بالقيمة المعقولة التي يحددها السوق، ووجهة التصدير، وفتح خطاب اعتماد يسدد إلى حساب الضمان الذي سينشئه الأمين العام لأغراض هذا القرار، وكذلك تفاصيل أي معاملة مالية أو معاملة أساسية اخرى تتصل اتصالا مباشرا بذلك؛

ب. قيام الجهةالمشترية في الدولة المعنية بسداد المبلغ الكامل لكل صفقة لشراء النفط والمنتجات النفطية من العراق مباشرة إلى حساب الضمان الذي سينشئه الأمين العام لأغراض هذا القرار؛

٢- يأذن لتركيا، بصرف النظر عن أحكام الفقرات ٣(أ) و٣(ب) و ٤ من القرار ٦٦١ (١٩٩٠) ولأحكام الفقرة ١ من أعلاه، بأن تسمح باستيراد النفط والمنتجات النفطية التي يكون منشؤها العراق، بما يكفي، بعد خصم النسبة المئوية المشار إليها في الفقرة ٨(ج) أدناه لصالح صندوق التعويضات، للوفاء برسوم التعريفة الجمركية لخط الأنابيب، على النحو الذي يقرر المفتشون المستقلون المشار إليهم في الفقرة ٦ ادناه، بعد التدفيق، أنه معقول، وذلك لنقل النفط والمنتجات النفطية العراقية عبر خط أنابيب كركوك-يومورتاليك في تركيا على النحو المأذون به في الفقرة ١ أعلاه؛

٣- يقرر ان يبدأ نفاذ الفقرتين ١و٢ من هذا القرار في الساعة ٠١/٠٠ بتوقيت الساحل الشرقي للولايات المتحدة من اليوم الذي يلي قيام رئيس المجلس بإبلاغ أعضاء المجلس بأنه تلقى من الأمين العام التقرير المطلوب إليه تقديمه في الفقرة ١٣ ادناه، وأن تظلا نافذتين لفترة أولية مدتها ١٨٠ يوما، ما لم يتخذ المجلس تدابير اخري ذات صلة فيما يتعلق بأحكام القرار ٦٦١ (١٩٩٠)؛

موظفي الأمم المتحدة بشأن احتياجات الأمم المتحدة الأمنية وإننا نعتقد أن دعم الجهود الأمنية التي تبذلها الأمم المتحدة يتطلب قوة بحجم لواء. وستكون هذه القوة تحت قيادة ومراقبة قائد القوة المتعددة الجنسيات وستشمل مهامها الأمن الموقعي والمحيطي في مرافق الأمم المتحدة، ومهام مرافقة القوافل التي يتطلبها سفر أفراد بعثات الأمم المتحدة.

ولكي تواصل القوة المتعددة الجنسيات الإسهام في توفير الأمن ينبغي لها أن تظل تعمل في إطار يعطيها وأفرادها المركز الذي يمكّنها من الوفاء بمهمتها، وتكون فيه الدول المساهمة مسؤولة عن ممارسة الولاية على الأفراد التابعين لها، ويكفل الترتيبات لتوفير الإمكانيات واستخدام القوة المتعددة الجنسيات لها. والإطار القائم حاليا الذي يحكم هذه المسائل يكفي لهذه الأغراض. كما أن القوات التي تتألف منها القوة المتعددة الجنسيات ملتزمة كذلك في جميع الاوقات بالتصرف وفقا لالتزاماتها بموجب قانون المنازعات المسلحة، بما في ذكل اتفاقيات جنيف.

والقوة المتعددة الجنسيات مستعدة لمواصلة جهودها الحالية للمساعدة على توفير بيئة تسمح للمجتمع الدولي بأكمله بالقيام بدوره الهام في تيسير تعمير العراق. وإننا إذ نفي بهذه المسؤوليات في الفترة القادمة، فإننا نتصرف في ظل الاعتراف الكامل بسيادة العراق واحترامها. وإننا نتطلع إلى رؤية بقية الدول والمنظمات الدولية والإقليمية تساعد شعب العراق والحكومة العراقية ذات السيادة للتغلب على التحديات التي ستواجههما في بناء بلد ديمقراطي وآمن ومزدهر.

ويعتزم المشتركون في تقديم مشروع القرار إرفاق هذه الرسالة بنص القرار المتعلق بالعراق والذي يجري النظر فيه حاليا. وأرجوكم، في انتظار ذلك، ان تقدموا نسخا من هذه الرسالة إلى أعضاء المجلس في أقرب وقت ممكن.

**توقيع**
**كولن ل. باول**

---

سەرچاوە: لە تۆری ئەنتەرنێت وەرگیراوە

## پاشکۆی ژمارە «١٩»

# پرۆژەی دەستوری هەرێمی کوردستانی عێراق

## دەروازەی یەکەم
## حوکمە گشتییەکان

**ماددەی یەکەم:**

هەرێمی کوردستان هەرێمێکە لە هەرێمەکانی کۆماری فیدرالیی عێراق و پێڕۆ سیاسیەکەی پێڕۆیەکی کۆماریی پەرلەمانی و دیموکراتی دەبێت.

**ماددەی دووەم:**

هەرێمی کوردستان لە پارێزگای دهۆک ـ بەسنووره ئیداریەکەی ئێستایەوەـ و پارێزگای کەرکوک و سلێمانی و هەولێرو قەزاکانی ئاکرێ و شێخان و شنگال و تەلەعفرو تلکێف و ناحیەکانی زەممارو بەعشیقەو ئەسکی کەلەک ـ لە پارێزگای نەینەواوـ هەردوو قەزای خانەقین و مەندەلی ـ لە پارێزگای دیالەوـ قەزای بەدرەو ناحیەی جەصان ـ لە پارێزگای واسط، بە سنووره ئیداریەکانی بەر لە ساڵی(١٩٦٨)یانەوەو، ناوچەکانی تریش کە زۆرینەی دانیشتووانی کوردن پێک هاتووە.

**ماددەی سێیەم:**

گەل چاوگەی دەسەڵاتەکان و بنیچەی شەرعییەتەکانێتی.

**ماددەی چوارەم:**

گەلی هەرێمی کوردستان لە کوردو کۆمەڵە نەتەوەییەکانی(تورکمان وئاسوری و کلدان و ئەرمەنی و عارەب)پێک دێت و ئەم دەستورە مافەکانیان لە چوارچێوەی یەکێتیی هەرێمی کوردستاندا ئیقرار دەکات.

**ماددەی پێنجەم:**

شاری کەرکوک پایتەختی هەرێمی کوردستانەو دەشێتیش ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستانی عێراق، کە پێویست بکات غەیری ئەو شارە بە شێوەیەکی رەفتەنی (مؤقت)بکاتە پایتەخت.

**ماددەی شەشەم:**

هەرێمی کوردستان ئاڵای تایبەت بەخۆی هەیە شان بەشان ئاڵای کۆماری فیدراڵیی عێراق و، دروشم وسرودو جەژنی نەتەوەیی نەورۆز(٢١ی ئادار)ی خۆیشی هەیە، ئەوەش بە یاسا رێک دەخرێت.

**ماددەی حەوتەم:**

هەرێمی کوردستان هێزگەلی چەکداری بەرگریکاری خۆی هەیە.

**ماددەی هەشتەم:**

١ـ زمانی کوردی زمانی رەسمیی هەرێمی کوردستانە.

٢ـ موراسەلاتی رەسمیی لەگەڵ دەسەڵاتەکانی فیدراڵی و هەرێمەکانی دیکەدا بەهەر دوو زمانی عەرەبی و کوردی دەبێ.

٣ـ زمانی تورکمانی شان بەشانی زمانی کوردی بۆ تورکمانەکان بەزمانی رۆشنبیری وفێرکاری لە قەڵەم دەدرێ و، زمانی سریانیش شان بەشانی زمانی کوردی بۆ ئەوانەی بە سریانی دەدوێن بەزمانی رۆشنبیری و فێرکاری لە قەڵەم دەدرێ و، زمانی عەرەبییش شان بەشانی زمانی کوردی بۆ عەرەبەکان بەزمانی رۆشنبیری وفێرکاری لە قەڵەم دەدرێت.

## دەروازەی دووەم
## ماف وئەرکە بنیچەییەکان

**ماددەی نۆیەم:**

١ـ هاووڵاتیان، بەبێ جیاوازیی جنس یان رەگەز یان رەنگ یان زمان یان مەنشەئی کۆمەڵایەتی یان ئاین یان مەزەب یان حاڵەتی کۆمەڵایەتیان بەرامبەر بە یاسا لە مافەکان و ئەرکەکانی سەرشانیاندا یەکسانن.

٢ـ ئافرەت یەکسانیی تەواوی لەگەڵ پیاودا هەیە.

٣ـ خێزان شیرازە(بنیچە)ی کۆمەڵگەیەو، لە چوارچێوەی یاساشدا پاراستنی دایکایەتی و منداڵێتیش دەستەبەرەو، دەسەڵاتەکان و کۆمەڵگەش پابەندن بە چاودێری کردنی هەرزەو لاوان و پاراستنی دروشمە بەرزەکانی نەریت و نیشتمانپەروەریی رەسەن و کلتووری مێژوویینی گەلی کوردستان.

٤ـ مەبدەئی هەلی چونیەک بۆ هەموو هاووڵاتیان دەستەبەرە.

**ماددەی دەیەم:**

١ـ سزا شەخصیەو، بەپێی دەقی یاسایش نەبێ نە جەریمە هەیەو نە سزا.
سزاش لەسەر رەفتارێک نەبێ کە یاسا لەکاتی تێوەگلانیدا بە جەریمەی دانابێ، ناسەپێنرێ و، لەو سزایەش زیاتر کە لەکاتی تێوەگلانی جەریمەکەدا بەرکار خراوە سزایەکی گرانتر ناسەپێنرێت.
٢ـ تاوانبار بێ تاوانە (پاکە) تا ئیدانەکردنی ساغ دەکرێتەوە.

**ماددەی یازدە:**

١ـ مافی خۆپارێزی (الدفاع) لە هەموو قۆناغەکانی لێ پێچانەوەو دادگاییدا بەپێی حوکمەکانی یاسا مافێکی پیرۆزە.
٢ـ دانیشتنەکانی دادگاکان لە رووە (ئاشکرایە)، مەگەر دادگا بەپێی حوکمەکانی یاسا بڕیاری نهێنی بوونیان بدات.

**ماددەی دوازدە:**

١ـ خانەو ئەو جێگایەش کە حوکمی خانە دەیگرێتەوە حورمەتی خۆی هەیەو، لەو بارودۆخەو بەو شێوازانەش نەبێ کە دەقی یاسایان لەسەرە، ناشێ کەس حورمەتی پێشێل بکا یان بچێتەناوی یان بیپشکنێ یان موراقەبەی بکات.
٢ـ بەپێی یاسا نەبێ ناشێ هیچ کەسێ یان کەلوپەلی هیچ کەسێ بپشکنرێت.
٣ـ حورمەتی مرۆڤ پارێزراوەو، قەدەغەشە هیچ جۆرە سزادانێکی جەستەیی یان سزادانی دەروونیی دەرهەق بکرێت.
٤ـ بە بڕیاری لایەنێکی دادوەریی تایبەت نەبێ کە بەپێی یاسا دەرهێنرابێ، ناشێ هیچ مرۆڤێ دەستبەسەر بکرێ یان بگیرێ یان حەپس بکرێ یان سجن بکرێ.

**ماددەی سیازدە:**

نهێنی هاودەنگیی بەریدی (ئاسایی و ئەلیکترۆنی و بروسکەو تەلەفۆنی) دەستەبەرەو، بۆ زەروورەتی عەدالەت و ئاسایشی هەرێم و بە بڕیاری لایەنێکی دادوەریی تایبەت و لە سنووری ئیقرارکراوی یاساییشدا نەبێ، ناشێ ئاشکرا بکرێن.

**ماددەی چواردە:**

مـافی مـوڵکایەتی دەســتـەبەرەو، بەپێی یاسـایش نەبێ، ناشێ دەست بەسـەر مـوڵک ومـاڵی گـواسـتـەنی و ناگـواسـتـەنیدا بگیرێ و، لە پێناوی بەرژەوەندی گشـتی و بەپێی یاسـاو بە قـەرەبوکـردنەوەی عـادیلانەش نەبێ، مـوڵکایەتیی تایبەت لەکەس داناماڵرێ.

**ماددەی پازدە:**

ناشێ هاووڵاتیـانی هەرێمی کوردسـتـان لەسـەفەر بۆ دەرەوەی کۆمـاری فیـدراڵیی عـێراق یان لە گـەڕانەوەی قـەدەغـە بکرێت و، لەو حاڵەتانەشدا نەبێ کـە دەقی یاسـایان لەسـەر هاتبێ، ناشێ، هاتن و چوونیـان لێ ببەسـترێ یان جـێگای دانیشتنیان لە سنوور بدرێت.

**ماددەی شازدە:**

ئازادیی ڕاو دەربڕینی هزرو، پەخش و چاپەمـەنی و ڕۆژنامـەگـەری و مـافی کۆبوونەوەو خۆپیشاندان و مانگرتنی ئاشتیانەو دامەزراندنی حزب و کۆمەڵەو سەندیکاکان دەستەبەرن و بەپێی یاسا ڕێک دەخرێن.

**ماددەی حەڤدە:**

ئازادیی ئاین و بڕواو داب ودەسـتـوری ئاینی دەسـتـەبەرە بە مـەرجێ لەگـەڵ حوکمەکانی دەستوری کۆماری فیدراڵیی عێراق و ئەم دەستورەو پێڕۆی گشتی و ئادابی گشتیدا پێچەوانە نەبن.

**ماددەی هەژدە:**

پەنابەری سیاسی ناشێ تەسلیم بکرێتەوە.

**ماددەی نۆزدە:**

١- فـێرکـردنی سـەرەتایی لە هەرێمی کـوردسـتـاندا ئیلزامـیـەو، بە یاسا ڕێک دەخرێت.

٢- دەسـەڵاتەکـانی هەرێمی کـوردسـتـان بۆین دەبن(تلتـزم)بە لەناو بردنی بێ سەوایی(الأمیـه)و، مـافی بەخـۆڕایی فـێربوون لە قـۆناغـەکانی سـەرەتایی وناوەندی ودواناوەندی وزانکۆییدا دەستەبەر دەکەن و فێرکاریی پیشەیی و هونەری(تەکنیکی)بەرەو چاکتر دەبەن.

**ماددەی بیستەم:**

ئازادیی لێکۆڵینەوەی زانستی لە چوارچێوەی یاسادا دەستەبەرەو، پێویستیشە دەست بالآیی و ئیبداع وئیپتیکارو نیشانەکانی هەڵکەوتن لە بوارگەلی زانستی و هزری ورۆشنبیری و هونەریدا دنە بدرێن و پاداشت بکرێن و چاودێری بکرێن.

**ماددەی بیست ویەک:**

١ـ کارکردن مافی هەموو هاووڵاتییەکەو پێویستیشە لەسەری. لەهەر کوێیەکیش بیەوێ کاری خۆی دەکات و، دەسەڵاتەکانی هەرێمیش هەوڵ دەدەن کار بۆ هەموو هاووڵاتیەک کە توانای بەسەریدا بشکێ فەراهەم بکەن.

٢ـ دەسەڵاتەکان باشترکردنی شەرت و شروت و هەلومەرجی کار دەستەبەر دەکەن و بۆ بەرزکردنەوەی سەویەی ژیواری و شارەزایی و رۆشنبیریی کرێکاران کۆشش دەکەن و، زەمانەتی کۆمەڵایەتییان بۆ حاڵەتی نەخۆشی و زەبوونی و بێ کاری وپیری بۆ فەراهەم دەکەن.

٣ـ بۆ حاڵەتی دوورخستنەوەی زیانێکی گشتیی ناکاو نەبێ، ئیشێکی دیارکراو بەزۆرو بەبێ قەرەبوو بەهیچ کەسێ ناکرێ.

**ماددەی بیست ودوو:**

١ـ دەسەڵاتەکان پابەنددەبن کە لە رێگای سەرومڕ بەرفراوانکردن و فەراهەم کردنی خزمەتی پزیشکی و تەندروستیەوە، تەندروستیی گشتی بپارێزن.

٢ـ دەسەڵاتەکان پابەنددەبن خاک وئاو (بیئە) بپارێزن و باشتری لێ بکەن و بەرەو چاکتر بیگۆڕن.

**ماددەی بیست وسێ:**

باج دان ئەرکێکی پێویستە لەسەر هەموو هاووڵاتیەک و، بە یاساش نەبێ باج نە دەسەپێنرێ و نە وەردەگیرێ و نە هەموار دەکرێت.

**ماددەی بیست وچوار:**

پێشکەش کردنی شکات و بەرزکردنەوەی سکالانامە بۆ دام و دەزگا دەسەڵاتدارەکان مافێکی دەستەبەرە بۆ هاووڵاتی و، دەسەڵاتەکانیش پێویستە لە ماوەیەکی دیارکراوی ماقووڵدا یەکلای بکەنەوە.

**ماددەی بیست وپێنج:**

لە هەرێمی کوردستاندا مەرجەعی پاراستنی ئەو مافانەی لەم دەروازەیەدا هاتوون دادوەریەو، دادگاش کاتێ کەم وزۆریی بەرپرسێتیی لایەنی گشتی یان بەرپرسێتیی یەکەوڕاستی شەخصی یان بەرپرسێتیی هەردووکیان دیاردەکات، ئەوجا پێویستە لەسەری حوکمی سزا یان قەرەبوو یان هەردوو حوکمەکە بەسەریدا بسەپێنێ.

## دەروازەی سێیەم
## دەسەڵاتەکانی هەرێمی کوردستان

### بەشی یەکەم ـ دەسەڵاتی یاساکاری
### ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێمی کوردستان

**ماددەی بیست وشەش:**

ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێمی کوردستان خاوەن دەسەڵاتی یاساکارییە لە هەرێمەکەداو، لە نوێنەرانی گەل پێک دێت و، بە دەنگدانی گشتیی ئازادو نهێنی و راستەوخۆ ئەندامەکانی هەڵدەبژێردرێن.

**ماددەی بیست وحەوت:**

١ـ شێوازی هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێمی کوردستان و چۆنێتیی هەڵبژاردن و دیارکردنی وادەو رێژەی نواندن و شەرت وشروتی هەڵبژێرو هی ئەندامیش، هەمووی بەپێی یاسا دیاردەکرێت.
٢ـ لە پێکهێنانی ئەنجومەندا نواندنی عادیلانە بۆ کۆمەڵە نەتەوەییەکانی هەرێمی کوردستان رەچاو دەگیرێ.

**ماددەی بیست وهەشت:**

١ـ خولی هەڵبژاردنی ئەنجومەن چوار ساڵەو، لە رۆژی کۆبوونەوەی یەکەمیەوە دەست پێ دەکات.
٢ـ ئەنجومەن لەسەر داوای سەرۆکی هەرێم، لە ماوەی پازدە رۆژدا ـ کە لە رۆژی بڵاوکردنەوەی ئەنجامە کۆتاییەکانی هەڵبژاردنەکەوە دەست پێ دەکات ـ

کۆدەبێتەوەو، لە حاڵەتێکیشدا داوای کۆبوونەوەی لێ نەکرا، ئەوە لەو بارەدا، خۆی لە خۆیەوە لە یەکەم رۆژی دوای ئەو ماوەیەدا کۆدەبێتەوە.

**ماددەی بیست ونۆ:**

ئەنجومەن یەکەم دانیشتنی خۆی بەسەرۆکایەتی بە تەمەنگەورەترینی ئەندامەکانی سازدەداو، بە دەنگدانی نهێنی سەرۆک و جێگری سەرۆک و ئەمینداری نهێنی هەڵدەبژێرێت.

**ماددەی سی:**

ئەندامی ئەنجومەن، بەرلە دەست پێ کردنی ئیش وکارەکانی، ئەم سوێندەی خوارەوە دەخوات:

**«بە یەزدانی مەزن سوێند دەخۆم کە بەرژەوەندو یەکێتی و حورمەتی گەلی کوردستان وماف و ئازادییەکانی رۆڵەکانی بپارێزم و، بەراستی و بە دڵسۆزی ئەرکی سەرشانی ئەندامێتیی خۆم بەجێ بگەیێنم».**

**ماددەی سی و یەک:**

١ـ نیصابی یاسایی لە ئەنجومەندا بە ئامادەبوونی زۆرینەی ئەندامەکانی دێتەجێ و، بڕیارەکانیشی بەزۆرینەی رەهای ئامادەبووان دەردەهێنرێ ئەگەر دەقی یاسا بەپێچەوانەی ئەوە نەبێت.

٢ـ بە دە ئەندامی ئەنجومەن دەتوانن پرۆژەی یاسایەک یان بڕیارێک پێشنیاز بکەن.

**ماددەی سی و دوو:**

دەرماڵەو پاداشتەکانی سەرۆک و ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانی بە یاسا دیار دەکرێن.

**ماددەی سی و سێ:**

تەفسیلاتی رەوشی کارو چۆنێتی سازدانی دانیشتنی ئاسایی و نائاسایی و بارودۆخی کۆتایی هاتنی ئەندامێتی و چۆنێتی پڕکردنەوەی کورسییە چۆڵەکان لە ئەنجومەندا بە یاسا دیاردەکرێن.

**ماددەی سی و چوار:**

ئەنجومەن ئەم ئیش وکارە تایبەتانە دەکات:

١ـ هەمواركردنی دەستووری هەرێم بە زۆرینەی دوو لە سێی ژمارەی ئەندامەکانی، بەبێ ئەوەی دەسکاریی ئەو ماف و ئەرکە ئەساسییانە بکات کە دەقەکانیان لەم دەستوورەدا هاتووە.
٢ـ یاساکاری و هەمواركردن و ئیلغا کردنی یاساکان.
٣ـ متمانەدان بە وەزارەت و ئەندامەکانی و لە متمانەخستنیان.
٤ـ ئیقرار کردنی بوجەی گشتیی هەرێمی کوردستان یان موناقەلە کردن لە نێوان بابەکانیداو، تەسدیقکردنی هەر خەرجێ کە لە بوجەکەدا باس نەکرابێ.
٥ـ دانان و هەموارکردن و ئیلغا کردنی باج و رەسمەکان.
٦ـ تەسدیقکردنی ئەو رێککەوتنامانەی کە دەسەڵاتی تەنفیزی لە بوارەکانی ئابووری و فراژوکاری (التنمیة) و رۆشنبیری و فێرکاری و مرۆڤایەتی و کاروباری ئیداری و ئاسایشی سنوورو کاروباری دراوسێتیدا، لەگەڵ هەرێمەکانی دیکەی کۆماری فیدرالیی عێراق و لایەنە بیانییەکان و هەرێمگەلی دەوڵەتە فیدرالییەکاندا دەیانبەستێ.
٧ـ یەکلاکردنەوەی دروستیی ئەندامێتی لە ئەنجومەندا.
٨ـ دەرهێنانی بڕیارگەلی پێویست بۆ پڕکردنەوەی کورسییە چۆڵەکانی ئەنجومەن، بەپێی یاسا.
٩ـ ریقابەکردنی ئیش وکارەکانی دەسەڵاتی تەنفیزی هەرێمی کوردستان و بەرپرسیاردانی (مسـاءلة) سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و جێگرەکانی و وەزیرەکان.
١٠ـ دانانی پێڕۆی ناوخۆو دیارکردنی میلاک و خەملی بوجەی ئەنجومەن و دامەزراندنی فرمانبەرەکانی و دیارکردنی موچەکانیان.
١١ـ پێکهێنانی لیژنەگەلی لێ پێچینەوە بۆ مەسەلەگەلێ کە خۆی بە پێویستی بزانێ.

**ماددەی سی و پێنج:**

١ـ ئەندام قایە (**حصانة**) ی پەرلەمانیی هەیە و، لە چوار چێوەی سنوورەکانی پێڕۆی ناوخۆی ئەنجومەنیشدا ئازادیی قسەکردنی هەیە.
٢ـ ناشێ هیچ لایەنێک لە کاتی خولی کۆبوونەوەدا، بەبێ ئیزنی ئەنجومەن لێ پێچینەوە دەرهەق بە ئەندام بکات یان بیگرێ یان ئازادیی لێ ببەستێ یان

موراقەبەی بکا یان بیپشکنێت، تەنیا لەو حاڵەتەدا نەبێ کە بەسەر جینایەتێکی بە چاو دیتراوەوە گیرابێ.

٣ـ ناشێ ئەندام لە دەرەوەی کاتەکانی کۆبوونەوەی خولەکانی ئەنجومەندا، بەبێ ئیزنی سەرۆکی ئەنجومەن مولاحەقە بکرێ یان بگیرێ، تەنیا لەو حاڵەتەدا نەبێ کە بەسەر جینایەتێکی بەچاودیتراوەوە گیرابێ، لەم بارەشدا هەر کە ئەنجومەن کۆبووەوە دەستبەجێ لەو ئیجرائاتەی کە دەرهەق بەو ئەندامە کراوە ئاگادار دەکرێت.

**ماددەی سی و شەش:**

١ـ ئەنجومەن بۆی هەیە، بەزۆرینەی دوو لەسێی ئەندامەکانی، خۆی هەڵبووەشێنێتەوە.

٢ـ ئەنجومەن، لەم حاڵەتانەی خوارەوە دا بە مەرسومی سەرۆکی هەرێم هەڵدەوەشێتەوە:

أـ ئەگەر لەنیوە زیاتری ژمارەی ئەندامەکانی دەست لەکار هەڵبگرن.

ب ـ ئەگەر نیصابی یاسایی بۆ دانیشتنی نەیەتەجێ لەماوەی چل و پێنج ڕۆژدا کە لە ڕۆژی بانگهێشت بۆ دانیشتنەکەیەوە دەست پێ دەکات.

ج ـ ئەگەر ئەنجومەن سێ جاری دوا بەدوای یەک متمانەی بە ئەنجومەنی وەزیران نەدا.

د ـ ئەگەر پێڕۆی هەڵبژاردنی ئەنجومەن گۆڕدرابێت و، ماوەی خولی هەڵبژاردنیشی، شەش مانگ یان کەمتری مابێت.

**ماددەی سی و حەوت:**

لەحاڵەتی هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەن یان لە حاڵەتی کۆتاییهاتنی خولی هەڵبژاردنیدا، ئەوە، لەو بارەدا پێویستە لەماوەی ئەوپەڕی دوو مانگدا هەڵبژاردنێکی گشتیی نوێ بۆ هەڵبژاردنی ئەنجومەنێکی نوێ ئەنجام بدرێ.

**ماددەی سی و هەشت:**

ئەگەر خولی هەڵبژاردنی ئەنجومەن کۆتایی هات و، نەکرا، هەڵبژاردنی نوێ بەهۆی ڕوودانی جەنگ یان کارەساتی سروشتییەوە ئەنجام بدرێت، ئەوە، لەوبارەدا ئەنجومەن لەسەر ئیش و کاری خۆی بەردەوام دەبێت تا کاتی هەڵبژاردنی ئەنجومەنێکی نوێ و سازدانی دانیشتنی یەکەمی.

## بەشی دووەم
## دەسەڵاتی تەنفیزی

### مەبحەسی یەکەم
### سەرۆکی هەرێمی کوردستان

**ماددەی سی و نۆ:**

هەرێم سەرۆکێکی هەیە بە (سەرۆکی هەرێمی کوردستان) ناودەبرێ کە سەرۆکی باڵای دەسەڵاتی تەنفیزییەو، سەرەک کۆماری فیدراڵیی عێراق دەنوێنێ و، جێگری ئەویشە لە بۆنەگەلی نیشتمانی و نەتەوەییدا و تەنسیقی نێوان دەسەڵاتەکانی یەکێتی و دەسەڵاتەکانی هەرێمیش لەئەستۆ دەگرێ.

**ماددەی چل:**

سەرۆکی هەرێمی کوردستان بە هەمان شێوازی هەڵبژاردنی سەرەک کۆماری فیدراڵیی عێراق هەڵدەبژێردرێت، ئەوەش بەیاسا رێک دەخرێت.

**ماددەی چل و یەک:**

شێوازی هەڵبژاردن و شەرت و شروتی خۆپاڵاوتن و چۆنێتی تاوانبار کردن و دادگایی کردن و حاڵەتەکانی کۆتایی هاتنی(ولایە)ی سەرۆکی هەرێمی کوردستان بە پێی یاسایەکی تایبەت دیار دەکرێن.

**ماددەی چل و دوو:**

سەرۆکی هەرێم بەر لەوەی دەست بە ئەرکەکانی بکات، ئەم سوێندە دەستوورییەی خوارەوە لە بەردەم ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێمی کوردستاندا دەخوات:

**«بە یەزدانی مەزن سوێند دەخۆم کە ماف و دەسکەوت و یەکێتی و بەرژەوەندەکانی گەلی کوردستان بپارێزم و رێزو پابەندیم بۆ هەردوو دەستووری کۆماری فیدراڵیی عیراق و دەستووری هەرێمی کوردستان هەبێ و ئیش و کارەکانم بە دروستی و بە دڵسۆزی ئەنجام بدەم»**

**ماددەی چل و سێ:**

ماوەی (ولایە)ی سەرۆکی هەرێمی کوردستان چوار ساڵە و، دەشێ بۆ یەک جاری دیکەش هەڵبژێردرێتەوە.

**ماددەی چل و چوار:**

سەرۆکی هەرێمی کوردستان ئەم ئیش وکارانە دەکات:

١ ـ دەرهێنانی ئەو یاسانەی کە ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێم دایاندەنێ.

٢ ـ دەرهێنانی (مرسوم)بۆ دەست پێ کردنی هەڵبژاردنە گشتییەکانی ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێم.

٣ ـ دەرهێنانی(مرسوم)ی بانگهێشتی ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێم بۆ خولی یەکەمی کۆبوونەوە.

٤ ـ دەرهێنانی(مرسوم)ی پێکهێنانی ئەنجومەنی وەزیران دوای وەرگرتنی متمانە لە ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێمدا.

٥ ـ بانگهێشتی ئەنجومەنی وەزیران دەکات بۆ کۆبوونەوەی نائاسایی هەر کاتێ بەزەروور بزانرێت و، کۆبوونەوەکەش تەنیا بۆ ئەو بابەتانە دەبێت کە بانگهێشتەکەی لەسەرکراوە، ئەگەر خۆیشی ئامادەبێ ئەوە لەو بارەدا خۆی سەرۆکایەتی کۆبوونەوەکە دەکات.

٦ ـ بەراوێژی سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێم و ئەنجومەنی وەزیران، بریارگەلێ دەردەهێنێ هێزی یاسایان هەیە، ئەوەش لە کاتێکدا دەبێ کە هەرێمی کوردستان و پیرۆ سیاسیەکەی یان ئاسایشی گشتیی یان دام و دەزگادەستورییەکانی لە ناکاوێ بکەونەبەر مەترسیگەلێ هەرەشە لە بوونی(کەیانی)بکەن و، ئەنجومەنی نیشتمانییش نەپەرژابێ کۆببێتەوە، بەمەرجێ ئەو بریارانە پاشان بخرێنە بەردەم یەکەم کۆبوونەوەی ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێم. خۆ ئەگەرهات و نەخرانە بەردەمی، یان خرانەبەردەمی و ئیقراری نەکرد، ئەوە لەو بارەدا خەسڵەتی یاساییان نامێنێ.

٧ ـ جاڕدانی باری ناکاو(حالة الطوارىء)بەپێی یاسایەکی تایبەت.

٨ ـ ئەو ئیش وکارانەی کە سەرەک کۆماری فیدرالیی عێراق پێی دەسپێرێ.

٩ ـ بزواندنی هێزە چەکدارەکان و هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆی هەرێم بەپێکهاتن لەگەڵ ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێم.

١٠ ـ هێنانی هێزی چەکداری یەکێتییەکە بۆ ناو هەرێم لەکاتی پێویستدا، ئەویش بە رەزامەندیی ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێم.

١١ ـ سەرپەرشتی و ئاڕاستەکردنی دام و دەزگا ئاسایشیەکانی فیدراڵی کە بە شێوەیەکی رەفتەنی(مۆقت)یان بەردەوام لە هەرێمدا لە کاردا دەبن.
١٢ ـ دەرهێنانی (مرسوم)ی دەست لەکار هەڵگرتنی ئەنجومەنی وەزیران یان وەزیر، کاتێ کە لەمتمانە دەخرێن.
١٣ ـ دەرهێنانی(مرسوم)ی قبوڵکردنی دەست لەکار هەڵگرتنی ئەنجومەنی وەزیران یان وەزیر کاتێ کە خۆیان داوایان کردبێ، داواشیان لێ دەکا لە کاروفرمانی خۆیاندا بەردەوام بن تا پێکهێنانی وەزارەتی نوێ.
١٤ ـ لێبوردنی تایبەت لە حوکمدراوەکان.
١٥ ـ تەسدیقکردنی حوکمگەلی لەناوبردن (الاعدام)یان سووککردنی بۆ سجنی هەتا هەتایی (المؤبد).
١٦ ـ دامەزراندن و عەزل کردن و فەصل کردن و خانەنشین کردنی خاوەن دەرەجە تایبەتەکان و دادوەرو سەرۆکی ئیددیعای گشتیی هەرێم و موددەعیە گشتییەکان و جێگرەکانیان و سەرۆکانی یەکە ئیدارییەکان بەپێی یاسا.
١٧ ـ پێدانی روتبەی سەربازی بە ئەفسەرانی هێزە چەکدارەکان و هێزەکانی ئاسایشی هەرێم، هەروەها دەرکردن وخانەنشین کردنیان بەپێی یاسا.
١٨ ـ پێدانی نیشان و مەدالیا(الاوسمەوالانواط)کە بەپێی یاسا دیاردەکرێن.
١٩ ـ دامەزراندن و عەزل کردنی نوێنەرانی هەرێم لە ئەنجومەنی هەرێمەکاندا، لەسەر پێشنیازی ئەنجومەنی وەزیران و تەسدیقکردنی لەلایەن ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێمی کوردستانەوە.

**ماددەی چل و پێنج:**

مووچەو دەرماڵەکانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان بەیاسا دیاردەکرێن.

**ماددەی چل و شەش:**

سەرۆکایەتیی هەرێم دیوانێکی دەبێت، ئەرک و پێکهاتەکانیشی بەیاسا دیاردەکرێن.

**ماددەی چل و حەوت:**

١ ـ ئەگەر سەرۆکی هەرێمی کوردستان دەست لەکار هەڵبگرێ یان بمرێ یان تووشی زەبوونییەکی سەرومڕ ببێ، ئەوە لەوبارەدا بەهەمان شێوەی هەڵبژاردن جێ نشینێک جێگای دەگرێتەوە.

٢ ـ کاتی چۆڵبوونی مەنسەبی سەرۆکی هەرێمی کوردستان، ئەوە لەوبارەدا سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێمی کوردستان ئیش وکارەکانی هەڵدەسوورێنێ تا هەڵبژاردنی سەرۆکێکی نوێ.

٣ ـ کاتی دیارنەبوونی سەرۆکی هەرێمی کوردستان یان کاتی مۆڵەتی، ئەوە لەوبارەدا سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێم بەوەکالەت ئیش وکارەکانی هەڵدەسوورێنێ.

## مەبحەسی دووەم
## ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان

**ماددەی چل و هەشت:**

ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان، دەستەی تەنفیزی و ئیداریی باڵایە لە هەرێمداو ، ئیش وکارەکانی دەسەڵاتی تەنفیزی، لە ژێر سەرپەشتی و ئاڕاستەکاریی سەرۆکی هەرێمی کوردستاندا هەڵدەسوورێنێ.

**ماددەی چل و نۆ:**

١ ـ ئەنجومەنی وەزیران لە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و جێگرکانی و ژمارەیەک لە وەزیران پێک دێت، بەمەرجێ ژمارەیان لە(١٥)وەزیر کەمتر نەبێت.

٢ ـ سەرۆکی هەرێمی کوردستان، پێکهێنانی وەزارەت بەو ئەندامی ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێمە دەسپێرێ کە لەلایەن فراکسیۆنی زۆرینەی پەرلەمانەوە دەپاڵێورێت.

٣ ـ ئەویش، کە سەرۆکایەتیی وەزارەتی پێ سپێردراوە، جێگرەکانی و وەزیرەکانی لە نێوان ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێم یان لە غەیری ئەوان کە شەرتوشرووتی ئەندامێتیی ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێمیان تێدا فەراهەمە دەست نیشان دەکات.

٤ـ سەرەک وەزیران لیستی ناوی ئەندامانی وەزارەتەکەی پێشکەش دەکات بە سەرۆکی هەرێم بۆ تەسدیقکردنی.
٥ ـ دوای تەسدیقکردن لەلایەن سەرۆکی هەرێمەوە، ئنجا سەرەک وەزیران ئەنجومەنی وەزارەتەکەی پێشکەش دەکات بە ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێم و داوای متمانە پێدانی دەکات و، پاشان دوای وەرگرتنی متمانە ئیدی(مرسوم)ی پێکهێنانی دەردەهێنێ.
٦ ـ سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران سەرۆکایەتیی دانیشتنەکانی ئەنجومەن دەکات، تەنیا ئەو دانیشتنانەی نەبێ کە سەرۆکی هەرێمی تێدا ئامادەدەبێت.

**ماددەی پەنجا:**

لە پێکهێنانی ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێمی کوردستاندا نواندنی کۆمەڵە نەتەوەییەکان رەچاودەگیرێ.

**ماددەی پەنجا ویەک:**

وەزیرەکان لەو کاروبارانەدا کە پێوەندیدارن بە ئەنجومەنی وەزیرانەوە، بەهاوکاری لە بەردەمی ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێمدا بەرپر سن و،هەر وەزیرەش، بەتەنیا، لەکاروباری وەزارەتەکەی خۆی بەرپرسە.

**ماددەی پەنجاو دوو:**

ئەنجومەنی وەزیران ئەم ئیش وکارانە هەڵدەسوورێنێ:
١ ـ بەرکارخستنی یاساو پێرۆو بریارگەل و پاراستنی ئاسایشی هەرێم و موڵک ومالّی گشتی.
٢ ـ رەنگرشتنی سیاسەتی گشتیی هەرێم بە هاوکۆمەکی لەگەڵ سەرۆکی هەرێمی کوردستاندا.
٣ ـ ئامادەکردنی پرۆژەگەلی پلانەکانی فراژوکاری (**التنمية**)ودابینکردنی پێداویستەکان بۆ بەرکارخستنیان.
٤ ـ ئامادەکردنی پرۆژەی بوجەی گشتیی هەرێم.
٥ ـ سەرپەرشتیی ئیش وکاری وەزارەتەکان و دام و دەزگاو مەرفەقەگشتییەکانی هەرێمی کودرستان و ئاراستەکردن و بەدواداچوون

وموراقەبەکردنیان، هەروەها تەنسیقکردنی چالاکی لەنێوانیاندا. بۆیشی هەیە بڕیارەکانیشیان ئیلغا یان هەمواربکات.
٦ ـ دەرهێنانی بڕیارگەلی تەنفیزی و ئیداری بەپێی یاساو پێڕۆکان.
٧ ـ ئامادەکردنی پرۆژەی یاساگەل و دەرهێنانی پێڕۆکان.
٨ ـ دامەزراندن و دیارکردنی مووچەو تەرفیع و فەصل و عەزل و خانەنیشین کردنی فرمانبەران بەپێی یاسا.

**ماددەی پەنجاو سێ:**

وەزیر یەکەم بەرپرسی راستەوخۆیە لە هەموو کاروبارێ پێوەندیی بە وەزارەتەکەیەوە هەبێ.

**ماددەی پەنجا و چوار:**

١ ـ ئەنجومەنی وەزیران بە دەست لەکارهەڵگرتو لەقەڵەم دەدرێت ئەگەر ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێم لە متمانەی بخات.
٢ ـ وەزیر بە دەست لەکار هەڵگرتو لەقەڵەم دەدرێت ئەگەر ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێم لە متمانەی بخات.

**ماددەی پەنجاو پێنج:**

١ ـ چۆنێتیی بەرپرسدان (**مسائلة**)ی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و جێگرەکانی و وەزیرەکان و ، چۆنێتیی تاوانبارکردن و دادگایی کردنیان، بەیاسا دیاردەکرێ.
٢ ـ مووچەو دەرماڵەو مافەکانیشیان بەیاسا دیاردەکرێ.

## بەشی سێیەم
## دەسەڵاتی دادوەری

**ماددەی پەنجاو شەش:**

دەسەڵاتی دادوەری لە هەرێمدا بە دەرەجەگەلی جیاوازیەوە، بەجۆرەکانیەوە، بە دەستەکانیەوە، بەشێوازی پێکهێنانیەوە بەشەرتوشرونی دامەزراندنی ئەندامەکانی و گواستنەوەو لێ پرسینەوەیانەوە، هەمووی بەیاسا رێک دەخرێت.

**ماددەی پەنجا وحەوت:**

دادوەری (ولایەی عـامە) ی هەیە بەسـەر هەمـوو کەسـانی تەبیعی ومـەعنەویی گشتی و تایبەتییەوە، تەنها بەسەر ئەوانەوە نەبێ کە یاسا هەڵاویری (استثناء) کردوون.

**ماددەی پەنجاو هەشت:**

دادوەری سەربەخۆیە، لە یاسا بەولاوە هیچ دەسەڵاتێکی دیکەی بەسەرەوەنییە.

**ماددەی پەنجاونۆ:**

دادگای پێداچوونەوە (التمییز) لە هەرێمی کوردستاندا سەرباری ئیش وکارە ئاساییەکانی خۆی، تایبەتمەندیشە بە لێکدانەوەی ئەم دەستورەو یەکلاکردنەوەی تانە(دفع) ی دەستوورینەبوونی ئەو یاسایانەی کە لە بەردەم دادگادا دەعوایان پێ کراوەتەوە، ئەوەش بە یاسا رێک دەخرێت.

**ماددەی شەستەم:**

ئیددیعای گشتی نوێنەری میللەتە (المجتمع) لە پارێزگاری کردنی مافی گشتی و وەدیهێنانی عەدالەتدا.

**ماددەی شەست ویەک:**

تیرە غـەیرە ئیسـلامـەکان بۆیان هەیە، بەپێی یاسای تایبـەت ئەنجـومـەنگەلی رۆحـانی و دادوەریی خۆیان سـازبدەن، ئەم ئەنجـومـەنانەش مـافی ئەوەیـان هەیە سەیری هەموو ئەو شتانەبکەن کە پەیوەندیی راستەوخۆی بە ئەحواڵی شەخسیی ئەو تیـرانەوە هەیە و نـاکەونە چوارچێوەی ئیش وکارەکانی دادگاکانی ئەحواڵی شەخسیەوە.

**ماددەی شەست و دوو:**

هەموو حوکم و بڕیارە دادگاییەکان بە ناوی گەلەوە دەردەچن.

## دەروازەی چوارەم
## ئیدارەو ئەنجومەنە شارەوانییەکان

**ماددەی شەست و سێ:**

دابەشە ئیداریەکانی هەرێمی کوردستان بەپێی یاسای هەرێم ئەنجام دەدرێن کە لە گەڵ حـوکمـەکـانی ئەم دەسـتـورەدا پێچەوانە نەبن ومـافـە ئیـدارییـەکـانی

کۆمەڵەنەتەوەییەکانیش ڕەچاوبگیرێن لەو یەکە ئیدارییانەدا کە زۆرینەی دانیشتوانی تێدا پێک دەهێنن.

**ماددەی شەست و چوار:**

هەرێم بۆی هەیە یەکەگەلی ئیداریی وەک (پارێزگاو قەزاو ناحیە) ی نوێ بنیات بنێ و ئەنجومەنگەلی محەللییان بۆ پێک بهێنێ و، مەرکەزەکانیان دیاری بکات و بیگۆڕێت و سنوورەکانیان بچەسپێنێ و هەمواریان بکات و لەیەکەگەلی ئیداری دایان ببڕێت و بیانخاتە سەر یەکەگەلی ئیداریی دیکە، ئەوەش هەمووی بە یاسا ڕێک دەخرێت.

**ماددەی شەست وپێنج:**

مەرکەزی پارێزگا و قەزاو ناحیە و گوند کە ژمارەی دانیشتوانی لە سێ هەزار کەس کەمتر نەبن شارەوانییەکی دەبێت ئەنجومەنێک بەڕێوەی دەبات، ئەو شارەوانییە خزمەتی گشتی بە هاووڵاتیەکانی پێشکەش دەکات.

**ماددەی شەست و شەش:**

١ـ سەرۆک وئەندامانی ئەنجومەنی شارەوانی لە دانیشتووانی ناوچەکە بە دەنگدانی گشتیی ئازاد و نهێنی و ڕاستەوخۆ هەڵدەبژێردرێن.

٢ـ لە پێکهێنانی ئەنجومەنگەلی شارەوانیدا، نوێنەرایەتیی عادیلانە بۆ کۆمەڵە نەتەوەییەکانی هەرێمی کوردستان ڕەچاودەگیرێت.

**ماددەی شەست و حەوت:**

پلەکانی شارەوانیەکان وچۆنێتیی هەڵبژاردنی سەرۆک و ئەندامانی ئەنجومەنی شارەوانی وئیش وکارەتایبەتەکانی ئەنجومەنگەلی شارەوانی و ماوەی ئەندامێتیی ئەندامەکانی و کاروبارەکانی دیکەی، هەمووی بە یاسا دیاردەکرێن.

## دەروازەی پێنجەم
## حوکمە داراییەکان

**ماددەی شەست وهەشت:**

بەپێی یاسا نەبێ، ناشێ باج یان ڕەسم بسەپێنرێ یان هەمواربکرێ یان لە غوبکرێ یان هیچ کەسێکی لێ عەفو بکرێت.

**ماددەی شەست و نۆ:**

دەسەڵاتەکانی هەرێم، بۆیان هەیە باج و رەسم لە هەرێمەکەدا بسەپێنن و وەریانبگرن یان هەمواریان بکەن یان لەغویان بکەن، بەرچاوگرتنی هەقیانەت (عەدالەت) و یەکسانی ویەکبوونی لە نێوان هاووڵاتیانی کۆماری فیدراڵیی عیراقدا.

**ماددەی حەفتا:**

داهاتی هەرێمی کوردستان لەمانە پێک دێت:

١ـ دەسکەوتی باج و رەسم و مزو کرێی خزمەتگەلی مەرفەقە گشتییەکان و ئیراداتی دام و دەزگاو شیرکەت و بەرژەوەندە گشتیەکان لە هەرێمدا.

٢ـ دەسکەوتی وەبەرهێنانی چاوگە سروشتییەکان **(استثمار الموارد الطبيعية)** لە هەرێمدا.

٣ـ منحە و بەخشش و دەسکەوتی پیتاک و یانسیب.

٤ـ قەرزی خۆماڵی و دەرەوەی تایبەت بە هەرێمی کوردستان.

٥ـ بەشە دەسکەوتی سامانی نەوت و رەسمی گومرگ کە بە پێی رێژەی دانیشتوانی هەرێم لەچاو دانیشتووانی عێراقدا، بەرهەرێم دەکەوێ.

**ماددەی حەفتاو یەک:**

هەرێمی کوردستانی عێراق لەرووی داراییەوە جێنشینی دەسەڵاتەکانی یەکێتی دەبێت، لە هەر ئیستیحقاقێکی دارایی و باج و رەسمێکی دواخراوی سەر بەهەرێمدا.

**ماددەی حەفتاو دوو:**

ساڵی دارایی بەیاسا دیاردەکرێ.

**ماددەی حەفتاو سێ:**

هەموو ساڵێکی دارایی، یاسای بوجەی یەکخراوی هەرێمی کوردستان یاساکاری دەکرێت و ، داهات و خەرجی خەملێنراو لەخۆ دەگرێ.

## دەروازەی شەشەم
## حوکمە کۆتاییەکان

**ماددەی حەفتاو چوار:**

هەر یاسا یان پێڕۆ یان بڕیار یان (مرسوم) ێ کە لە مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد یان هاووڵاتیانی هەرێمی کوردستان کەم بکاتەوە یان بەربەستی بکات، یان پێچەوانەی حوکمەکانی ئەم دەستورە بێت، بە باتڵ لەقەڵەم دەدرێت.

**ماددەی حەفتاو پێنج:**

بەبێ رەزامەندیی ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێمی کوردستان، ناشێ، کەیانی، یان پێڕۆی سیاسیی کۆماری فیدرالیی عێراق بگۆڕدرێ، دەنا، بەپێچەوانەوە گەلی هەرێمی کوردستان بۆی هەیە مافی خۆی لەچارەنووسی خۆیدا پیادە بکات.

**ماددەی حەفتاو شەش:**

هەر ناکۆکی و وێکنەهاتنێکی دەستوری لەنێوان دەسەڵاتەکانی هەرێمی کوردستان و هەریەکە لە دەسەڵاتەکانی کۆماری فیدراڵیی عێراق یان دەسەڵاتەکانی هەرێمێکی دیکەدا روویدات، ئەوە، لەوبارەدا هەواڵەی دادگای دەستوریی یەکێتییەکە دەکرێت بۆ یەکلاکردنەوەی.

**ماددەی حەفتاو حەوت:**

ئەم لایەنانەی خوارەوە مافی پێشکەشکردنی پێشنیازی هەمووارکردنی دەستوریان هەیە:

١ـ سەرۆکی هەرێم.
٢ـ ئەنجومەنی وەزیران.
٣ـ ژمارەیێ کە لە چواریەکی ژمارەی ئەندامانی ئەنجومەنی نیشستمانی کەمتر نەبن.

**ماددەی حەفتاو هەشت:**

لەهەرێمدا دیوانی ریقابەی دارایی دادەمەزرێت و، بەئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستانی عێراقەوە پەیوەست دەبێ و، ئەرک و پێکهاتەکانیشی بەیاسا رێک دەخرێت.

## پاشکۆی ژماره «٢٠»

# پرۆژەی دەستوری کۆماری فیدراڵیی عێراق

### دەروازەی یەکەم
### دامەزراندنی یەکێتییەکە

**ماددەی یەکەم:**

عێراق دەوڵەتێکی یەکگرتووی[فیدراڵی]یە، پێڕۆیەکی کۆماریی دیموکراتی پەرلەمانی هەیە، پێی دەگوترێ کۆماری فیدراڵیی عێراق.

**ماددەی دووەم:**

کۆماری فیدراڵیی عێراق لەمانە پێک دێت:

یەکەم: هەرێمی عەرەبی: هەردوو ناوچەی ناوەندو باشووری عێراق و پارێزگای موسڵ(نەینەوا)لە باکووری عێراق لەخۆ دەگرێ، ئەو قەزاو ناحیانە نەبێ کە زۆرینەیان کوردن و لە بڕگەی دووەمی خوارەوەدا ناویان هاتووە.

دووەم: هەرێمی کوردستان: پارێزگاکانی کەرکوک و سلێمانی و هەولێرو دهۆک و قەزاکانی ئاکرێ وشێخان و سنجارو تلعفرو ناحیەکانی زەممارو بەعشیقەو ئەلقۆش و ئاسکی کەلەک لە پارێزگای موسڵ و قەزای خانەقین و مەندەلی لە پارێزگای دیالە بە هەموو سنوورە ئیداریەکانی بەر لە ساڵی(١٩٦٨ز)دەگرێتەوە لەگەڵ ئەو ناوچانەش کە زۆرینەی کوردی تێدا نیشتەجێن.

**ماددەی سێیەم:**

گەل چاوگەی دەسەڵاتەکان و بناغەی شەرعییەتەکانێتی.

**ماددەی چوارەم:**

گەلی عێراق لە دوو نەتەوەی سەرەکی پێک هاتووە کە نەتەوەی عەرەب و نەتەوەی کوردە. ئەم دەستورەش لەسەر بناغەی فیدرالییەت مافە نەتەوەییەکانی هەردووکیان ئیقرار دەکاو، مافە رەواکانی کۆمەڵە نەتەوەییەکانیش لە چوارچێوەی کۆماری فیدراڵیی عێراقدا ئیقرار دەکات.

**ماددەی پێنجەم:**
بەغدا پایتەختی کۆماری فیدراڵیی عێراقەو، دەشێتیش کاتێ پێویست بکات غەیری بەغدا بۆ ماوەیەکی رەفتەنی(مؤقت)بکرێت بە پایتەخت.

**ماددەی شەشەم:**
١ـ کۆماری فیدراڵیی عێراق ئاڵاو دروشم و سرودی نیشتمانیی خۆی هەیە بە مەرجێ هەر هەموویان هێمای یەکێتی و هاوژیانی و برایەتیی نێوان نەتەوەکانی تێدابێت، ئەوەش بە یاسایەک رێک دەخرێت.
٢ـ هەرێمی کوردستان ئاڵای تایبەتی خۆی هەیە شان بەشانی ئاڵای کۆماری فیدراڵیی عێراق، هەروەها دروشم و سرودو جەژنی نەتەوەیی(نەورۆزی ٢١ی ئادار)یشی هەیە کە ئەوەش بە یاسایەک رێک دەخرێت.

**ماددەی حەوتەم:**
عەرەبی و کوردی دوو زمانی رەسمیی یەکێتیەکەن و، عەرەبی زمانی رەسمیی هەرێمی عەرەبی و، کوردیش زمانی رەسمیی هەرێمی کوردستانە.

## دەروازەی دووەم
## ماف وئەرکە بنیچەییەکان

**ماددەی هەشتەم:**
یەکەم: هاووڵاتیان لەبەردەم یاسادا چونیەکن و هیچ جیاوازییەکیان بەهۆی جنس یان رەگەز یان رەنگ یان زمان یان ئاین یان مەزەب یان هەڵکەوتی کۆمەڵایەتی یان دۆخی کۆمەڵایەتییەوە، لە نێواندا نییە.
دووەم: هەلی چونیەک(تکافؤ الفرص)بۆ هەموو هاووڵاتیان لە سنووری یاسادا دەستەبەرە.

**ماددەی نۆیەم:**
خێزان(الأسرة) ناوکەی کۆمەڵگەیەو، دەوڵەتیش پاراستن و راگرتنی لە ئەستۆ دەگرێ و چاودێریی دایکایەتی و منداڵێتیش دەکات.

**ماددەی دەیەم:**
ئافرەت یەکسانیی تەواوی لەگەڵ پیاودا هەیە.

**ماددەی یازدە:**

یەکەم: تاوانبار بێ تاوانە(پاکە)تا لە دادگاییەکی یاساییدا ئیدانەکەی ساغ دەکرێتەوە.

دووەم: مافی خۆپارێزی لە هەموو قۆناغەکانی لێ پێچانەوەو دادگاییدا بەپێی حوکمەکانی یاسا مافێکی پیرۆزە.

سێیەم: دانیشتنەکانی دادگایی کردن لەڕووە(ئاشکرایە)، مەگەر، دادگا بەپێی حوکمەکانی یاسا بڕیاری نهێنیی بوونیان بدات.

چوارەم: سزا شەخصییەو، بەپێی یاساش نەبێ، نە جەریمە هەیەو نە سزا، سزا لەسەر رەفتاریش ناشێ بدرێ، مەگەر یاسا ئەو رەفتارە لەکاتی تێوەگلانیدا بە جەریمە لە قەڵەم بدات و، ناشێ لەو سزایە زیاتر کە لە کاتی تێوەگلانی جەریمەکەدا بەرکارخراوە، سزایەکی گرانتر بسەپێنرێت.

**ماددەی دوازدە:**

یەکەم: حورمەتی(کەرامەتی)مرۆڤ پارێزراوەو، هەر جۆرە ئەشکەنجەدانێکی جەستەیی و دەروونی قەدەغەیە.

دووەم: بەپێی حوکمەکانی یاسا نەبێت، ناشێ هیچ کەسێ بگیرێ یان تەوقیف بکرێ یان بپشکنرێت.

سێیەم: حورمەتی خانە پارێزراوەو، بەپێی ئوسوڵە دیارکراوەکانیش نەبێ کە لە یاسادا هاتووە ناشێ پێ بهاوێژرێتە ناوخانە یان بپشکنرێت.

**ماددەی سیازدە:**

نهێنی هاودەنگیی بەریدی(ئاسایی و ئەلیکترۆنی)و بروسکەو تەلەفۆنی دەستەبەرەو، بۆ زەرورەتی عەدالەت و ئاسایشی و بە بڕیاری لایەنێکی دادوەری و لە سنووری ئیقرارکراوی یاساییشدا نەبێ، ناشێ ئاشکرا بکرێن.

**ماددەی چواردە:**

ناشێ هاووڵاتی لەسەفەر بۆ دەرەوەی وڵات یان گەڕانەوەی قەدەغە بکرێت و، لەو حاڵەتانەشدا نەبێ کە یاسا سنووری بۆ دانابن دەنا هاتن و چوونیشی لەناو وڵاتەکەدا لێ نابەسترێ.

**ماددەی پازدە:**

ئازادیی ئاین و بڕواو داب و دەستووری ئایینی دەستەبەرن بە مەرجێ لەگەڵ حوکمەکانی ئەم دەستورەو دەستورگەلی هەرێمایەتی و یاساگەلی یەکێتییەکەدا پێچەوانە نەبن و لە پیرۆزی گشتی و ئادابی گشتی لانەدەن.

**ماددەی شازدە:**

فێرکردنی سەرەتایی ئیلزامییەو، دەوڵەت و حکومەتانی هەرێمەکانیش پێویستە لەسەریان بێ سەوادیی(الأمیة) لەناو ببەن و، مافی فێربوونی بەخۆڕایی لە قۆناغە جۆربە جۆرەکانی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی و زانکۆیی و پیشەیی و تەقەنیدا بۆ هاووڵاتیانی خۆیان دەستەبەر بکەن.

**ماددەی حەڤدە:**

ئازادیی لێکۆڵینەوەی زانستی، لەچوارچێوەی یاسادا، دەستەبەرەو، پێویستیشە دەست باڵایی و ئیبداع و ئیپتیکاریش لە بوارگەلی زانستی و فیکری و رۆشنبیری و هونەریدا دنە بدرێن و پاداشت بکرێن.

**ماددەی هەژدە:**

ئازادیی راو پەخش و چاپەمەنی و رۆژنامەوانی و کۆبوونەوەو خۆپیشاندان و مان گرتن و دامەزراندنی حزبگەلی سیاسی و سەندیکاو کۆمەڵەکانیش، بەپێی حوکمەکانی یاسا دەستەبەر دەکرێن.

**ماددەی نۆزدە:**

یەکەم: هیچ هاووڵاتیەک لە جنسییەی عێراقی بێ بەری ناکرێ.

دووەم: ناشێ پەنابەری سیاسی تەسلیم بکرێتەوە.

**ماددەی بیست:**

یەکەم:کارکردن مافێکی هەر هاووڵاتیەکەو، پێویستیشە لەسەری، لەهەر کوێیەکیش بیەوێ کاری خۆی دەکات و دەسەڵاتەکانی دەوڵەتیش هەوڵ دەدەن هەلی کار«فرصة العمل» بۆ هەر هاووڵاتییەک کە توانای بەسەریدا بشکێ بڕەخسێنن.

دووەم: دەوڵەت، باشتر کردنی هەلومەرجی کارو باڵاکردنی سەویەی ژیواری و شارەزایی و رۆشنبیری بۆ گشت هاووڵاتیانی ئیشکەر دەستەبەر دەکا،

هەروەها زەمانەتی کۆمەڵایەتییان بۆ حاڵەتی نەخۆشی و زەبوونی و بێ کاری و پیری بۆ فەراهەم دەکات.

سێیەم: بەپێی یاسا، بۆ حاڵەتی دوورخستنەوەی زیانێکی گشتیی ناکاو نەبێ، دەنا، ناشێ ئیشێکی دیارکراو بە زۆر بە هیچ کەسێک بکرێت.

**ماددەی بیست ویەک:**

دەسەڵاتەکانی یەکێتییەکەو هەرێمەکانیش مافی موڵکایەتی دەستەبەر دەکەن و، یاسا پێوەندیدارەکانیش ناوەرۆک و سنوورەکانی رێک دەخەن.

**ماددەی بیست ودوو:**

یەکەم: دەوڵەت لە رێگای سەروەبەر بەرفراوان کردنی خزمەتە پزیشکیەکانی بوارگەلی پاراستن و چارەسەری و داودەرمانەوە، پاراستنی تەندروستیی گشتی دەستەبەر دەکات.

دووەم: دەوڵەت، پاراستن و باشترکردن و بەرەو چاکتر گۆڕینی خاکوئاو (البیئة)دەستەبەر دەکات.

**ماددەی بیست وسێ:**

باج دان ئەرکێکی پێویستە لەسەر هەموو هاوولاتیەک و، بە یاساش نەبێ باج نە دەسەپێنرێ و نە وەردەگیرێ و نە هەمواردەکرێ.

**ماددەی بیست وچوار:**

پێشکەش کردنی شکات و بەرزکردنەوەی سکالانامە بۆ دەسەلاتە پێوەندیدارەکان مافێکی دەستەبەرە بۆ هاوولاتی و، دەسەلاتەکانیش پێویستە لە ماوەیەکی دیارکراوی ماقووڵدا یەکلایی بکەنەوە.

**ماددەی بیست وپێنج:**

مەرجەعی پاراستنی ئەو مافانەی لەم دەروازەیەدا هاتوون دادوەریەو، دادگاش کاتێ کەم و زۆریی بەرپرسێتیی دەسەلاتی پێوەندیدار یان بەرپرسێتیی یەکەوڕاستی شەخصی یان بەرپرسێتیی هەردووکیان دیاردەکات ئەوجا پێویستە لەسەری حوکمی سزا یان قەرەبو یان هەردوو حوکمەکە بەسەریدا بسەپێنێ.

## دەروازەی سێیەم
## دەسەڵاتەکانی یەکێتی

### بەشی یەکەم ـ دەسەڵاتی یاساکاری

**ماددەی بیست وشەش:**

دەسەڵاتی یاساکاریی یەکێتی لە دوو ئەنجومەن پێک دێت کە بریتین لە پەرلەمانی یەکێتی و ئەنجومەنی هەرێمەکان.

### مەبحەسی یەکەم
### (پەرلەمانی یەکێتی)

**ماددەی بیست وحەوت:**

یەکەم:پەرلەمانی یەکێتی لە نوێنەرانی گەلی هەردوو هەرێمەکە پێک دێت و بە دەنگدانی گشتیی ئازادو نهێنی و راستەوخۆ هەڵدەبژێردرێن، ئەوەش بە یاسا رێک دەخرێت.

دووەم: هەر هاووڵاتییەک هەژدە ساڵ تەمەنی تەواوکردبێ و ئەهلییەتی تەواوی تێدا هاتبێتەجێ مافی هەڵبژاردنی هەیە.

سێیەم: هەر هاووڵاتییەک بیست و پێنج ساڵ تەمەنی تەواوکردبێ و ئەهلییەتی تەواوی تێدا هاتبێتەجێ مافی خۆ پاڵاوتنی بۆ پەرلەمانی یەکێتی هەیە.

**ماددەی بیست وهەشت:**

خولی هەڵبژاردنی پەرلەمانی یەکێتی چوار ساڵەو، لە رۆژی کۆبوونەوەی یەکەمیەوە دەست پێ دەکات.

**ماددەی بیست ونۆ:**

شێوازی هەڵبژاردن و چۆنێتیی ئەنجامدانی و رێژەی نواندن و دیارکردنی وادەی هەڵبژاردن بە یاسا دیاردەکرێ.

**ماددەی سی:**

یەکەم:ناشێ ئەندامێتیی پەرلەمانی یەکێتیی و ئەندامێتیی ئەنجومەنی هەرێمەکان یان پەرلەمانەکانی هەرێمەکان یان ئەندامێتیی

ئەنجومەنەکانی ئیدارەگەلی شارەوانی و محەللی دووسەرە، ئەمیشیان و ئەویشیان پێکەوە کۆ بکرێنەوە.

دووەم: ناشێ ئەندامێتیی پەرلەمانی یەکێتیی و وەزیفەیەکی گشتی پێکەوەبن.

سێیەم: ئەندامی پەرلەمان لەو رۆژەوەی لەبەردەمی پەرلەمانی یەکێتیدا سوێندی دەستوری دەخوات، بەدەست هەڵگرتوو لە وەزیفەی گشتی لە قەڵەم دەدرێت.

**ماددەی سی ویەک:**

پەرلەمان یەکەم کۆبوونەوەی خۆی بە سەرۆکایەتی بە تەمەن گەورەترین ئەندام سازدەدا. لەو کۆبوونەوەیەدا، بە دەنگدانی نهێنی سەرۆک و جێگری سەرۆک و ئەمینداری نهێنییەکان لەنێو ئەندامەکانیدا هەڵدەبژێرێ.

**ماددەی سی ودوو:**

یەکەم: پەرلەمانی یەکێتیی کۆبوونەوەکانی خۆی بە زۆرینەی ئەندامەکانی سازدەدات و، بڕیارەکانیشی بە زۆرینەی رەها دەردەچوێنێ ـ ئەگەر دەقێکی ئەم دەستورە پێچەوانەی ئەوە نەبێت ـ

دووەم: پەرلەمان دروستیی ئەندامێتی یەکلادەکاتەوە.

سێیەم: پەرلەمان بڕیار لەسەر پێکهێنانی لیژنەکانی خۆی دەدا.

## مەبحەسی دووەم
## ئەنجومەنی هەرێمەکان

**ماددەی سی وسێ:**

ئەنجومەنی هەرێمەکان لە بیست ئەندام پێک دێت و، بەدوو ژمارەی یەکسان لە ئەندامان نوێنەرایەتی هەریەکە لە هەرێمی عەرەبی و هەرێمی کوردستان دەکەن.

**ماددەی سی وچوار:**

هەر هەرێمەو بەپێی شێوازێ کە دەستوری هەرێمەکە دیاری کردووە نوێنەرانی خۆی بۆ ئەنجومەنی هەرێمەکان ناوزەددەکات و لاشیان دەدات.

**ماددەی سی وپێنج:**

یەکەم: ئەنجومەنی هەرێمەکان ئەو پرۆژەی یاساو بڕیارانە تەسدیق دەکات کە پەرلەمانی یەکێتی ئیقراریان دەکات.

دووەم: ئەگەر هات و، ئەنجومەنی هەرێمەکان پرۆژەی یاساکەی ئیقرارنەکرد، ئەوا لەو بارەدا هەواڵەی پەرلەمان دەکرێتەوە تا دووبارە سەیری بکەنەوە.

سێیەم: خۆ ئەگەر هات و، ئەنجومەنی هەرێمەکان بۆ دووەم جاریش لەسەر ڕای خۆی سوور بوو، ئەوە، لەو بارەدا، ئیدی پرۆژەی یاساکە بەلاوەدەنرێ.

## مەبحەسی سێیەم
## ئیشەتایبەتەکانی پەرلەمانی یەکێتی

**ماددەی سی وشەش:**

ئیشی تایبەتی پەرلەمانی یەکێتی بریتییە لە پیادەکردنی ئەم دەسەڵاتانە:

یەکەم: هەموارکردنی دەستوری یەکێتی بە زۆرینەی سێ لە چواری ئەندامانی هەریەکە لە دوو ئەنجومەنەکە، بەجیا.

دووەم: تەسدیقکردنی پەیمانگەل و ڕێکەوتننامەگەلی دەرەکی بە ڕەزامەندیی سێ لە چواری ژمارەی ئەندامانی هەریەکە لە دوو ئەنجومەنەکە، بەجیا.

سێیەم: جاڕدانی جەنگ یان بەستنی ئاشتی بە مەرجێ سێ لە چواری ژمارەی ئەندامانی هەریەکە لەدوو ئەنجومەنەکە، بەجیا، ڕەزامەندیی لەسەر بدەن.

چوارەم: یاساکاریی یاساکانی یەکێتی.

پێنجەم: متمانەدان بە وەزارەتی یەکێتی و ئەندامەکانی و، متمانە لێ کێشانەوەیان.

شەشەم: تەسدیقکردنی بوجەو حساب و حسابکاریی کۆتایی یەکێتی.

حەوتەم: سەپاندن و هەموارکردن و ئیلغاکردنی باج و ڕەسمەکان.

هەشتەم: ڕیقابەکردنی ئیشەکانی دەسەڵاتی تەنفیزیی یەکێتی.

نۆیەم: دانانی پێڕۆ ناوخۆییەکەی و دیارکردنی میلاکات و ئیقرارکردنی بوجەکەی و دامەزراندنی فرمانبەرەکانی و دیارکردنی موچەکانیان.

## بەشی دووەم
## دەسەڵاتی تەنفیزیی یەکێتی

### مەبحەسی یەکەم
### سەرۆکی کۆمار

**ماددەی سی وحەوت:**

سەرۆکی کۆمار سەرۆکی دەوڵەتەو فەرماندەی گشتیی هێزە چەکدارەکانە لە وڵاتدا.

**ماددەی سی وهەشت:**

سەرۆکی کۆمار بە دەنگدانی گشتیی ئازاد و نهێنی و یەکەوڕاست یان(لەلایەن پەرلەمانی یەکێتییەوە)بۆ ماوەی چوار ساڵ هەڵدەبژێردرێت و، دەشێ بۆ یەک جاری دیکەش هەڵبژێردرێتەوە.

**ماددەی سی ونۆ:**

مەرجی پاڵێوراو بۆ پلەوپایەی سەرکۆمار ئەمانەن:
یەکەم: دەبێ عێراقی بێت و چل ساڵیش تەمەنی تەواوکردبێ.
دووەم: دەبێ مافگەلی مەدەنی و سیاسی هەبێ.

**ماددەی چل:**

سەرۆکی کۆمار بەرلەوەی ئیش وکاری پلەوپایەکەی خۆی بگرێتە دەست، لەبەردەمی دانیشتنێکی هاوبەشی پەرلەمانی یەکێتیی و ئەنجومەنی هەرێمەکاندا، ئەم سوێندە دەستوریەی خوارەوە دەخوات:
**«بە یەزدانی مەزن سوێند دەخۆم کە ڕێز لە دەستوری کۆماری فیدراڵیی عێراق بنێم و پاسەوانی لە سەربەخۆیی و سەروەریی نیشتمان بکەم و بە دڵسۆزیش بۆ وەدی هێنانی بەرژەوەندی ئازادی و حورمەتی گەل لە کاردا بم»**

**ماددەی چل ویەک:**

کاتێ سەرۆکی کۆمار دەست لە کار هەڵدەگرێ یان دەمرێ یان تووشی زەبونیەکی بەردەوام دەبێ، جێگرەکەی بۆ باقیمەنی ماوەی سەرۆکایەتییەکەی ئەرکی سەرۆکایەتیی کۆمار دەگرێتە دەست.

**ماددەی چل و دوو:**

سەرۆکی کۆمار لە دەرەوە دەوڵەتی یەکێتی دەنوێنێ و، بەناوی دەوڵەتی یەکێتییەوە پەیمانگەل لەگەڵ دەوڵەتە بیانییەکاندا دەبەستێ و نوێنەری دیبلۆماسی دەنێرێ و پێشوازیش لە نوێنەرانی دیبلۆماسی دەکات.

**ماددەی چل و سێ:**

سەرۆکی کۆمار ئەم ئیش وکارانە دەگرێتەدەست:

یەکەم: سەربەخۆیی کۆماری فیدراڵیی عێراق و یەکێتیی خاکەکەی و ئاسایشی ناوەوەو دەرەوەی دەپارێزێ.

دووەم: جێگری سەرۆکی کۆمار دادەمەزرێنێ دوای ئەوەی لەلایەن ئەنجومەنی هەرێمەکانەوە دەپاڵێورێ.

سێیەم: مەرسومی تایبەت بە پێکهێنانی وەزارەتی یەکێتی دەردەهێنێ دوای ئەوەی متمانەی پەرلەمانی یەکێتی وەدەست دەهێنێ.

چوارەم: مەرسومی تایبەت بە هەڵبژاردنی پەرلەمانی یەکێتی دەردەهێنێ.

پێنجەم: یاسا یەکێتییەکان دەردەهێنێ.

شەشەم: نوێنەرانی دیبلۆماسی عێراق بۆ دەوڵەتان و ڕێکخراوو کۆنگرە نێودەوڵەتیەکان دادەمەزرێنێ و متمانەداریان دەکات.

حەوتەم: هێزە چەکدارەکان و هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆ بەپێی پێدوایستی بەرژەوەندی گشتی دەجووڵێنێ، بەجۆرێ، کە لەگەڵ حوکمەکانی ئەم دەستورەو دەستوری هەرێمدا پێچەوانە نەبێت.

هەشتەم: حاڵەتی ناکاو (الطواریء) جاڕدەدات کە ئەوەش بە یاسایەکی تایبەت ڕێک دەخرێت.

نۆیەم: بەپێی یاسا روتبەی سەربازی بە ئەفسەرانی هێزی چەکدارو هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆ دەبەخشێ و لەخزمەت دەریان دەکاو خانەنشینیان دەکات.

دەیەم: نیشان و مەدالیا(الاوسمة والانواط) دەبەخشێ.

یازدەم: خاوەن پلەی تایبەت و قازی و سەرۆکی ئیدیعاو موددەعییە گشتیەکان و جێگرەکانیان لە یەکێتییەکەدا دادەمەزرێنێ.

**ماددەی چل و چوار:**
تاوانبارکردنی سەرکۆمار بەزورینەی دوو لە سێی ئەندامانی پەرلەمانی یەکێتی دەبێ و، دادگایی کردنیشی لە دانیشتنێکی هاوبەشی دادگای دەستوریی باڵاو ئەنجومەنی هەرێمەکاندا بەسەرۆکایەتی سەرۆکی دادگای دەستوریی باڵا ئەنجام دەدرێ و بڕیارەکەشی بەزۆرینەی دوو لە سێ دەردەچێ.
**ماددەی چل و پێنج:**
سەرەک کۆمار بەدرێژایی ماوەی تاوانبارکردنەکەی لە ئیش وکاری پلەو پایەکەی خۆیدا بەردەوام دەبێ.

## مەبحەسی دووەم
## ئەنجومەنی وەزیران

**ماددەی چل و شەش:**
ئەنجومەنی وەزیران دەستەی تەنفیزیی باڵایە لە یەکێتیدا.
**ماددەی چل و حەوت:**
ئەنجومەنی وەزیران لە سەرەک وەزیران و جێگرەکانی و وەزیرەکان پێک دێت کە هەردوو هەرێمە یەکگرتووەکە دەنوێنن بەپێی ڕێژەی دانیشتووانیان.
**ماددەی چل و هەشت:**
ئەگەر سەرەک کۆمار سەر بە یەکێ لە دوو هەرێمەکە بێت، ئەوا، سەرەک وەزیران لە هەرێمەکەی تر دەبێت.
**ماددەی چل و نۆ:**
یەکەم:سەرەک وەزیران کە لەلایەن پەرلەمانی یەکێتیەکەوە تەکلیف کراوە، لیستی ئەندامانی وەزارەتەکەی پێشکەش دەکات بە سەرەک کۆمار تا تەسدیقی بکات.
دووەم: سەرەک وەزیران لیستی ئەندامانی وەزارەتەکەی، دوای تەسدیقکردنی لەلایەن سەرکۆمارەوە پێشکەش دەکات بە پەرلەمانی یەکێتیەکە تا متمانە وەربگرێ و، دوای متمانە وەرگرتنیش، ئنجا، سەرەک کۆمار، مەرسومی کۆماریی تایبەت بە پێکهێنانی وەزارەتەکە دەردەهێنێ.

**ماددەی پەنجا:**

ئەنجومەنی وەزیران ئەم ئیش وکارانەی خوارەوە دەکات:

یەکەم:بەرکارخستنی یاساکانی یەکێتی.

دووەم:پاراستنی ئاسایش و سەلامەتیی ولآت.

سێیەم: ئامادەکردنی پرۆژەگەلی یاساکانی یەکێتی و هەوالّەکردنی بۆ پەرلەمانی یەکێتی.

چوارەم: ئامادەکردنی بوجەی یەکێتی.

پێنچەم: سەرپەرشتیی وەزارەتگەل و دەزگاو مەرفەقە گشتییەکانی یەکێتی.

شەشەم:دەرهێنانی پێرۆگەلی یەکێتی.

حەوتەم: ئامادەکردنی بوجەی گشتی و حساب و حسابکاریی کۆتایی یەکێتی.

هەشتەم: قەرزکردن و قەرزدان و سەرپەرشتیی کاروباری دارایی.

نۆیەم:دامەزراندنی فرمانبەرانی مەدەنی لە یەکێتیەکەداو تەرقیەو خانەنشین کردنیان بەپێی یاسا.

**ماددەی پەنجا و یەک:**

یەکەم: سەر کۆمار بۆی هەیە، لە هەر کاتێکدا پێویست بێت، داوا بکات ئەنجومەنی وەزیران کۆببێتەوە، کۆبوونەوەکەش تەنها بۆ ئەو بابەتانە دەبێت کە کۆبوونەوەکەی بۆ کراوە.

دووەم: سەر کۆمار مافی ئەوەشی هەیە داوای راپۆرتگەلی تایبەت بە ئیش وکاری ئەنجومەنی وەزیران و وەزارەتەکانیش بکات.

**ماددەی پەنجا و دوو:**

یەکەم: پەرلەمانی یەکێتی بۆی هەیە متمانە بکێشێتەوە لە:

١ ـ وەزارەت، کە هەر لە رۆژی متمانە لێ کێشانەکەوە بە دەست لەکار هەلّگرتو دادەنرێت.

٢ ـ وەزیر، کە هەر لە رۆژی متمانە لێ کێشانەکەوە بە دەست لە کار هەلّگرتو دادەنرێ.

دووەم: وەزارەتە دەست لەکار هەلّگرتووە کە بەردەوام کاروباری ئاسایی بەرێ دەخات تا ئەو کاتەی وەزارەتێکی نوێ پێک دەهێنرێت.

## بەشی سێیەم
## دادگای دەستوریی باڵا

**ماددەی پەنجاو سێ:**

دادگای دەستوریی باڵا لە ژمارەیێ ئەندامگەلی ناسراو بە لێهاتویی و شارەزایی و دەست و دڵ پاکی نێودادوەرو مامۆستای یاسای زانکۆکان و پارێزەرانێ پێک دێت کە بۆ ماوەیەک، لە بیست ساڵ کەمترنەبێ، ئیشیان لە بواری دادوەری یان وانەبێژی یان پارێزەرایەتیدا کردبێ و، هەر هەرێمەش نیوەیان دەپاڵێوێ و(ژمارەی ئەندامان و ماوەی ئیش کردنیشیان بە یاسا دیاردەکرێت).

**ماددەی پەنجا و چوار:**

سەرۆکایەتیی دادگای دەستوریی باڵا خولاوخول(دوریە) دەبێت و، هەر ساڵەو، بەنۆرە، نوێنەری یەکێ لە دوو هەرێمەکە دەیگرێتە دەست.

**ماددەی پەنجا و پێنج:**

ئەندامی دادگای دەستوریی باڵا ناشێ وەلابنرێ(عەزل بکرێ)تەنها لەو حاڵەتەدا نەبێ کە تاوانبار دەکرێ بەوەی کە دەست و دڵی پاک نییە، تاوانبارکردن و دادگاییکردن و ئیدانەکردنیشی، لەلایەن ئەنجومەنی هەرێمەکانەوە دەکرێ.

**ماددەی پەنجاو شەش:**

ئەندامی دادگای دەستوریی باڵا، بەو هۆیەوە کە گەیشتووەتە تەمەنی یاسایی خانەنشین کردن، خانەنشین ناکرێت لەسەر داوای خۆی نەبێت.

**ماددەی پەنجاو حەوت:**

دادگای دەستوریی باڵا ئەم ئیشە تایبەتانەی خۆی هەیە:

یەکەم:لێکدانەوە(تفسیر)ی ئەم دەستورە.

دووەم: سەیرکردنی دەستوریيەتی ئەو یاسایانەی کە لە پەرلەمانی یەکێتییەوە دەردەهێنرێن و، دەستوریيەتی ئەو بڕیارانەش کە لە دەسەڵاتی تەنفیزیی یەکێتییەوە دەردەهێنرێن، ئەوەش بەیاسا رێک دەخرێت.

سێیەم: یەکلاکردنەوەی ئەو ناکۆکییانەی کە لە بەرکارخستنی ئەم دەستورەدا دەکەوێتە نێوان یەکێتی و هەرێمەکانەوە.

چوارەم: یەکلاکردنەوەی ئەو ناکۆکییانەی کە لە بەرکارخستنی ئەم دەستورەو دەستورگەلی هەرێمەکاندا، دەکەوێتە نێوان هەرێمەکانەوە.

**ماددەی پەنجا و هەشت:**

دادگای دەستوریی باڵا بڕیارەکانی بە زۆرینەی دوو لە سێی ئەندامەکانی دەردەهێنێ.

## بەشی چوارەم
## ئیش وکارە تایبەتەکانی یەکێتی

**ماددەی پەنجاو نۆ:**

دەسەڵاتەکانی یەکێتی ئەم ئیشە تایبەتانە دەکەن، بەڵام غەیری ئەو ئیشانە تایبەتن بە دەسەڵاتەکانی هەرێم:

یەکەم:نەخشەسازیی سیاسەتی دەرەوەو نوێنەرایەتیی دیپلۆماسی وقونسلی.

دووەم:گرێدانی پەیمانگەل و ڕێکەوتننامەگەلی نێودەوڵەتی، دەسەڵاتەکانی هەرێمیش مافی ئەوەیان هەیە ڕێکەوتننامەی ئابووری و ڕۆشنبیری و وەرزشی لەگەڵ هەرێمەکانی دیکەی ناو عێراق و دەرەوەشیدا گرێ بدەن.

سێیەم:کاروباری بەرگری، ئەمە ڕیزە جۆربەجۆرەکانی هێزە چەکدارەکان دەگرێتەوە.

چوارەم: جاڕدانی جەنگ و بەستنی ئاشتی.

پێنچەم:پارەو دەرهێنانی دراوو،دانانی سیاسەتی ئەمانەتی (الائتمانیة) و بانکی و گرێدانی قەرزەکانی یەکێتی.

شەشەم: دانانی پێوەرو عەیارەو کێشەکان(وضع المقاييس والمكاييل والأوزان)ودیارکردنی سیاسەتی گشتی لە بواری مزوکرێ دا.

حەوتەم: دانانی پلانی ئابووریی گشتی بە ئامانجی فراژوکردنی(تنمية) بواری پیشەسازی و بازرگانی وکشتوکالیی هەرێمەکان.

هەشتەم: دانانی بوجەی گشتیی یەکێتی.

نۆیەم: کاروباری ئاسایشی فیدراڵی.

دەیەم: کاروباری جنسییە و ئیقامە و بیانییەکان.

یازدەم: سامانی نەوت.

## دەروازەی چوارەم
## ڕێکخستنی دەستوریی هەرێم

**ماددەی شەست:**

هەر هەرێمەو دەستوری تایبەتی خۆی دادەنێت بەرەچاوگرتنی ئەم دوو مەرجە:

یەکەم:بنیاتنانی پێڕۆی کۆماری دیموکراتی پەرلەمانی.

دووەم: حوکمەکانی ئەو پێڕۆیە لەگەڵ ئەم دەستورەدا پێچەوانە نەبن.

**ماددەی شەست ویەک:**

گەلی هەرێم، بەدەنگدانێکی گشتیی ئازادو نهێنی و ڕاستەوخۆ، نوێنەرانی خۆی بۆ ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێم هەڵدەبژێرێ. شێوازی هەڵبژاردن و چۆنێتیی هەڵبژاردن و ڕێژەی نوێنەرایەتی و دیارکردنی وادەی هەڵبژاردنیشی بە یاسایەکی تایبەت دیاردەکرێن.

**ماددەی شەست ودوو:**

ئیش وکارەکانی ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێم و پێوەندییەکانی لەگەڵ دەسەڵاتەکانی تردا، بەپێی دەستوری هەرێم دیاردەکرێن.

**ماددەی شەست وسێ:**

دەسەڵاتی تەنفیزی هەرێم لە مانە پێک دێت:

یەکەم: سەرۆکی هەرێم.

دووەم: ئەنجونی وەزیرانی هەرێم.

**ماددەی شەست وچوار:**

گەلی هەرێم[ یان ئەنجومەنی نیشتمانیی هەرێم] سەرۆکێک هەڵدەبژێرێ (سەرۆکی هەرێم)ی پێ دەگوترێ، ئەو سەرۆکە سەرۆکی باڵای دەسەڵاتی تەنفیزییەو، لە بۆنەگەل و دابودەستوری پرۆتۆکۆلیدا، لە هەرێمدا نوێنەرایەتیی سەرکۆماری فیدراڵیی عیراق دەکات.

**ماددەی شەست و پێنج:**

شێوازو مەرجەکانی هەڵبژاردنی سەرۆکی هەرێم و ماوەی کاربەدەستی (ولایـــــة)وئیش وکارەکانی و پێوەندیی لەگەڵ ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێم ودەسەڵاتەکانی دیکەی هەرێمدا، هەمووی بە پێی دەستوری هەرێم دیاردەکرێن.

**ماددەی شەست وشەش:**

ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێم لە سەرۆکی وەزیران و جێگرەکانی وژمارەیەک لە وەزیران پێک دێت ودەسەلاتی تەنفیزیی هەرێم لە ئەستۆدەگرێ.

**ماددەی شەست وحەوت:**

چۆنێتیی پێکهێنانی ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێم وئیش وکارەکانی وپێوەندیی بە سەرۆکی هەرێمەوە، بەپێی دەستوری هەرێم دیاردەکرێن.

**ماددەی شەست و هەشت:**

دادگای بالاّی هەرێم (دادگای تەمییز) سەرباری ئیش وکارە ئاساییەکانی خۆی، تایبەتمەندیشە بە لێکدانەوەی دەستوری هەرێم و یەکلاکردنەوەی تانە(دفع)ی دەستوری نەبوونی ئەو یاسایانەی کە لەبەردەم دادگادا دەعوایان پێ کراوەتەوە.

**ماددەی شەست ونۆ:**

دادوەری لە هەرێمدا دەسەلاتی دادوەریی سەربەخۆ پیادەکات، هەموو دەرەجەکانی دادگاکان دەگرێتەخۆ بە دادگای تەمییزی هەرێمیشەوە کە سەیری دەعوا مەدەنیەکان و قەزایای سزایی و هی دیکەی بە دوا دەرەجە دەکات، کە ئەوەش بە یاسایەکی هەرێمی رێک دەخرێت.

**مادددەی حەفتا:**

هەرێم دەسەلاتە جۆربەجۆرەکان پیادەکات، تەنها ئەوانە نەبێ کە بەپێی حوکمەکانی ئەم دەستورە، بە تایبەتیش بەپێی بەشی چوارەمی دەروازەی سێیەم دراون بە یەکێتی.

**ماددەی حەفتاویەک:**

هەر ناکۆکییەک لە نێوان یەکێتی وهەرێم یان لە نێوان خودی هەرێمەکاندا دەربارەی پیادەکردنی ئەو ئیش وکارانەی لەم دەستورەدا هاتووە، رووبدات، دەخرێتە بەردەم دادگای دەستوریی بالاّ بۆ یەکلاکردنەوەی.

## دەروازەی پێنجەم
## حوکمە داراییەکان

**ماددەی حەفتاودوو:**

لە کۆماری فیدراڵیی عێراقدا دیوانی ریقابەی دارایی دادەمەزرێ و پابەستی ئەنجومەنی نیشتمانیی یەکێتی دەبێت وئەرک وپێکهاتەکانیشی بە یاسایەک رێک دەخرێت.

**ماددەی حەفتا وسێ:**

بە یاسای یەکێتی یان بە یاسای هەرێم نەبێ باج ناسەپێنرێ و وەرناگیرێ و هەموار ناکرێت.

**ماددەی حەفتاوچوار:**

تەنها دەستەڵاتەکانی یەکێتی بۆیان هەیە باجی ناردەنی و هاوەردە(رەسمی گومرگ) بسەپێنن و وەری بگرن.

**ماددەی حەفتا وپێنج:**

دەسەڵاتەکانی هەرێم بۆیان هەیە ئەم باج ورەسم وکرێیانەی خوارەوە بسەپێنن:

یەکەم: باجی دەسهات(الدخل).

دووەم: باجی خانووبەرە.

سێیەم: باجی عەرەسە.

چوارەم: رەسمی تۆمارکردنی خانووبەرە.

پێنجەم: رەسمگەلی دادگاکان.

شەشەم: رەسمی ئیجازەگەل و مزووکرێی(الأجور)خزمەتەکانی وەک ئاوو کارەباو خزمەتی دیکە.

**ماددەی حەفتاو شەش:**

هەر هەرێمێ بەپێی رێژەی دانیشتووانی خۆی لە چاو(بالنسبە) کۆی دانیشتووانی وڵات، بەشی خۆی دەبێت لە داهاتی سامانی نەوت و رەسمگەلی گومرگ ومنحەو باربۆو قەرزی بیانی.

## دەروازەی شەشەم
## حوکمە کۆتایی و ئینتیقالییەکان

**ماددەی حەفتاوحەوت:**

ناشێ سنوورگەلی دوو هەرێمەکە هەمواربکرێن، بە ڕەزامەندیی ئەنجومەنی نیشتمانیی خودی هەرێمەکەو بە زۆرینەی سێ لە چواری ئەندامەکانی نەبێت.

**ماددەی حەفتاوهەشت:**

یەکەم: هاووڵاتیانی هەرێمی کوردستانی عێراق بە پێی ڕێژەی دانیشتووانی هەرێمەکە لەچاو کۆی دانیشتووانی کۆماری فیدراڵیی عێراقدا لە پلەوپایە گرنگەکانی وەزارەتەکان و دەستە یەکێتییەکانی ناوەوەو دەرەوە، بە تایبەتیش وەکیل وەزیرەکان و دەرەجە تایبەتەکان و بەڕێوەبەرە گشتییەکان دادەمەزرێن.

دووەم: هەر هەمان بنەما لەمانەی خوارەوەشدا ڕەچاو دەگیرێن:

١ـ دامەزراندنی سەفیرگەل و ئەندامانی سلکی دیبلۆماسی و کونسلی و نوێنەرانی یەکێتی لە دەستەو ڕێکخراوە نێودەوڵەتی و ئیقلیمیەکاندا.

٢ـ دامەزراندن لە پلەوپایەکانی هێزە چەکدارەکان و ئاسایشی فیدراڵیدا.

٣ـ هاوبەشی کردن لە شاندە ڕەسمیەکانی عێراق و ئەو موفاوەزانەشدا کە بۆ ڕێکەوتننامەگەلی نێودەوڵەتی ئەنجام دەدرێن.

٤ـ وەرگرتنی قوتابیان بۆ بیعسەو زەمالەو ئیجازەکانی خوێندن لە دەرەوە.

٥ـ وەرگرتنی قوتابیان لە ئەکادیمیاو کۆلێژەکانی سوپاو پۆلیس و خولەکانیاندا لە ناوەوەو دەرەوە.

**ماددەی حەفتاو نۆ:**

یەکەم: هێزەکانی پێشمەرگەو پێکهاتەکانی ئێستایان دەبنە بەشێک لە هێزە چەکدارەکانی هەرێمی کوردستان.

دووەم: ڕۆڵەکانی هەر هەرێمەو لە خودی هەرێمەکەی خۆیاندا خزمەتی سەربازی دەکەن.

**ماددەی هەشتا:**

یەکەم: هەموو ئەو یاساو بڕیارو مەرسوم و فەرمان و پێڕۆو ڕێنماییگەلەی لە دەسەڵاتەکانی مەرکەزییەوە لەبارەی ڕەفتاروکرداری پاکسازیی ڕەگەزی و ڕەوپێکردن و ڕاگواستنەوە دەرچووە هەر هەمووی ئیلغا دەکرێن.

دووەم: ئاسەوارەکانی گۆڕینی واقیعی نەتەوەیی کە لە ناوچەگەلێکی هەرێمی کوردستاندا بەرکار خراوە لادەبرێن و، هاووڵاتیە کوردەکانی ناوچەگەلی پارێزگای کەرکوک و مەخموورو شنگاڵ و زەممارو شێخان و خانەقین و مەندەلی و ناوچەگەلی تریش دەبرێنەوە بۆ جێگاکانی دانیشتنی پێشووی خۆیان و، ئەو هاووڵاتیە عەرەبانەش کە لەلایەن دەسەڵاتەکانی پێشتری عێراقەوە لەو ناوچانەدا نیشتەجێ کراون دەبرێنەوە بۆ جێگاکانی دانیشتنی پێشووی خۆیان لە دەرەوەی هەرێمی کوردستان.

سێیەم: حوکمی بڕگەی یەکەمی سەرەوە هاووڵاتیانی ڕەوپێکراوی تورکمان و ئاسوری و کلدانیش دەگرێتەوە.

چوارەم: هەموو ماڵ ودارایی گواستەنی و ناگواستەنی دەدرێتەوە بە هاووڵاتیە ڕەوپێکراوەکان و قەرەبوویەکی عادیلانەی ئەو زەرەرو زیانانەش دەکرێنەوە کە لێیان کەوتووە.

پێنجەم: کوردە فەیلیە ڕەوپێکراوو دوورخراوەکان دەبرێنەوە بۆ جێگاکانی دانیشتنی پێشووی خۆیان و جنسیەی عێراقی و ماڵ ودارایی گواستەنی و ناگواستەنییان پێ دەدرێتەوەو قەرەبویەکی عادیلانەی ئەو زەرەرو زیانانەش دەکرێنەوە کە لێیان کەوتووە.

شەشەم:

أـ ئاشکراکردنی چارەنووسی بزرکراوان قوربانیانی ئەنفال و بارزانیەکان و فەیلیەکان و هەموو عێراقیە بزرکراوەکانیش.

ب ـ قەرەبوکردنەوەی قوربانیانی چەکی کیمیایی لە کوردستاندا، هەروەها قەرەبوکردنەوەی ئەو زەرەرو زیانە ماددی و مەعنەویانەی لەو بزرکراوانە کەوتووە کە بڕگەی(أ)ی سەرەوە دەیانگرێتەوە.

ج ـ فەراهەم کردنی زەمانەگەلی کۆمەڵایەتی و تەندروستی بۆ خاووخێزانی ئەوانەی هەردوو برگەی(أ، ب)ی سەرەوە دەیانگرێتەوەو بۆ کەم ئەندامەکانیش لە قوربانیانی چەکی کیمیایی.
د ـ فەراهەم کردنی زەمانەگەلی کۆمەڵایەتی و تەندروستی بۆ ئەو عێراقیانەی کە بە دەستی دەزگا ئەمنیەکان تووشی کەم ئەندامیی لەش بوون بەهۆی ئەشکەنجەدانی لەش یان دەرونییانەوە.
هـ ـ ئەوانەی بەرپرسن لە ئەنجامدانی ئەو جەریمانەی دەرهەق بەو کەسانەی کە حوکمەکانی ئەم ماددەیە دەیانگرێتەوە، هەواڵەی دادگای تایبەت دەکرێن.

**ماددەی هەشتاویەک:**

ئەم دەستورە بە بەرزترین یاسای وڵات دادەنرێ و هەر یاسایەکیش بە پێچەوانەی ئەم دەستورە دەربهێنرێ بە باتڵ لە قەڵەم دەدرێت.

**ماددەی هەشتاودوو:**

یەکەم: بە رەزامەندیی سێ لە چواری ئەندامانی هەریەکە لە پەرلەمانی یەکێتی و ئەنجومەنی هەرێمەکان، بەجیا، نەبێ، ناشێ حوکمەکانی ئەم دەستورە هەموار بکرێن.
دووەم: ئەم لایەنانەی خوارەوە مافی پێشکەش کردنی پێشنیازیان بۆ هەموارکردنی ئەم دەستورە هەیە:
١ـ ئەنجومەنی وەزیرانی یەکێتی.
٢ـ ژمارەیێ لە چواریەکی ئەندامانی پەرلەمانی یەکێتی کەمتر نەبێت.

**ماددەی هەشتاوسێ:**

کۆماری فیدراڵیی عێراق، بەرامبەر بە هەیئەتی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆین دەبێ(تلتزم)کە زەمانەتی ماف و سنورو دەسەڵاتەکانی هەریەکە لە دوو هەرێمەکە بکات کە دەقەکانیان لەم دەستورەو دەستورە هەرێمیەکاندا هاتوون، هەروەها بۆین دەبێ زەمانەتی ئەو پێڕۆ دیموکراتیە بکات کە بەپێی ئەم دەستورە

دامـــەزراوەو حـورمـــەتی بنەمـــاکـــانی بگرێ و، هەر لادانێکیش لەوانەی لەم مـــاددەیەدا هاتوون، بە هەڕەشــە کـردن لە ئاســایش و ئاشـتـــیی نێسودەوڵەتی دادەنرێت.

**ماددەی هەشتاوچوار:**

بە رەزامەندیی دەسەڵاتی یاسادانانی هەریەکە لە هەردوو هەرێمەکە نەبێ، ناشێ نە کـەیانی کـۆمـاری فـیـدراڵیی عـێـراق و نە ئەو پێـڕۆ سـیـاسـیـەشی کـە لەم دەسـتـوورەدا نیـشـان دراوە بگۆڕدرێت دەنا بە پێـچـەوانەشـەوە، گـەلی هەرێـمی کوردستان بۆی هەیە، مافی چارەنووسی خۆی بە دەستی خۆی پیادەبکات.

## پاشکۆی ژمارە «٢١»

**بەڕێز سەرۆکی حکومەتی کاتیی عێراقی**
**بەڕێزان ئەندامانی حکومەتی کاتیی عێراق**
**بەڕێزان سەرپەرشتیارانی هەڵبژاردنە گشتییەکانی عێراق**
**بەڕێزان ئەندامانی ئەنجومەنی نیشتمانی عێراق**
**هەموو ڕێکخراو و هێزو پارتە سیاسییە نیشتمانییەکان وکەسایەتییە عێراقییە بێلایەنەکان.**
**بەڕێزان ئەندامانی ئەنجومەنی شارەوانی پارێزگای کەرکوک**

سڵاو ڕێز
لەم ڕۆژە دژوارانەدا کە شاری کەرکووکی کوردستانی پێدا تێپەڕ دەبێت و لە سایەی تێکچوونی بارودۆخی ئاسایش تێداو درێژەکێشانی کردەوە تیرۆریستیەکان کە لەلایەن هێزی تاریکی دژ بە خەڵکی مەدەنی ئەو شارە ئەنجام دەدرێن و بە تایبەتیش خەڵکی کورد وەکو کوشتن و ترساندن و تێکدانی ئاسایشی خۆیان و ماڵ و منداڵیان و موڵک و داراییان، حکومەتی عێراقی هیچ هەنگاوی ئیجابی هەڵنەهێناوە بەرەو چارەسەر کردنێکی دادپەروەرانەی کێشەی کەرکووک کە کورد بە گرفتی سەرەکی و ژمارەیەکی خۆیانی دەزانن، ئەوەتا ئێش و ئازاری خەڵکەکەی درێژەیان هەیە کە لە سەردەمی ڕژێمە دیکتاتۆرییەکانەوە دەستی پێکردووە بە تایبەتیش ڕژێمی سەدام.
بە بۆچوونی ئێمە دواکەوتنی حکومەتی عێراقی لە چارەسەر کردنی کێشەی کەرکوک و سووربوونی کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردن لەسەر ئەنجامدانی هەڵبژاردنی شارەکە بەر لە جێبەجێ کردنی ماددەی ٥٨ی یاسای کاتیی بەڕێوەبردنی دەوڵەت سەرەڕای تێپەڕبوونی کاتی پێویست بۆ جێبەجێ کردنی، گرفتەکە ئاڵۆزتر دەکات و تەنها بە خۆدزینەوە لە ناوەڕۆکی ماددەی ناوبراو لەقەڵەم دەدرێت کە تایبەتە بە ئاسایی کردنەوەی بارودۆخی کەرکووک، هەروەها بە پشت گوێ خستنی رای زۆرینەی زۆری ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک و دانیشتوانە رەسەنەکانی کەرکوک لە کورد و تورکمان و کلدان و ئاشوورییەکان حساب دەکرێت و دژی سادەترین

پرنسیپەکانی مافی مرۆڤ و شێوازە دیموکراتییە هیوا بۆ خۆزراوەکەیە، هاوکات ئاماژەشە بە ئەوەی کە حکومەتی عێراق ئارەزوویەکی راستەقینەی نییە بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکە کە بەرەو ئالۆزبوونی زیاتر دەچێت و بۆنی شەڕی ناوخۆیی لە هەر کاتێکدا لێ دێت کە بێگومان کارەساتێکی گەورەی لێ دەکەوێتەوە، ئەمەش لە کاتێکدایە کە عێراقییە دڵسۆزەکان بە هەموو نەتەوەو تایفە جیاجیاکانیانەوە چاویان بڕیوەتە بەشداری کردنێکی چالاک لە پرۆسە سیاسییەکەو بونیاتنانەوەی کۆمەڵگای مەدەنی کە لەسەر بنەمای دیموکراتییەتی راستەقینە و سەروەریی یاسا بونیات نرابێت.

ئێمەش لە کاتێکدا کە نیگەرانی خۆمان سەبارەت بە ئالۆزبوونی بارودۆخی کەرکوک نیشان دەدەین، ئەم داواکارییانەی خوارەوە دەخەینە پێش چاوتان بە هیوای ئەوەی بە بایەخەوە سەیر بکرێن بۆ بەرژەوەندی هەموو عێراقییەکان و کوژاندنەوەی ئاگری گرفت و کێشەکە.

١ـ راگرتنی هەڵبژاردن لە پارێزگای کەرکووک تا ئەو کاتەی بارودۆخەکەی ئاسایی دەکرێتەوەو ماددەی ٥٨ی یاسای کاتی بەڕێوەبردنی دەوڵەت کارا دەکرێت لە رێگای کاری جیددی و خێرا لەلایەن حکومەتی ئێستاو پارتە سیاسییەکانی کوردستانی عێراق بە مەبەستی لابردنی هەموو شێوازو ئاسەوارەکانی تەعریب و کارئاسانی کردن بۆ گەڕاندنەوەی کوردە دەرکراوەکان بۆ سەر ماڵ و حاڵی خۆیان.
٢ـ گەڕاندنەوەی عەرەبە هاوردەکان کە رژێمی پێشوو لە ناوەڕاست و باشووری عێراقەوە هێنابوونی بە رەچاو کردنی بارودۆخی مرۆییان بەو حوکمەی کە هاوولاتی عێراقین و هەڵخەڵەتێنراون لەلایەن رژێمی سەدامەوە کە بۆ ژەهراوی کردنی پەیوەندی برایانەو مێژوویی نێوان نەتەوەکانی عێراق بە کاری هێنابوون، چونکە مانەوەی ئەوانە لەسەر ماڵ و موڵک و کێڵگەی خەڵکی تر کارێکی ناڕەوایەو بە داگیرکردن لەقەڵەم دەدرێت کە هیچ عورفێکی ئاسمانی یان یاسای زەمینی پێی رازی نابێت.
٣ـ قەرەبوو کردنەوەی ماددی و مەعنەوی بۆ زەرەر لێکەوتووان.

٤- گەڕانەوەی یەکە ئیدارییەکان لە ناحیەو قەزاو شارۆچە، ئەوانەی لە کەرکووک دابڕاون و خراونەتە سەر پارێزگاکانی تر بە مەبەستی گۆڕینی سنووری ئیداری کەرکووک و دیموگرافیای شارەکە وەکو:
چەمچەماڵ، توزخورماتو، کفری، کەلار و قادرکەرەم.
شایانی وتنە لە کۆی ٥ قەزا کە پارێزگای کەرکووکیان پێک دەهێنا لە ماوەی دەیان ساڵی رابردوودا، چواریان کە زۆرینەی دانیشتووانەکانیان کوردە لە پارێزگاکە دابڕاون و تەنها قەزای حەویجە مایەوە کە زۆربەی دانیشتووانەکەی عەرەبن.

٥- ئەنجامدانی سەرژمێرییەکی خاوێن لە دوای ئاسایی کردنەوەی باری شاری کەرکووک بەر لە ئەنجامدانی هەڵبژاردنی ناوخۆیی شارەکە، تا ئەنجامی دادپەروەرانەو راستەقینەی هەڵبژاردن بە دەستەوە بدات.

٦- هەموارکردنی برگەی ١ لە ماددەی ١٠ی یاسای چارەسەرکردنی کێشەکانی تایبەت بە موڵک و عەقار و دانەنانی کاتێکی دیاریکراو بۆ پێشکەش کردنی داواکارییەکان وەکو ئەوەی لەو برگەیەدا هاتووە، چونکە هێشتا دەیان هەزار لە زەرەرمەندان نەیانتوانیوە داواکاری خۆیان پێشکەش بە دەزگای تایبەت بە چارەسەر کردنی گرفتی موڵک و عەقار بکەن و ماوەکەش لە ٢٠٠٤/١٢/٣١ بە کۆتا دێت، ئەمەش کارێکە قبوڵ ناکرێت.

٧- ئەنجامدانی لێپرسینەوە لەگەڵ ئەوانەی تاوانی تەعریبیان کردووە دژ بە کوردی کەرکووک و کارکردنی جیددی لە پێناو دانانی سنوورێک بۆ ئەو تاوانانەی کە ئێستا پاشماوەکانی رژێمی بەعس و گروپە تیرۆریستیەکان دژ بە هاووڵاتیانی کورد لە کەرکووک ئەنجامی دەدەن و ئەو گەڕەکانە بە کار دێنن کە رژێمی پێشوو دروستی کردبوون لە چوارچێوەی سیاسەتی تەعریب وەکو حەشارگە.

٨- بە توندی ئیدانەی ئەو کارەی بەرپرسی نووسینگەی کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆیی هەڵبژاردن لە کەرکووک دەکەین کە ١٧٠ هەزار کەس لە کوردی دانیشتووی پارێزگای کەرکووکی لە مافی سروشتی خۆیان لە بەشداری کردن و دەنگدان لە هەڵبژاردنە چاوەڕوانکراوەکەدا بێبەش کردووە، ئەمەش نیشانەی

ناپاکی و بێلایەن نەبوونی کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنە لە عێراقدا و داواکارین کە لەم بارەیەوە، لێکۆڵینەوەی پێویست ئەنجام بدرێت لەگەڵ دووپات کردنەوەی داواکارییەکەمان بۆ راگرتنی هەڵبژاردن لە کەرکوک.

٩ـ ئەگەر ئەم داواکاریانەمان بە هەند هەڵنەگیرێن، ئەوا داوا لە کوردو هێزو بزووتنەوە سیاسییە نیشتمانییەکان و هەموو لایەنگرانی کێشەی کورد دەکەین هاوکاریمان بکەن و هەموو رێگاو شێوازە ئاشتییانەکان بگرنەبەر بۆ دەربڕینی رای خۆمان و بەرگری کردن لە مافی رەوامان، ئەویش بە بایکۆت کردنی هەڵبژاردن لە کەرکووک و ئەنجامدانی خۆپیشاندانی ئاشتییانە لە بەردەم باڵیۆزخانەکان و رێکخراوە نێودەوڵەتی و مرۆییەکان لە سەرانسەری جیهاندا.

**لەگەڵ رێزو تەقدیر**

ئیمزا/

- کۆمەڵەی دۆستانی کورد- سوید- ستوکهۆڵم
 لیژنەی هەماهەنگی پارتە کوردی و کوردستانییەکان لە سوید
- یەکێتی کۆمەڵە کوردییەکان- فدراسیۆن- سوید
- کۆمەڵەی لاوانی کوردی- سوید
- کۆمەڵەی قوتابیانی کوردستان- سوید
- لیژنەی راپرسی - ریفراندۆم- سوید
- کۆمەڵەی گوماک
- سەنتەری هەڵەبجە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەنفال و جینۆسایدکردنی گەلی کورد- جاک- لقی سوید
- کۆمەڵەی هیوای کوردستان- سوید
- کۆمەڵەی کورد بۆ لاوان- سوید

---

سەرچاوە: رۆژنامەی «خەبات» ژمارە «١٦٦٥»ی رۆژی ٢٠٠٤/١٢/٣٠

## پاشکۆی ژماره «٢٢»

**بەڕێز سەرۆکی کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی عێراق**

پاش سڵاوو ڕێز

ترەستی کەرکووک بۆ لێکۆڵینەوە، کە ناوەندێکی ناحکومی و ناحزبییە خۆی بە بەختیار دەزانێ هەندێک ڕووداوی تایبەت بە ڕەوشی شاری کەرکووک و دەوروبەری بخاتە بەردەستتان بەئامانجی دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەکی گونجاو بۆیان بەر لەوەی کێشەکان گەورەبن، نەخاسمە چەند دەستێک هەن ژێراوژێر کاردەکەن و خێریان بۆ عێراق و بەرقەراربوونی ئاشتی و تەناهی عێراق ناوێت.

ئێوە زۆر چاک دەزانن ڕژێمی پێشوو لەمیانەی ساڵانی دوورودرێژییەوە پراکتیزەی سیاسەتی پەردە لەروو داماڵێراوی پیادەکردووە، کە ئامانج لێی گۆڕینی واقیعی نەتەوەیی و دیموگرافی ناوچەی کەرکووک بوو، لەپێناو بەجێگەیاندنی ئەم سیاسەتەش، ڕژێم ژمارەیەک بڕیاری دەرکردووە، کە زۆربەیان لەرۆژنامە ڕەسمییەکاندا بڵاوبوونەوە، ئەوە لەپاڵ بڕیارە نهێنییەکانی دیکەو فەرمان و ڕێنوێنییەکانی دیکەی دەرچوو لە لایەن بەناو (مەجلیسی قیادەی سەورە)و (لیژنەی کاروباری باکوور)و(مەجلیسی ئەمنی قەومی)و دایەرەی ئەمن و موخابەرات و ئیستیخباراتی سەربازی، ئەمانە هەر هەموویان دووپات لەسووربوون و مکوڕبوونی ڕژێم بۆ تەرحیلکردنی کوردو تورکمان دەکەن لەو ناوچانەداو تەوتین کردنی عەرەب لەشوێنیاندا، ئەوانەی لەکەرکووک و دەوروبەری پێیان دەگوترێ (عەرەبە هاوردەکان)، ئەو جۆرە پراکتیزانەش کە بەشێوەیەکی تایبەتی بەزۆر تەرحیلکردنی دانیشتوانی گرتەوە، دەچنە خانەی جینۆساید، کە ڕێککەوتننامەی پاریس لە ٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٦ ڕێساکانی تەنزیم کردووە.

پێش ڕووخانی ڕژێم، هێزە سیاسی و ڕێکخراوە کوردستانییەکان داوایان لەهێزە سیاسییە بەرهەڵستکارەکانی ڕژێم دەکرد، سەرکۆنەی ئەو سیاسەتە بکەن بەوەی کاریگەری خراپ لەپەیوەندی مێژوویی نێوان عەرەب و کورد دەکات، کە ڕژێم زۆر بەچڕی کاری بۆ تێکدان و دارمانی دەکرد، ئەو سیاسەتە ڕەگەزپەرستانەی حزبی بەعس لەماوەی پتر لە ٣٠ ساڵ پراکتیزەی کردووە، ئێستاش ئەوە دەهێنێ لە لایەن

تەواوی هێزو لایەنە سیاسییەکان و حکومەتی عێراقییەوە کە نوێنەری زۆربەی ئەو لایەنانەی تێدایە، بە ئاشکرا سەرکۆنە بکرێت، ئێوە دەزانن قانوونی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی گواستنەوە، بۆ چارەسەرکردنی شوێنەواری ئەو سیاسەتانە دەقێکی تێدایەو حکومەت پابەند دەکات هەنگاوی کارا بهاوێژێ بۆ کۆتایی هاتن بە شوێنەوارەکانی و چارەسەرکردنی کێشەکانی لێی کەوتۆتەوە.
بەڵام بەداخەوە ناچارین بڵێین؛ تائێستا حکومەتی عێراق هیچ هەنگاوێکی کردەنی بۆ جێبەجێکردنی ئەو پابەندبوونانە نەناوە کە بەپێی قانوونی ناوبراو لەئەستۆی دایە- ئەو دەیان هەزار خانەوادەی لەکەرکووک دەربەڕێندراون پاش چەندین ساڵی دووره زێدو هەوار، کە ئێستا گەڕاونەتەوە، بەڵام هێشتاش لەژێر خێوەت دەژین و حکومەتی عێراق هیچ یارمەتییەکی نەداون، کە شایەنی ئاماژەپێدان بێت- خۆ ئەگەر ئەو برە یارمەتییە نەبووایە کە حکومەتی هەرێمی کوردستان بەهاوکاری هەندێک رێکخراوی نێودەوڵەتی بۆی فەراهەم کردوون، ئەوە کەوتبوونە بەر هەڕەشەی برسێتی و مردنی لەسەرخۆوە، ئەوانە تەنها بەرووخانی رژێم لەچاوەڕوانی گەڕانەوە بۆ زێدی خۆیان بوون، بەڵام ئەوەتە پتر لە ساڵێک و نیو بەسەر رووخاندنی رژێم تێپەڕیووە، کەچی گەڕاوەکان لەژیانێکی کۆڵەمەرگی دەژین، وەک ئەوەی ئامـاژەمـان پێـدا، هەرچی ئەوانی دیکەشن لەچاوەڕوانی گەڕانەوەدان بێ ئەوەی تائێستا حکومەتی عێراق دەستی یارمەتی بۆ درێژکردبن.
هەندێک هێزی سیاسی کوردستان هەوڵێکی زۆریاندا کە بەجەماعی نەگەڕێنەوە شارەکەیان، لەبەر ئەو گرفتانەی بۆ هەموو لایەک لێی دەکەوتەوە، نەخاسمە بۆ حکومەت و هێزی هاوپەیمانان، بەڵام سەبریش سنووری خۆی هەیەو لەمەودوا کەس ناتوانێ رێگە لەگەڕانەوەیان بگرێ، چونکە مافێکی رەوای خۆیانەو ماوەیەکی زۆریشە بە پەرۆشە چاوەڕێی گەڕانەوەن.
پاش راگەیاندنی ئەنجامدانی هەڵبژاردن لەعێراق، هەموو لایەک پێشبینی ئاساییکردنەوەی ئەو بارودۆخە نالەبارەیان دەکرد کە رژێم لە کەرکووک و دەوروبەری دروستی کردبوو، بۆ ئەوەی هەموو بتوانن بەشداری تێدابکەن و ببێتە دەروازەیەک بۆ رادەربڕین و ویستی خەڵکە رەسەنەکەی، بەڵام جارێکی دیکە رۆڵەکانی کەرکووک لەشارەکەی خۆیاندا، خۆیان بەنامۆ دیتەوە، چونکە بۆ زۆربەیان ئاسانکاری نەکراوە تا بەشداری لە هەڵبژاردنەکان بکەن، بەڵکو بەپێچەوانەوە نووسینگەی پارێزگای

کەرکووک بۆ هەڵبژاردنەکان گرفت و کێشەی بۆ دروست کردوون، ئەوە لەکاتێکدا کارئاسانی بۆ غەریب و غەوارەان، ئەوانەی لەو ناوچەیە تەوتین کراون، کردووە، هەموو لایەک بەدامەزراندنی بەڕێز عزەدین محەمەد شەفیق ئەلمحەمەداوی بە ئەندامی کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکان لەعێراق حەپەسان، چونکە تا رووخانی رژێم سەرۆکی لقی کەرکووکی کۆمەڵەی مانگی سووری عێراقی بوو، ئێوەش چاک دەزانن ئەو کەسەی لەو شوێنانە بکرابایە بە بەرپرس لەسەردەمی رژێمی دیکتاتۆردا، دەبوایە بەشێک بێت لە دەزگا داپلۆسێنەرەکانی رژێم، هەروەها کۆمسیۆنی باڵای هەڵبژاردنەکان بەرپرسارییەتی نووسینگەی کەرکووکی بۆ هەڵبژاردنەکان بە دکتۆر مکەڕەم عەبدولمەجید سپارد، بەڵام دوای ماوەیەکی کورت بەهۆی ئەو مەترسیانەی لەسەر ژیانی هەبوو، دەستی لەکارکێشایەوە، هەروەها بە بەڕێز نیهاد زەینەڵی یاریدەدەرەکەی سپارد، کە لەسەردەمی رژێمی پێشوو لەرێکخراوی مانگی سوور لقی کەرکووک جێگری بەڕێز عزەدین ئەلمحەمەداوی بوو، ئەو دوو بەڕێزەش: زەینەڵ و عزەدین ئەلمحەمەداوی دوو کەسی شیاو نەبوو بۆ ئەو ئەرکە پڕ لە مەسئولییەتە، چونکە ئەو دووانە بێلایەن نین و خاوەن رابردوویەکی پاک نین، هەروەها رۆڵێکی گەورەی گێڕا لە دامەزراندنی کۆنەبەعسییەک لەجێگەی دکتۆر مکەڕەم-ی دەست لەکارهەڵگرتوو، چونکە بەهاوکاری بەڕێز عادل ئەللامی، سەرۆکی دایەرەی هەڵبژاردن لەکۆمسیۆن و ئەندامی ئەنجومەنەکەی لەکاتی وجودتان لەدەرەوەی عێراق دەستپێشخەری کرد بۆ ئەوەی پارێزەر یەحیا سالّح ئەلحەدیدی، ئەندام فیرقەی حزبی بەعسی پێشوو، هەروەها عضو عامل تا رووخانی سەدام دابمەزرێت، هەروەها ناوبراویش پارێزەر بوو لە دایەرەی ئەمنی کەرکووک و زۆریشی سوود لە (خێرو بێرەکانی) رژێم وەرگرتووە، ئەویش بەهاوکاری لەگەڵ ئەو کەسانەی ناومان هێنان بەشدارییەکی باشی کرد لەدامەزراندنی کارمەندانی نووسینگەی کەرکووک تەنها لەماوەی دوو رۆژدا، زۆربەشیان یا ئەندامی حزبی بەعسی پێشوو بوون یا هاوکاری رژێم بوون تا رووخانی، پارێزەر یەحیا ئەلحەدیدی بەر لەچەند رۆژێک دەستی لەکار کێشایەوەو، پاش ئەوەی هەرچییەکی گەرەکی بوو جێبەجێی کرد، بەوەی زۆربەی سەرەک بەشەکان و کارمەندو بەرپرسانی بنکەکانی تۆمارکردنی هەڵبژادنی لەپارێزگاکەدا لەو کەسانە دانا کە یا ئەندام یاخود نزیکی حزبە توندڕۆکان یا هاریکاری رژێم بوون تا رۆژی رووخانی، بەپێچەوانەی رێنوێنییەکانی کۆمسیۆن،

لەو رۆژەی ئەوانە دەست بەکاربوونە دەستیان داوەتە دروستکردنی ئاستەنگ لەبەردەم دەنگدانی کورد، ئەوانەی دەخوازن فۆرمەکان هەڵەکانیان راست بکەنەوە یا نەقلی پارێزگای کەرکووکی بکەن، لەئەنجامدا دەرفەت نەدانی لێکەوتەوە لەبەردەم ژمارەیەکی زۆر لەوانە بۆ تۆمارکردنی ناوەکانیان لە بنکەکانی تۆمارکردن کە ژمارەیان بەپتر لە ٧٠٠٠٠ کەس تەنها لەناو شاری کەرکووک مەزەندە دەکرێ، لە ئامرازە پێچاوپێچەکانی ئەو بەرپرسانە پەنایان بۆ بردووە بۆ بەجێگەیاندنی (ئەرکە) پیشەییەکەیان، دابەشکردنی فۆرمی ژمارە ٢ و ٣ی تایبەت بە راستکردنەوەو گواستنەوەبوو بە ژمارەیەکی زۆر کەم لە بنکەکانی تۆمارکردنی ٣٩٢، ٣٩٣، ٣٨٧، ٣٩٥، کە دەکەونە گەڕەکەکانی کوردو تورکمان، بەشێوەیەک بەچەند سەعاتێک نەدەما، بەڵام ژمارەیەکی یەکجار زۆریان بۆ بنکەکانی ٣٩٩، ٣٩٨، ٤٠٠، ٤٠١، ٣٨١، ٣٨٦، ٣٨٩، دابینکرد کە دەکەوێتە قەزای حەویجەو ئەو گەڕەکانەی عەرەبە هاوردەکان لەناو شاری کەرکووک لێی نیشتەجێن.

دەزانین ئەو بنەمایەی بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردن پشتی پێ بەستراوە، لیستی تایبەت بە کۆبۆنی خۆراکە، بەڵام ژمارەیەک لەو یەکە ئیداریانەی کە رژێم تەختی کردبوون و خەڵکە رەسەنەکەی لێ دەرپەڕاندبوون، پاش ئازادی عێراق گەڕاونەتەوە، وەک ناحیەی قەرەهەنجیر، شوان، سەرگەڕان، کە سەر بە ناوەندی قەزای کەرکووکن، بەڵام خەڵکی ئەو ناحیانە لەبنەڕەتەوە لەتۆمارە تایبەتییەکانی وەرگرتنی خۆراک لەکەرکووک تۆمارنەکراون، لەبەر ئەوە ناویان لەلیستی دەنگدەراندا نییە، هەروەها بەرپرسانی دیکەش لەهەندێک بنکەی تۆمارکردن (داهێنانیان) کردووە لە دروستکردنی ئاستەنگی دیکە لەبەردەم هاووڵاتیانی کورد بە پیشاندانی شایەدحاڵی دەرچوو لەپارێزگای کەرکووک کە لاگیری بکات خەڵکی کەرکووکن، ئەوە سەرەڕای پیشاندانی ناسنامەی باری شارستانی کە لاگیری دەکات ئەوانە خەڵکی کەرکووکن، هەروەها ژمارەیەکی زۆر دەرفەتیان نەدرا بگەنە تەلاری پارێزگای کەرکووک بەهۆی ئەو پاراستنە ئەمنییەی تەوقی تەلارەکەی پێ دراوە، لەکاتێکدا بەرپرسانی بنکەکانی تۆمارکردن لەناوچەکانی دیکەی پارێزگا کە داوایان لە کەس نەکردووە شایەدحاڵ پیشان بدات.

ئاشکرایە هەتاکو ساڵی ١٩٧٦ پارێزگای کەرکووک قەزکانی چەمچەماڵ و کەلارو کفری و دوزخورماتووی بە خۆوە دەگرت، کە زۆرینەی دانیشتووانەکەیان کوردن،

بەڵام بە مەبەستی کەمکردنەوەی ڕێژەی کورد لە پارێزگاکەدا، ڕژێمی پێشوو هەردوو قەزای چەمچەماڵ و کەلاری خستە سەر پارێزگای سلێمانی و قەزای کفری خستە سەر پارێزگای دیالەو، هەروەها قەزای دوزخورماتوشی لکاند بە پارێزگای تکریتەوە، هەرچەندە لەو پارێزگایەشەوە دوورە، ئیتر دانیشتوی ئەو قەزایانە لە چوارچێوەی پارێزگا تازەکانیان دەنگدەدەن، نەک لە چوارچێوەی پارێزگای کەرکوک کە ئەو قەزایانە لە سەردەمی عوسمانییەکانەوە سەر بە ئەو بوون. دانیشتووانی ئەو قەزایانەش لەوەتای ڕژێمی سەدام ڕووخاوە داوای گەڕاندنەوەی قەزاکانیان دەکەن بۆ سەر کەرکووک، بەڵام ئەو کارە نەکراوەو لە ئەنجامیشدا بووەتە مایەی دروستبوونی گرفت بۆ سەرپەرشتیارانی پرۆسەی هەڵبژاردن نەک تەنها لە پارێزگای کەرکووک، بەڵکو لەو پارێزگایانەش کە ئەو قەزایانەیان پێوە لێکندراوە، ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە ئەم گرفتە چارەسەر بکرێت کە دەستکردی دژێمی پێشووە.
ئەنجومەنی پارێزگای کەرکووکیش داوای ئاساییکردنەوەی بارودۆخی کەرکووکی کردووە، هەروەها داوای هەنگاوی کردەنی لە لایەن حکومەتەوە کردووە بۆ جێبەجێکردنی ماددەی ٥٨لە یاسای کاتیی بەڕێوەبردنی دەوڵەت، خۆدزینەوەی حکومەتیش لە ئەنجامدانی ئەرکەکانی، ئەنجومەنی پارێزگای کەرکووکی ناچارکرد داوای دواخستنی هەڵبژاردنی تایبەت بە ئەنجومەنی پارێزگاکە بکەن بۆ ماوەیەکی کورت، بەڵام بەداخەوە ئەنجومەنی کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردن بەم داواکارییە ڕازی نەبوو، هەرچەندە داواکارییەکە دژ بە بڕیاری ئەنجامدانی هەڵبژاردنی گشتی لە مانگی یەکەمی ٢٠٠٥دا نەبوو.
دیارە دواخستنی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکووک بۆ ماوەی ٦ مانگ بە مەبەستی ڕەخساندنی دەرفەت بۆ حکومەت تا ئیجرائاتی پێویست بە جێبەجێ کردنی ماددەی ٥٨ ئەنجام بدات، دژ بە پرۆسەی هەڵبژاردن لە عێراق نییە، چونکە ئەم دواخستنە کاریگەری سلبی لەسەر پرۆسەکە نابێت.
ئەمەو لە ١٥/١١/٢٠٠٤ نوێنەری زۆربەی پارت و هێزە سیاسییەکانی پارێزگای کەرکووک کیانێکی سیاسییان دامەزراندن کە نوێنەری هەموو نەتەوە براکانی کەرکووک بەشدارییان تێداکرد، ئەمەش مانای وایە کە نیازی بەشداربوونیان لە هەڵبژاردنەکەدا هەبووە، بەڵام دواکەوتنی بە ئەنقەستی حکومەت لە جێبەجێکردنی ئیلتیزاماتە یاساییەکانی خۆی لەگەڵ هەڵسوکەوتە چەوتەکانی نووسینگەی

کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردن لە پارێزگای کەرکووک، ناچاری کردن کە بڕیاری بەشداری نەکردن بدەن، ئەگەر بێت و داواکارییەکەیان سەبارەت بە دواخستنی هەڵبژاردن جێبەجێ نەکرێت، ئەم بڕیارەش لە لایەن جەماوەری پارێزگاکەوە کە زۆربەیان تووشی سەرکوتکردن و تەرحیل و دەرکردنی بە زۆر لە سەردەمی رژێمی پێشوودا هاتوون، پشتگیری لێدەکرێت.
ئێمە ئەم راستییانە دەخەینە پێش چاو بەمەبەستی چارەسەرکردنیان بەر لەوەی گرفتەکان گەورەتر بن و بگەنە ئاستێک کە چارەسەرکردنیان لە ئایندەدا زەحمەت بێت، هەروەها پشتگیری لە داواکاری ئەنجومەنی پارێزگای کەرکووک دەکەین سەبارەت بە دواخستنی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکە بۆ ماوەی شەش مانگ، چونکە ئەمە بە هیچ شێوەیەک کار ناکاتە سەر پرۆسەی هەڵبژاردن لە عێراقدا بە حوکمی ئەوەی دانیشتوانی پارێزگاکە بەشداری لە هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی عێراق دەکەن، کە حکومەتی داهاتووی عێراق دادەنێت و هەنگاوی پێویست جێبەجێ دەکات بەرەو ئامادە کردنی پرۆژەی دەستوور بۆ عێراقی ئاینده.
سەبارەت بە ئەنجومەنی پارێزگای کەرکووک، مەسەلەکە جیاوازە، بە تایبەتیش ئەم پارێزگایە رووبەڕووی بارودۆخی دژوار بووەتەوەو دەبێتەوە لەسەر هەردوو ئاستی نێوخۆیی و نێودەوڵەتی، بارودۆخی ئەم پارێزگایە ئاسەوارەکانی روودانی هەر رووداوێکی تێیدا وا پێویست دەکات کە بە حیکمەت و دووربینییەوە سەیری گرفتەکانی بکرێت، دیارە مێژووی تازەو دوورو واقیعی جوگرافی ناوچەکەو، هەروەها هەڵسوکەوتەکانی رژێمی پێشوو و هەوڵی پاشماوەکانی بۆ نانەوەی ئاگری فیتنە لەم شارە ئارامەدا، پێویستی بە هەماهەنگی هەیە بۆ چارەسەر کردنی گرفتەکانی بەر لەوەی چارەسەرەکە زەحمەت و دژوار بێت لە ئایندەدا، ئەمەش بەبێ دواخستنی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی شارەکە ناکرێ، بە تایبەتیش کە لیستێکی گشتگیری تایبەت بە رەگەزو نەتەوە جیاجیاکانی ئەم شارە لە ئارادە نییە، چونکە بە هۆی بڕیاری بەشداری نەکردنەوەی لیستێکی لەو جۆرە پێشکەش نەکراوە.
هەروەها داوا لە کۆمسیۆن دەکەین ئیجرائاتی پێویست ئەنجام بدات سەبارەت بە تۆمارکردنی ناوی ئەو دەنگدەرانەی کە تا ئێستا ناویان تۆمار نەکراوە، لەبەر ئەو هۆیانەی کە باسکران.

هاوکات چەند ژمارەیەک سەبارەت بە بارودۆخی کەرکووک و دەوروبەری دەخەینە پێش چاوتان:
بە پێی لیستی کۆمپانیای دابەشکردنی خۆراک لە کەرکووک بۆ مانگی تشرینی دووەم، ژمارەی دانیشتووانی ئەو شارە دەگاتە «١٠٣٠٢٤٣» کەس کە «٢١٦٤٦»یان منداڵی تەمەن خوار دوو ساڵانن، بەمەش ژمارەی دانیشتوانی، ئەوانەی تەمەنیان لە سەرەوەی دوو ساڵە دەگاتە «١٠٠٨٥٩٧» کەس، ئەگەر وا دابنێین ڕێژەی ٥٥ ٪ی ئەوانە مافی بەشداریکردنیان لە هەڵبژاردنەکان هەیە، ئەوا ژمارەی دەنگدەران دەبێتە «٥٥٤٧٢٨»کەس کە پێویستە فۆرمیان بەسەردا دابەش کرابێت، بەڵام ئەوەی ڕوویداوە دژ بەم ڕێژانەیە، چونکە نزیکەی (٤٥٠٠٠٠) فۆرم دابەشکراوە لە پارێزگاکەدا، ئەمەش بە مانای بێبەشکردنی «١٠٤٧٢٨»کەسە لە مافی دەنگدان، بێجگە لەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لەوانە بە هەڵە ناویان تۆمار کراوەو نەیانتوانیوە ناوەکانی خۆیان ڕاستبکەنەوە، بۆیە لەرووی کردەییەوە ئەوانیش لە مافی دەنگدان بێبەش بوون.
هەتاکو ٢٠٠٤/١٢/١٥یش ژمارەی ئەوانەی فۆرمی ژمارە(١)یان وەرگرتووە کە هەڵەی تێدایە «٤٨٩١»و ژمارەی فۆرمی ژمارە (٢) کە ڕاستکراوەتەوە «٣٦٨٥». کەچی ژمارەی فۆرمی ژمارە (٣) کە دابەشکراوەو تایبەتە بە گواستنەوەی شوێنی نیشتەجێبوون یان بە هۆی مردنی خاوەنەکانیان و یان سڕینەوەی ناویان لەبەر هەر هۆیەک بووبێت، گەیشتووەتە «١٠٨٤٠١» فۆرم، هەموو ئەمانەش ئەوە دەگەیەنن کە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵک ناویان لەو فۆرمانەدا نییە.
هاوکات حەزدەکەین ئاماژە بەوەبدەین کە ڕێژەی ئەو فۆرمانەی لە پارێزگاکانی هەرێمی کوردستان دابەشکراون و هەڵەیان تێدایە زیاتر لە ٨٢٪ لەهەولێر و ٢٠٪ لە سلێمانی و دهۆک. بەمەش ڕێژەیەکی زۆر لەدەنگدەرانی ئەو پارێزگایانە لە مافی دەنگدان بێبەش دەبن، دیارە هاووڵاتیانی هەرێمیش پرسیار لە هۆکاری ئەو دیاردەیە دەکەن کە بۆچی ئەو ڕێژە بەرزە لە هەڵەی (تەکنیکی) تەنها لە پارێزگاکانی هەرێم ڕوویانداوە، لە کاتێکدا کە (دەستەی باڵای هەڵبژاردن لە هەرێمی کوردستان) داوای لە کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردن لە عێراق کردووە، ئەو فۆرمانە ڕاست بکاتەوە بە دووبارە لە چاپدانەویان بە گوێرەی ئەو تۆمارە دروستەی کە لە

لایەتی، یان ماوەی راستکردنەوەی هەڵەکان درێژبکرێتەوە، بەڵام وڵامەکە بەرەتکردنەوە گەڕایەوە.
هەروەها کۆمسیۆن بە پێشنیاری دەستەی باڵای هەڵبژاردن لە هەرێمی کوردستانی عێراق رازی نەبوو سەبارەت بە بەشداری دانیشتووانی دەرەوەی هەرێم لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان کە مافێکی شەرعی خۆیانە.
ئێمە ئەم واقیعانە بۆیە دەخەینە پێش چاو تا بەو گیانە هاوکارییە کە لە ئێوە بینیومانە چارەسەر بکرێن، ئەوەی پێشنیاریشی دەکەین دژ بە یاسای کاتی بەڕێوەبردنی دەوڵەت و بڕیارەکانی تری تایبەت بە هەڵبژاردن نییە.
دیارە هەمووومان هەوڵ بۆ چارەسەر کردنی گرفتی گەورەی تایبەت بە شاری کەرکووک دەدەین کە هەتاکو خوانەخواستە ئەوەی کە دەستی شاراوە هەوڵدەدات بۆ دروستکردنی لەم شارە کە هەمیشە دانیشتووانەکەی بە خۆشەویستی و ئارامی ژیاون، روونەدات، نازانین کاریگەرە سلبییەکەی چۆن دەبێت.
ئیتر رێزو سڵاومان قبووڵ بفەرموون

**دکتۆر نوری تاڵەبانی**
**سەرۆکی ترستی کەرکووک**
**بۆ لێکۆڵینەوەو دیراسات**
هەولێر/٢٩/کانوونی یەکەمی ٢٠٠٤

---

سەرچاوە: رۆژنامەی «خەبات» ژمارە «١٦٧٠» و «١٦٧١»ی رۆژانی ٤و٥/١/٢٠٠٥

## پاشكۆی ژماره «٢٣»

### السيد رئيس المفوضية العليا المستقلة للانتخابات في العراق المحترم

بعد التحية والاحترام

يسر (مركز كركوك للبحوث والدراسات)وهو مركز غير حكومي او حزبي، ان يعرض لكم بعض الوقائع الخاصة بالوضع في مدينة كركوك و اطرافها، بهدف ايجاد حل مناسب لها قبل استفحال المشكلات فيها، خاصة وان ايادي تعمل في الخفاء لاتريد الخير للعراق ولا تريد توطيد الامن و الاستقرار في ربوعه.

تعرفون جيداً بأن النظام السابق قد مارس خلال سنوات طويلة، سياسة مكشوفة تستهدف تغيير الواقع القومي والسكاني لمنطقة كركوك. ولتنفيذ هذه السياسة، اصدر النظام عدداً كبيراً من القرارات نُشرت اغلبها في الجريدة الرسمية، بجانب قرارات سرية اخرى وأوامر وتوجيهات صادرة عن ما يسمى (بمجلس قيادة الثورة)و (لجنة شؤون الشمال) و(مجلس الامن القومي) واجهزة الامن و المخابرات والاستخبارات العسكرية، يؤكد جميعها عزم النظام واصراره على ترحيل الكورد والتركمان من تلك المنطقة، وتوطين العرب الذين اطلق عليهم اسم (الوافدين) في مدينة كركوك واطرافها. وتدخل تلك الممارسات التي شملت بوجه خاص الترحيل القسري للسكان، ضمن مفوهم جريمة الابادة البشرية التي نظمت احكامها اتفاقية باريس المبرمة في التاسع من كانون الاول عام، ١٩٤٨.

قبل سقوط النظام، كانت القوى السياسية والمنظمات الكوردستانية تطالب القوى السياسية المعارضة للنظام بادانة هذه السياسة التي تُسيء كثيراً الى العلاقات التاريخية بين العرب و الكورد والتي عمل النظام حثيثاً على هدمها وتخريبها.

ان السياسة العنصرية التي مارسها البعث خلال اكثر من ثلاثين عاماً لا تزال تستوجب الادانة الصريحة من جانب جميع القوى والاطراف السياسية والحكومة العراقية بالذات التي تضم ممثلي معظم تلك الاطراف. وتعلمون ان قانون ادارة الدولة العراقية للمرحلة الانتقالية يتضمن نصوصاً لمعالجة آثار تلك السياسة الخرقاء وتُلزم الحكومة بإتخاذ خطوات فعالة لانهاء آثارها ومعالجة الاوضاع

المترتبة عليها. يؤسفنا القول ان الحكومة العراقية لم تتخذ لحد الآن اية خطوة عملية لتنفيذ التزاماتها المترتبة عليها بموجب القانون المذكور. فعشرات الالوف من العوائل التي تم طردها قسراً من كركوك وعاد بعضها اليها بعد سنوات طويلة من العيش المضني بعيداً عن الارض والديار، لايزال افرادها يعيشون في الخيم و لم تمد لهم الحكومة اية مساعدة تذكر. ولولا المساعدات القليلة التي وفرتها لهم حكومة اقليم كوردستان بالتعاون مع بعض المنظمات الدولية، لكانوا عرضة للجوع والموت البطيء. لقد كانوا ينتظرون العودة الى ديارهم بمجرد سقوط النظام، وها قد مرّ على سقوطه اكثر من سنة ونصف ويعيش الذين عادوا اليها في الظروف القاسية التي اشرنا اليها، اما الباقون فينتظرون العودة اليها دون ان تمد لهم الحكومة لحد الآن يد المساعدة. وقد بذل بعض القوى السياسية الكوردستانية جهوداً كبيرة مع المرحلين لتحول دون عودتهم الجماعية الى مدينتهم، لما يترتب على ذلك من مشكلات بالنسبة للجميع، خاصة بالنسبة للحكومة والقوات متعددة الجنسيات، لكن الصبر له حدود ولا يستطيع احد بعد الآن الحيلولة دون عودتهم لانها حق مشروع لهم طالما انتظروها بلهفة وشوق.

وبعد الاعلان عن اجراء لانتخابات في العراق كان الجميع يتوقع تطبيع الاوضاع الشاذة التي خلقها النظام في كركوك وفي اطرافها، كي يتمكن الجميع من المشاركة فيها ولتأتي معبّرة عن آراء و تطلعات سكانها الاصليين. ومرة اخرى وجد ابناء كركوك انفسهم غرباء في مدينتهم، اذ لم تسهّل لمعظمهم سبل المشاركة في الانتخابات، بل خلق مكتب محافظة كركوك للانتخابات المشكلات لهم، بينما وفّر التسهيلات للغرباء الذين تم توطينهم في المنطقة. واستغرب الجميع عندما عُيّن السيد عزالدين محمد شفيق المحمداوي عضواً في المفوضية العليا المستقلة للانتخابات في العراق وهو الذي كان يرأس فرع كركوك لجمعية الهلال الاحمر العراقي حتى سقوط النظام! وتعرفون جيداً ان من كان يشغل هذا المنصب في عهد النظام الشمولي لابد ان يكون جزءاً من مؤسساته القمعية. وعهدت المفوضية العليا للانتخابات في العراق مسؤولية مكتب محافظة كركوك للانتخابات الى الدكتور مكرم عبدالمجيد الذي استقال من منصبه بعد فترة قصيرة خوفاً على حياته، وكان مساعده السيد نهاد زينل معاوناً للسيد عزالدين المحمداوي في منظمة الهلال الاحمر فرع كركوك في عهد النظام السابق. ان

السيدين نهاد زينل و عزالدين المحمداوي ليسا بالشخصين المناسبين لهذه المهمة ذات المسؤولية الكبيرة، لانهما ليسا محايدين ولهما ماض غير نظيف. وقد لعبا دوراً كبيراً في تعيين بعثي سابق ليحل محل الدكتور مكرم المستقيل. اذ بادرا بالتعاون مع السيد عادل اللامي رئيس الادارة الانتخابية في المفوضية والعضو في مجلسها اثناء وجودكم خارج العراق، بتعيين المحامي يحيى صالح الحديدي عضو الفرقة في حزب البعث سابقاً والعضو العامل فيه لحين سقوط النظام. وكان المومى اليه ايضاً محامياً لدائرة الامن في كركوك واستفاد كثيراً من (خيرات) النظام! واسهم بالتعاون مع الاشخاص الذين اشرنا لاسمائهم بتعيين موظفي مكتب كركوك خلال فترة يومين فقط ومعظمهم اما من منتسبي حزب البعث سابقاً او من المتعاونين مع النظام لحين سقوطه. واستقال المحامي يحيى الحديدي قبل ايام من منصبه، بعد ان نفذ جميع ما اراد، حيث عيّن معضم رؤساء الاقسام والموظفين ومعظم مسؤولي مراكز التسجيل للانتخابات في المحافظة من اشخاص اما من اعضاء او قريبين من الاحزاب المتطرفة او من المتعاونين مع النظام لحين سقوطه، وهذا خلافاً لتعليمات المفوضية. ومنذ مباشرة هؤلاء بمسؤولياتهم بدأوا بخلق العراقيل امام الناخبين الكورد الراغبين بتصحيح استماراتهم الخاطئة او نقلها الى محافظة كركوك. وترتب على ذلك عدم افساح المجال امام الكثيرين منهم لتسجيل اسمائهم في مراكز التسجيل والذين يقدر عددهم بأكثر من سبعين الف ناخب داخل مدينة كركوك وحدها. ومن الوسائل االملتوية التي لجأ اليها بعض هؤلاء المسؤولين لتنفيذ (واجباتهم) المهنية، توزيع استمارات رقم (٢و ٣) الخاصتين بالتصحيح والنقل بأعداد قليلة في مراكز التسجيل ٣٩٢، ٣٩٣، ٣٨٧، ٣٩٥ الواقعة في الاحياء الكوردية والتركمانية بحيث انها كانت تنفذ خلال ساعات، بينما وفروها بأعداد كبيرة في المراكز ٣٩٩ و٣٩٨ و ٤٠٠ و ٤٠١ و ٣٨١ و ٣٨٦ و ٣٨٩ الواقعة في قضاء الحويجة وفي الاحياء التي يعيش فيها العرب الوافدون داخل كركوك.

نعلم ان الاساس الذي أعتمد عليه لاجراء العملية الانتخابية هو القوائم الخاصة بتوزيع المواد الغذائية، لكن عدداً من النواحي الادارية التي دمرها النظام وطرد منها سكانها الاصليين عادوا اليها بعد تحرير العراق كنواحي (قره هنجير) و (شوان) و(سركران) التابعة لمركز قضاء كركوك. وحيث ان سكان هذه النواحي لم

يكونوا مسجلين اصلاً في السجل الخاص بتسليم المواد الغذائية في كركوك، لذلك لم ترد اسماؤهم في قوائم الناخبين. و(ابدع) مسؤولون آخرون في بعض مراكز التسجيل في خلق عراقيل اخرى امام الناخبين الكورد لتسجيل اسمائهم في الاستمارات رقم ٢ و ٣ لحرمانهم من حق التصويت، منها مطالبة المواطنين الكورد بابراز استشهاد صادر من محافظة كركوك تؤيد كونهم من ابناء كركوك، رغم ابرازهم لهويات الاحوال المدنية التي تؤيد كونهم من سكنة كركوك. ولم يكن بوسع الكثيرين منهم الوصول الى مبنى المحافظة المحاطة بالحماية الامنية الكثيرة، في حين ان مسؤولي مراكز التسجيل في المناطق الاخرى من المحافظة لم يكونوا يطالبون احداً بابراز هذا الاستشهاد.

من المعلوم ان محافظة كركوك كانت تضم حتى عام ١٩٧٦ اقضية جمجمال وكلار وكفري ودوزخورماتو بمحافظة تكريت البعيدة عنه كثيراً. ويصوّت لبناء هذه الاقضية ضمن المحافظات المشار اليها وليس ضمن محافظة كركوك التي كانت مناطقها جزءاًمنها منذ العهد العثماني. ويطالب سكان هذه الاقضية منذ سقوط النظام اعادة ربطها بمحافظة كركوك، ولم يتم ذلك ما ادى الى خلق مشكلات للمشرفين على العملية الانتخابية ليس في محافظة كركوك وحدها، بل في المحافظات التي الحقت بها تلك الاقضية، لقد حان الوقت لحل هذه المشكلة التي هي من خلق النظام.

لقد طالب مجلس محافظة كركوك بضرورة اعادة الاوضاع الطبيعية الى كركوك واتخاذ خطوات عملية من جانب الحكومة لتطبيق المادة (٥٨) من قانون ادارة الدولة العراقية للفترة الانتقالية. وادى تلكؤ هذه الحكومة في تنفيذ الانتخابات الخاصة بمجلس المحافظة لمدة قصيرة. ومن المؤسف ان مجلس المفوضية العليا المستقلة للانتخابات لم يوافق على هذا المطلب رغم عدم تعارض ذلك مع قرار اجراء العملية الانتخابية في العراق في موعدها المحدد في الشهر الاول من عام٢٠٠٥، إن تأجيل اجراء لانتخابات المحلية في كركوك لمدة ستة اشهر كي تتولى الحكومة خلالها اتخاذ الخطوات الكفيلة بتنفيذ المادة ٥٨ من قانون ادارة الدولة لايتعارض مع سير العملية الانتخابية في العراق واتمامها في الموعد المحدد لها، لان هذا التأجيل لا يؤثر سلباً على تلك العملية. وكان ممثلو معظم الاحزاب والقوى السياسية في محافظة كركوك بادرو قبل ٢٠٠٤/١١/١٥ بتأسيس كيان

سياسي إشترك فيه ممثلو القوميات المتآخية في كركوك. إن دلّ ذلك على شيء فانما يدل على أنهم كانوا يريدون المشاركة في الانتخابات، لكن تلكؤ الحكومة في تنفيذ التزاماتها القانونية، بجانب الممارسات الخاطئة لمكتب المفوضية العليا للانتخابات في محافظة كركوك دفعت بهم الى اتخاذ قرار عدم المشاركة، ان لم تُلب المفوضية مطلبهم بتأجيل الانتخابات وهو قرار يحظى بتأييد جماهير أبناء وبنات المحافظة الذين تعرض معظمهم الى القمع أو الى الترحيل والتشريد القسري خلال فترة حكم النظام.

اننا نضع هذه الوقائع اما انظاركم بهدف معالجتها قبل استفحال المشكلات ووصولها الى حالة يصعب حلها مستقبلا ونؤيد مطلب مجلس محافظة كركوك المتضمن طلب تأجيل الانتخابات المحلية لمدة ستة اشهر، لان ذلك لا يؤثر بأي شكل كان على سير العملية الانتخابية في العراق، لان ابناء المحافظة سيشاركون في انتخابات المجلس الوطني العراق الذي سيتولى مهمة اختيار الحكومة المستقبلية في العراق وتقوم بتهيئة الخطوات اللازمة لاعداد مشروع الدستور لعراق الغد. واذا كان من المتعذر على المفوضية العليا للانتخابات اتخاذ قرار بتأجيل الانتخابات على نطاق العراق، فالأمر يختلف بالنسبة لمجلس محافظة كركوك، خاصة و أن هذه المحافظة مرت ولاتزال بظروف قاسية معروفة على النطاقين الداخلي والدولي. ان الوضع الخاص بهذه المحافظة والاثار المترتبة على امكان وقوع اي حادث فيها يستلزم النظر لمشكلاتها بعين الحكمة وبُعد النظر. ان التاريخ قديمه وحديثه والواقع الجغرافي للمنطقة، الى جانب ممارسات النظام سابقاً وسعي أزلامه حالياً لاشعال نار الفتنة في هذه المدينة الامنة تستلزم التكاتف لحل المشكلات فيها قبل أن يصعب حلها فيما بعد ولن يتم الا بتأجيل الانتخابات الخاصة بمجلس المحافظة، خاصة وانه لا وجود لقائمة تضم اطياف أبنائها نتيجة عدم تقديم اسماء مرشحي القائمة المسجلة سابقاً خلال الفترة القانونية بسبب قرار المقاطعة.

كذلك نطالب المفوضية بأتخاذ السبل اللازمة لادخال أسماء الناخبين غير المسجلين لحد الان للاسباب المشار اليها آنفا، في السجل الخاص بالناخبين. ونضع امامكم بعض الارقام التي توضح الحالة في مدينة كركوك وفي اطرافها.

يبلغ عدد نفوس محافظة كركوك بموجب القوائم التي اعدتها شركة توزيع المواد الغذائية في كركوك في شهر تشرين الثاني ٢٠٠٤، (١٠٣٠٢٤٣) شخصاً بينهم (٢١٦٤٦) طفلاً دون الثانية من اعمارهم، وبذلك يبلغ عدد نفوس المحافظة الذي تتجاوز اعمارهم الثانية (١٠٠٨٥٩٧) شخصاً. واذا افترضنا أن من يحق لهم المشاركة في الانتخابات تبلغ نسبتهم ٥٥٪، لبلغ عدد الناخبين (٥٥٤٧٢٨) الذين يُفترض توزيع الاستمارات عليهم. لكن الذي وقع يخالف ذلك فقد تم توزيع قرابة (٤٥٠٠٠٠) استمارة في المحافظة ويعني ذلك حرمان (١٠٤٧٢٨) ناخباً من حق التصويت، فضلا عن أن عددا كبيراً من هؤلاء سُجلت أسماؤهم خطئاً ولم يتمكنوا من تصحيح اسمائهم، وبذلك حرموا عمليا من المشاركة في الانتخابات.

لقد بلغ عدد الاشخاص الذين تسلموا حتى ١٥ كانون الاول ٢٠٠٤ استمارات رقم (١) التي توجد فيها أخطاء (٤٨٩١) استمارة وعدد الاستمارات رقم (٢) التي صُححت (٣٦٨٥) وبلغ عدد الاستمارات (٣) الموزعة والمخصصة لنقل محل السكنى او بسبب موت اصحابها أو شطب اسمائهم لاي سبب كان (١٠٨٤٠١) استمارة وكل ذلك يدل على ان اعداداً كبيرة من الناخبين لم ترد اسماؤهم في تلك الاستمارات.

نود ان نشير في هذا السبيل الى ان الاستمارات الموزعة في محافظات اقليم كوردستان والتي وردت فيها الاخطاء قد بلغت اكثر من ٨٢٪ في محافظة اربيل ، واكثر من ٢٠٪ في كل من محافظتي السليمانية ودهوك وهو ما يؤدي عملياً الى حرمان نسبة كبيرة من الناخبين في الاشتراك في الانتخابات. ويتساءل المواطن في الاقليم عن سبب ذلك ولمَ خُصت محافظات الاقليم بهذه النسبة من الاخطاء (التكنيكية)، علماً بأن (الهَيئة العليا للانتخابات في اقليم كوردستان) طالبت الهيئة العليا المستقلة للانتخابات في العراق بضرورة تصحيح تلك الاستمارات بإعادة طبعها مجدداً بموجب السجل الصحيح الموجود لديها، او تمديد الفترة الزمنية للتصحيح لبضعة ايام فقط، ولكن الجواب كان الرفض. ولم توافق المفوضية ايضاً على اقتراح الهيئة العليا للانتخابات في اقليم كوردستان باشتراك سكنة الاقليم خارج العراق في انتخابات برلمان اقليم كوردستان وهو حق مشروع لهم.

اننا نضع هذه الوقائع امامكم بهدف حلها بروح من التعاون التي لمسناه منكم دوما. وما نقترحه لا يتعارض مع قانون ادارة الدولة العراقية للفترة الانتقالية والقرارات الاخرى الخاصة بالانتخابات.
اننا نسعى جميعا الى حل الاشكال الكبير الخاص بكركوك والذي لا نعرف مدى آثاره السلبية الا اذا ما حدث، لا سمح الله ما تسعى الايادي الخفية لخلقه في هذه المدينة التي عاش أبناؤها فيها دوما في ود ووئام.

**تقبلوا منا وافر الشكر والاحترام**

**الدكتور نوري الطالباني**
**رئيس مركز كركوك للبحوث والدراسات**
**اربيل ٢٩/كانون الاول/٢٠٠٤**

سەرچاوە: رۆژنامەی (التاخی) ژمارە «٤٣٨٦»ی رۆژی ٥/١/٢٠٠٥

کێشەی ئێمەی کورد لە کوردستانی عێراق (کوردستانی باشوور) لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندی بەغدای زۆرینەی عەرەبی باڵادەست:

* لەسەر شناسنامەی (عێراقی) نەبووە... چونکە کورد بە گشتی لە (عێراق) دا و، بە پێی هەلومەرجی رامیاری و هەلۆیستی لە ناوەند، (عێراقی) بووە....

* لەسەر ئەوە نەبووە؛ کورد هەیە یان نییە... یان چەند جێگرو وەزیرو دەرەجەداری هەیە لە بەغدا... چونکە بە درێژایی تەمەنی ئەم (عێراق)ـە داتاشراوە، هەبوونی کورد سەلمێندراوەو (نوێنەر)و دەرەجەداریشی هەبووە...

* لەسەر بنەمای ئایینی و (مەزهەب)ی نەبووە... چونکە زۆرینەی خەڵکی کوردستان بە ئایین ئیسلامن و بە (مەزهەب) (سوننە)و، دەسەڵاتی ناوەندی بەغداش هەر وا... کەچی نەک مافەکانمانیان پێشێل کردبوو، بەڵکو تەعریب و جیۆسایدیش کراین..

* کێشەی ئێمە کێشەی نەتەوەیەکە پێی ئەڵێن (کورد)و وڵاتێکە پێی ئەڵێن (کوردستان)، داگیر و دابەشکراوەو، لە کۆتایی سەدەی بیستەم بەشی (باشووری) جینوساید کراوەو، لە سەرەتای سەدەی بیست و یەک و لە پێناوی یەکێتی خاکی عێراق، وا هەوڵی لەت لەت کردن و دابەشکردنی ئەدرێتەوە لە دوو بەش بۆ... بەش!

هەولێر 2005
چاپی یەکەم